# بیانناسە

## هەڵدانەوەی چەند لاپەڕەیەکی نادیار

## لە فیکری کەسانی ناودار

نووسینی:

إحسان برهان الدين

# {بیاناسە}

| | |
|---|---|
| "ناوی کتێب" | "بیاناسە" |
| "نوسەر" | **"إحسان برهان الدين"** |
| " نەخشەسازی ناوەوە" | "عبدالله خاکی" |
| "نەخشەسازی بەرگ " | "عوسمان محمد" |
| "نۆرە و ساڵی چاپ" | " یەکەم:٢٠١٩،١٤٤٠" |

**ژمارە (     )ی ساڵی (     )ی**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان پێدراوە**

## بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفَرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِأنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ و أنتُمْ مُسلِمونَ.

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً و اتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً.

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَفَوزاً عَظيماً..

أمَّا بعدُ:

فإنَّ اصَدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم، وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ،وكُلَّ ضَلالةٍ في النَّارِ.

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وعلى آله وصحبه أجمعين إلى يوم الدين.

بابەتی ئەم کتێبە لە بنچینەدا بریتییە لە نزیکەی هەشتا باس و بابەتی جیاوازی سەربەخۆ دەربارەی کەسایەتییەکان کە لە ماوەی چەند ساڵێکدا لە ئەکاونتی خۆم لە تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوك بڵاوم کردووەتەوە.

ئەم باسانە هیچ جۆرە ڕێکخستنێکی زەمەنی یان مەنتیقی یان مێژوویی نایانبەستێتە یەکەوە، بەڵکو بە پێی ئەوەی لەو کاتە بە پێویست زانراوە باس لە کەسایەتییەکی ناودار کراوە و بە شێوەیەکی دیاری کراو تیشك خراوەتە سەر لایەنی نەرێنی و لادان و کاریگەری خراپی لەسەر فیکری و مەنهەجی ئیسلامی و بە تایبەت مەنهەجی ئەهلی سوننەت.

ڕەنگە زۆر کەسایەتی تر هەبن لەمان زیاتر لە شەریعەتی ئیسلام لایان دابێت و یان ڕۆڵی کاریگەرتریان لە گومراکردنی موسوڵمانان هەبوو بێت بەڵام ئیتر وەکو وتم لەم زنجیرە باسەدا و بۆ ئەم چەند ساڵەی ڕابوردوو لە کوردستاندا ئەمانەم بە گونجاو زانیوەو توانیومە تیشك بخەمە سەر فیکرو ژیاننامە و ئەندازەی کاریگەر بوونیان بە تیۆر و ڕێبازە تێکگیراوەکان لە گەڵ شەریعەت و بیروباوەڕی ئیسلام و موسوڵماناندا.

بۆیە کۆبوونەوەی هەندێ ناوی دوور لە یەکتر بۆ نموونە: ( أرسطو – مسيلمة – ابن الراوندي – أوشۆ – عەلی شەریعەتی – راشد الغنوشي – گیڤارا - أحمد القبنجي – جهيمان العتيبي) نابێت جێگای پرسیار و سەرسوڕمان بێت، چونکە وەکو وتم هەر یەکەو لە ڕوانگەیەکەوە باسم کردوون و بە پێی ڕێکخستنێکی فیکری و ئایینی و مێژوویی کەسەکانم هەڵنەبژاردووە.

نووسینەکان ئاوێتەیەکە لە خوێندنەوەی خۆم لەسەرچاوەکان و بۆچوون و تێگەیشتن و تێروانینی فیکری و مەنهەجی خۆم بۆ ئەو کەسایەتییانە و پێوەری سەرەکیشم بە پێی توانا قورئان و سوننەت و بنەما و بنچینە گشتییەکانی عەقیدەو تەوحید و بیروباوەری ئیسلامی بووە بە تێگەیشتن و گەرانەوە بۆ زانایانی سەلەف و ئەوانەی لەسەر ڕێبازی ئەوان ڕۆیشتووەن.

هەرگیز بانگەشەی قەتیس کردنی حەق و پێکانی ڕاستی تەنها لەو بۆچوونەی خۆمدا ناکەم کە لێرە جێگیرم کردووە و هەرکەسێك بەبەڵگەی ڕوون و ئاشکرا بۆمی بسەلمێنێت کە لە بابەتێکدا پێچەوانەی حەق و ڕاستیم وتووە مل بۆ حەق دەدەم و لە قسەکەی خۆم پاشگەز دەبمەوە، بە مەرجێك کیتاب و سوننەت بە تێگەیشتنی زانا و پێشەوایانی پێشینان داوەر بێت لە نێوانماندا.

نووسینی ئەم بابەتانە کات و هەوڵی زۆری لێم ویستووە و سەدان سەرچاوە و کتێب و بڵاوکراوەو نووسینی سایتەکانم خویندووەتەوەو گوێبیستی زۆر تۆماری دەنگی و چاوپێکەوتنی نەلەفزیۆنی و کەنالەکانی یوتیوب بوومە و ئاخاوتنم لەگەڵ شارەزایاندا لەسەر هەندێك لە باسەکان کردووە، دواجار هەر هەوڵێکی کەسێتی و کۆشسێکە بۆ پێکانی حەق و وریا کردنەوەی موسوڵمانان لە هەڵە

و گومڕایی، جا ئەگەر چەند حەقم پێکابێت ئەوە بە پشتیوانی و فەزڵی الله تعالی بووە، تووشی هەر هەڵە و نەپێکانێکیش بووبێتم ئەوە لە خۆم و لە شەیتانەوەیە، ئەگەر بۆم روون بوویەوە لە هەر شتێکدا پێچەوانەی حەق م وتبێت لێی پاشگەز دەبمەوە ، کە حەق لای من ئەوەیە کە لە قورئان و سوننەت و شەریعەتی ئیسلامدا هاتووە و هەر واتایەکی تریش کە لە گەڵ ئەو دوو سەرچاوەدا جۆر بێت و تێکنەگیرێت.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

إحسان برهان الدين

٢٧-٨ ٢٠١٨ سلێمانی

# ( رفاعة رافع الطهطاوي )



لە ساڵی ١٨٠١ز لە سوهاج لە میسر لە دایکبووە ، لەبنەماڵەیەکی ناودار و بەرێزدا پەروەردە بووە ، باوکی هەر لە منالییەوە قورئانی پێ لەبەرکرد ، پاش مردنی باوکی کەسە نزیکەکانی تری هەمان بایەخیان پێدا و زۆریك لە مەتنە زانستیەکانی ئەو سەردەمەی لەبەر کرد، لە شانزە ساڵیدا ڕۆیشتە قاهیرەو لە ئەزهەر زانستەکانی (الحديث والفقه والتفسير والنحو والصرف)ی خوێند. لە ساڵی ١٨٢٦ز وەرچەرخانێکی گەورە لە ژیانیدا ڕوویدا کە بریتی بوو لە هەڵبژاردنی لە لایەن حکومەتی میسرەوە لە سەردەمی محمد علي پاشا وەکو پێش نوێژ (چونکە لەسەردەمی خیلافەتی عوسمانی دەبوو لە گەڵ هەموو نێردەیەك پێش نوێژ و واعظ ێك هەبوایە!)لەگەڵ ئەو نێردەیەی کە چوون بۆ فەرەنسا بۆ خوێندنی زمان و زانستە هاوچەرخەکان. ئەو ئەگەر چی وەکو پێش نوێژ نێردرا بوو بەڵام لەوێ فێری زمانی فەرەنسی بوو ودواتریش کتێبی:

**(تَخْلِيصُ الإِبْرِيزِ فِي تَلْخِيصِ بَارِيز)** ی نووسی کە ناوبانگێکی زۆری بە دەستهێنا و تێیدا زۆر ستایشی فەرەنساو شارستانیەتی ئەوروپای بە چاك و خراپیەوە کرد . پاش گەڕانەوەی بۆ میسر ڕۆڵی گەورەو بەرچاوی بینی لە بواری وەرگێڕانی کتێبە فەرەنسیەکان و بەرپرسیاریتی مەزنی پێ سپێردرا ، دواتر دەرکەوت کە ئەو خەریکی ئەنجامدانی پرۆژەیەکی ڕۆشنبیری هەرە گەورەیە بۆ دامەزراندنی بزوتنەوەی زاڵکردنی شارستانی ئەوروپا و لەبیرکردن و ناشیرینکردنی شارستانی ئیسلامی. لەبەرانبەریشدا توانی ڕەزامەندی محمد علي پاشا و کوڕەکانی دوای خۆی بەدەست بهێنێ و پلەو پایەی بەرزو و دیار وپارەی زۆری پێبەخشرا بە ئەندازەیەك کاتێك وەفاتی کرد یەکێك بوو لە دەوڵەمەندەکانی میسر. لە ڕاستیدا رفاعة الطهطاوي یەکەمین کەلێنی دروست کرد بۆ هاتنە ژورەوەی ڕۆژئاواییەکان ، وەکو ڕۆژهەڵاتناس (جب) دەڵێت: **(كانت المصادر الأولى التي أخذ الفكر الأوربي يشع منها هي المدار المهنية التي أنشأه محمد علي، والبعثات العلمية التي أرسلها إلى أوربا، ويذكر أن منها مدرسة الألسن التي كان يشرف عليها العالم "الفذُّ" رفاعة الطهطاوي، وهو تلميذ جومار ألبار).**

(رفاعة) بە شێوەیەکی ڕەها بەرگری لە بیری ڕۆژئاوا دەکرد بە هەموو ئەوانەشیەوە کە لە گەڵ ئیسلامدا ناکۆکن ، بۆنموونە ستایشی فەرەنسیەکانی دەکرد کە چۆن ژن و پیاویان تێکەڵ بە یەکتر دبن و سەما دەکەن ، وەکو لەوکتێبەیدا دەڵیت:

**(والغالب أن الجلوس للنساء، ولا يجلس أحد من الرجال إلا إذا اكتفى النساء، وإذا دخلت امرأة على أهل المجلس ولم يكن ثَمَّ كرسي خالٍ قام لها رجل وأجلسها، ولا تقوم لها امرأة لتجلسها،**

**فالأنثى دائمًا في هذه المجالس معظمة أكثرمن الرجل، ثم إن الإنسان إذا دخل بيت صاحبه: فإنه يجب عليه أن يحيي صاحبة البيت قبل صاحبه ولو كبر مقامه ما أمكن، فدرجته بعد زوجته أو نساء بيته)**

یان دەربارەی سەما دەڵێت:(**فالرقص في باريس دائمًا غيرخارج عن قوانين الحياء، بخلاف الرقص في أرض مصر فإنه من خصوصيات النساء؛ لأنه لتهييج الشهوات، أما في باريس فإنه لا يُشم منه رائحة العهر أبدًا! وكل إنسان يعزم امرأة يرقص معها، فإذا فرغ الرقص عزمها آخر للرقصة الثانية، وهكذا، وسواء أكان يعرفها أو لا، وتفرح النساء بكثرة الراغبين في الرقص معهن)** بەمەش ئەوەی فێری میسرییەکان دەکرد، کە ڕەوشت پەیوەندی بە دینەوە نییە و فەرەنسیەکان ڕێز لە ئافرەت دەگرن بەو شێوازە بۆ ئەوەی ئاماژە بەوە بکات کە ئەوکارە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا تێکدەگیرێن. طهطاوي هەموو بەرگریەکانی لە شارستانی ڕۆژئاواو و مافی ئافرەت، بەو شێوەی کە لەگەڵ ئیسلام ناگونجێ و وەرگێڕانی بۆ هەرچی بەرهەم و خراپیەکانی فەرەنسا و گۆڕینی بۆ مەناهیجی خوێندن لەسەر بنەمای ڕۆژئاوا و لابردنی زانسە ئیسلامیەکان و هاندانی بۆ دروستکردنی شوێنی سەما، و نواندان خراپەکاری لە هەموو ئەو کارانەیدا وەکو چاکسازێکی ئیسلامی ئەو کارانەی دەکرد!

بۆیە بوو جێگای ڕێز و ستایشکردنی ڕۆژئاواییەکان و سەرانی حوکم لە میسر و شوێنانی تر ،چونکە توانی وێنەیەکی شێوێندراو دەربارەی ئیسلام پێشکەش بکات و جێدەستی بێگانەکان لە میسردا بکاتەوە ،

رفاعة بەیەکەمین پێشەنگی ڕاپەڕینی زانستی و پێشکەوتن و شوێنپێ هەڵگرتنی ئەوروپا ناسرا.لە ساڵی ١٨٧٣ز پاش ئەوەی بە باشترین شێوە هەڵسا بەو ڕۆڵەی پێ سپێردرابوو دونیای بە جێهێشت و بەرەوماڵی گۆڕی تاری بە ناچاری ملی ڕێگای گرت.

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

- الاتجاه العقلاني عند المفكرين الإسلاميين المعاصرين، سعيد الزهراني.
- أعلام وأقزام للعفاني.

**(رفاعة) بە شێوەیەکی ڕەها بەرگری لە بیری ڕۆژئاوا دەکرد بە هەموو ئەوانەشیەوە کە لە گەڵ ئیسلامدا ناکۆکن.**

# ( الشيخ محمد عبده )



ناوی (محمد عبده حسن خيرالله) لە دایکبووی وڵاتی میسرە لەساڵی ١٨٤٩ز ،لە دایکێکی تورکمانی وباوکێکی میسری ، خوێندنی لە ئەزهەر تەواو کردووەو لە ساڵی ١٨٧٧ز بووەتە خاوەنی بڕوانامەی (العالِمية) ، بەشداری کردووە لە شۆڕشی ئەحمەد عورابی ، پاش هەرەس هینانی شۆرشەکە حوکمی زیندانی بۆ دەرچووەو ئینجا بۆ ماوەی ساڵ بۆ بەیروت نەفی کرا ، دواتر بە ئامۆژگاری جمال الدين الأفغاني مامۆستای رووی کردووەتە پاریس ولەوێ رِۆژنامەی (العروة الوثقى) ی دامەزراند و دواتر گەڕایەوە بەیروت و کۆمەڵەیەکی نهێنی بە هەمان ناوەوە دامەزراند. بەلای هەندێکەوە بە (مجدد) و چاکساز وهێمایەك بۆ ڕاپەڕینی عەرەبی و ئیسلامی دادەنرێت ، قازی بووە و موفتی میسر بووە ، خاوەنی کتێب و تەفسیر و هەلوێست و بەسەرهاتی زۆرە لە کاروامی ژیانیدا

کە ناکرێت لێرەدا هەموویان بخەینە ڕوو ، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە و شایانی ئاماژە پێکردنە زۆر نهێنی لە ژیانی ئەم ناوەدارەدا هەیە لە کاتی خۆی لەبەر هەندێ هەل و مەرجی ئەو قۆناغەی ئەوی تێدا ژیاوە پەردەی لەسەر لانەبراوە ، لەوانەشە کەسێك بڵێ ئەو پیاوە لە دونیا دەرچووە ئیتر بۆچی گۆڕەکەی هەڵتەکێنین و باسی بکەین، ئەم قسەش هەڵەیەکی گەورەیە ، چونکە محمد عەبدو وەکو نووسەرێك دەڵێت زیندووە لە نێوماندا بە بیروبۆچوونە نامۆکانی و خەڵکی ڕەچاوی دەکەن وپێی کاریگەرن تاکو ئێستا ، لەوەش گرنگتر وترسناکتر ئەوەیە هاوشێوەکانی دووبارە دەبنەوە تاکو ئەم ڕۆژگارەی خۆمان بۆیە ڕەتکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی ئەرکێکی شەرعیە. محمد عەبدو خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگ بوو بۆ بەرەوپێش چوونی کاروانی هزری ڕۆژئاوا لە میسر و وڵاتە عەرەبیەکان ،چونکە ئەو زۆر سەرسام بوو بە ڕۆژئاواو دەیەویست چاکسازییەکانی لە ئیسلامدا لە ڕوناکی شارستانی ڕۆژئاوادا ئەنجام بدات! محمد عەبدو کە لەم سەردەمەی خۆماندا بە سەر و سەرۆکی قوتابخانەی عەقڵی دادەنرێت ، بێگومان کە موعتەزیلیەکی توندڕەو بووە ورۆڵەیەکی بە ئەمەکی ئەو قوتابخانەیە بووە.

هەموو بەرهەمەکانی لەسەر ئەو ڕاستیە شایەتن.

- عەقڵی پێش دەقی شەرعی دەخست و یەکەم واجبی موسوڵمانی بە بیرکردنەوە دەزانی، خۆی دەڵێت:

**(إن أول واجب على المكلف أن يأتي به هو النظروالفكر، وإن الأصل الثاني للإسلام: تقديم العقل على ظاهر الشرع عند التعارض).**

- ئینجا ئەولە موعتەزیلە دێرینەکان خراپترە بەوەی کە بەرنامەی کارکردنی بریتی بوو لە ئاوێتەکردنی ئیسلام بە شارستانی ڕۆژئاوا و تاکو سەر ئێسقان پێیان سەرسام بوو.

- جگە لەوەش تەفسیری قورئانی لەسەر مەنهەجی ئەوان دەکرد و هەرچی قەناعەتی پێ نەبوایە تەئویلی دەکرد ، تەنانەت مەلائیکەت و جنۆکە و هەموو ئەو شتانەی ڕۆژئاوا باوەریان پێ نەبوو ئەو یەکسەر واتاکەی دەگۆڕی و دەیوت مەبەستی خوای گەورە ئەوە نییە .

- موعجیزاتی ڕتدەکردەوە چونکە لە گەڵ عەقڵدا ناگونجێت ، بۆ نموونە: **(حجارة من سجيل)** ی بە نەخۆشی ئاوڵە تەفسیر دەکرد.

- فەرمودەی ئاحادیشی پێ قبوڵ نەبوو زۆربەی فەرموودەکانیش لە ئیسلامدا ئاحاد .

-فرەژنی ڕەتکردەوەو بە حەرامی دەزانی بەلگەشی بۆ دەهێنایەوە ، تەنانەت تەلاقی لە هەندێ حاڵەتی زۆر کەمدا نەبێ پێ جائیز بوو.

بێگومان مانەوەی محمد عەبدو بۆ ماوەیەکی زۆر لە فەرەنسا و ، کاریگەربوونی بە کەسێکی وەکو جمال الدين الأفغاني و ،پەیوەندی نزیکی لە گەڵ هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسانی وەکو کرومەرو پشتگیریکردنی بۆ ڕێرەوی موعتەزیلە بە بەهانەی ڕێزگرتنی ئەوان لە عەقڵ و هزر ،هەموو ئەمانە پێکەوە بەشدارییان کرد لە دروستکردنی ئەم کەسایەتیە کە دواتر بوو بە قوتابخانەیەك پێش هەموو کەسێك ڕۆژهەڵاتناسەکان پێی سەرسام بوون وستایشیان دەکرد ،

ئینجا هەر لە ژێر عەبای ئەمەوە کەسانی لادەرو زیان بەخشی وەکو قاسم أمین و طه حسین و أحمد لطفي السيد وقاسم ئەمین دەرچوون کە هەموویان خۆیان بە قوتابی محمد عەبدو دەزانی.

یەکێکی تر لە کێشە گەورەکانی محمد عەبدو هاوکاریکردنی بۆ داگیرکەری ئینگلیزی و مامەڵەی کردنی لە گەڵیان بە ئاسایی دەزانی بە بەهانەی ئەوەی مامەڵە کردن لە گەڵ کافر جائیزە ، ئینجا هەندێ باسی تری هەبوو دەربارەی دەربارەی بۆچوونی تایبەتی خۆی بۆ دار الکفر ودار الحرب و باسی لەو شێوە هەمووی بە جۆرێك لە بەزاندنی سنووری **(الولاء والبراء)** دادەنریت.

لە ڕاستیدا هەڵەکانی محمد عەبدو بریتی نەبوون لە هەندێ هەڵەی ئاسایی کە لەوانەیە هەر زانایەك تێی بکەوێت و ئاساییش بیت ، نەخێر ، ئەو ڕێڕەوێکی دامەزراند و ڕێبازی گروپێکی گومڕای زیندووکردەوەو موسوڵمانانی خستە گومانەوە لە زۆرێك لە ڕاستیەکانی قورئانی بە تەفسیرە نامۆکانی ، بە بەهانەی چاکسازی و تەجدیدەوە کۆمەڵێك سنوور و هێڵی پان وسووری ئیسلامی تێپەڕاند و بوویە پێشەنگێکی خراپ بۆ نەوەکانی دوای خۆی ، بۆنموونە ئەگەر لێرەدا باسی یەکێك لە کارە هەرە خراپەکانی بکەین کە گومانێك لە ڕاستی ودروستی ئەم باسەدا نییە ئەوەیە محمد عەبدو ڕۆڵی گەورەی بووە لە درووستکردنی کەسایەتی قاسم ئەمین دا کە ئەو یەکێك بووە لە گەورە هاندەرانی ئافرەتانی سەردەمی خۆی بۆ فڕێدانی سەرپۆش وشەرم وشکۆ ، کتێبی **(تحرير المرأة)**ش کە بە خراپترین کتێب دەژمێردرێت کە بە ناوی ئیسلامەوە داوای لە ئافرەتان کردووە سەرپۆش لابدەن ، لە ژێر ڕازیبوون و سەرپەرشتی ئەودا نووسراوە ، بەڵکو چەندین لێکۆڵەرەوەی جێگای متمانە وەکو:

محمد اسماعيل المقدم و زۆری تر دوای لێکۆڵینەوە بۆیان دەرکەوتووە ئەو کتێبە چەند بەشێکی لە لایەن خودی محمد عەبدو نووسراوە!

ئینجا وەکو (عباس محمود العقاد) دەڵێت : محمد عبده (سوو)ڕیبای بە حەرام نەدەزانی تاکو سیفەتی **(أضعافا مضاعفة)** ی تێدا نەبوایە!

کورتەی باسەکە ئەوەیە ئەم پیاوە بۆ خۆی قوتابخانەیەکی سەربەخۆ بوو ، ئەگەر هەرچەند باشەی بووبێت - کە بێگومان بوویەتی- بەڵام ڕۆڵی خراپ و کاریگەری پێچەوانەی ڕێرەوەی زانایانی ئیسلام وبیروبۆچوونە نامۆکانی دەربارەی زۆرێك لە بابەتە جێگیرەکانی ئیسلام و بانگەشەکردنی بۆ ڕەچاوکردن و شوێن پێ هەڵگرتنی شارستانی ڕۆژئاوا و زۆر کێشەی جەوهەری تر ، هەموو ئەوانە وای کرد ببێتە یەکێك لە ترسناکترین ئەو کەسانەی بە ناوی چاکسازی وتازەگەرییەوە گەورەترین گورزی کوشندە لە ئیسلام وموسوڵمانان بوەشێنن ، کە تاکو ئێستاش خەڵکانیك زۆر بە دەم کاریگەر بوون بە بیرۆکەکانی ئەوەوە دەناڵێنن.بە داخەوە محمد عەبدو تەماشای ئیسلامی وەکو کۆمەڵە عەیب و عار دەکرد ،بۆیە خۆی کردبوویە پینەچی بۆ ئیسلام و بەردەوام لە بەرگریدا بوو ، وەکو ئەوەی ئەم دینە کۆمەڵە بابەتێك بێت جێگای شەرم و رووزەردی بێت جەنابی بەهەر حاڵێك بووەبەرگری لێکردووە بەرانبەر ڕۆژئاواییەکان!

لە ساڵی ١٩٠٥ز لەتەمەنی پەنجا و حەوت ساڵیدا لە ئیسکەندەریە و پاش تووشبوونی بە نەخۆشی شێرپەنجە وەفاتی کرد.

**بۆزانیاری زیاتر:** دەتوانرێ کتێبەکانی دکتۆر محمد محمد حسین وەکو (حصوننا مهددة من داخلها) بخوێنرێتەوە،هەروەها:(تجديد الفكر الإسلامي) ی عدنان أمامة ، و(العصرانيون) محمد حامد الناصر ، و (منهج المدرسة العقلية الحديثة في التفسير )فهد الرومي ، و(الاتجاهات العقلانية المعاصرة) ی ناصر العقل ، و(غزو من الداخل) ی جمال سلطان.

**لە ڕاستیدا هەڵەکانی محمد عەبدو بریتی نەبوون لە هەندێ هەڵەی ئاسایی کە لەوانەیە هەر زانایەك تێی بکەوێت و ئاساییش بێت ، نەخێر ، ئەو ڕێڕەوێکی دامەزراند و ڕێبازی گروپێکی گومڕای زیندووکردەوە.**

# ( أحمد القبنجي )



ناوی (أحمد حسن علي القبانجي)ە ،نووسەرێكی عێراقیە ، لە دایكبووی نەجەفە لە ساڵی ١٩٥٨ز ، هەر لەوێ هەندێ زانستەكانی شیعەی لە حەوزە خوێندووەو دواتر لە شاری قوم لە ئێران بۆ ماوەیەكی تر درێژەی داوەتە خوێندن لە حەوزە ، ئەگەرچی خۆی وا دەردەخات كە شیعەیە و جوبەو عەمامەی رەش دەپۆشێت وخۆی بە قوتابی (محمد باقر الصدر) دەناسێنێت و لە أیاد جمال الدين ە وە نزیكە، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر جار هێرش دەكاتە سەر بیروباوەڕەكانی شیعەش لە میانەی هێرش كردنی بەسەر تێكڕای بیروباوەڕو شەریعەتی ئیسلام هەر بۆیە ئەوانیش حاشایان لێكردووەو لە لایەن یاسر الحبیب! و چەند ئاخونێكی تریانەوە بە درێژی بەرپەرچیان داوەتەوە.

ئەحمەد ئەلقوبەنچی لە روانگە ی وانەو وتارەكانیدا هەروەها چاوپێكەوتنە زۆرەكانی لە یوتیوب و كەناڵەكانی ڕاگەیاندان دەردەكەوێت كە مولحیدێكی لیبرالی سەرسەختە،

بەڵام لەبەر هۆکارێك سوورە لەسەر پۆشینی جلی شیعەکان ، هۆکاری تورە بوونی شیعەش لە ئەو زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بە وردی بیرۆکەی مەهدی و زۆرێك لە بیروباوەڕەکانی تری شیعە ڕەتدەکاتەوە ، بەکورتی ئەو ناوبراوە:

هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە و ، یەك بە دوای یەکی بیروباوەڕەکانی ئیسلامی بە ڤیدیۆو چاوپێکەوتنی ڕاشکاو لە کەناڵەکاندا ڕەتکردووەتەوەو گاڵتەشیان پێ دەکات: بۆ نموونە دەڵێت قورئان لە ڕووی وشەو و واتاوە دروستکراوی پێغەمبەرە (ﷺ) .

بانگەشەی ئەوەش دەکات کە هەڵەی زمانەوانی و ئەخلاقی و عەقلی تێدایە ، باوەڕیشی وایە هیچ بەڵگەیەکی زانستی لەسەر بوونی خوا نییە و لەو بارەشەوە کتێبێکی تایبەتی داناوە .

لە چەندین چاوپێکەوتن و گرتەی ڤیدیۆییدا باس لەوە دەکات کە قەدەر درۆیە وزیندووبوونەوەی پاش مردن ئەفسانەیە و باوەڕی بە هیچ لایەنێکی ئیسلام نییە .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕاگەیاندنەکان لە کەناڵەکان و سایتەکانی ئێنتەرنێت سوورن لەسەر ئەوەی بە بیرمەندێکی ئیسلامی نوێخواز ناوی ببەن کە خوێندنەوەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ قورئان و شەریعەتی ئیسلام.

چالاکی ئەم ناوبراوە تەنها دووبارە کردنەوەی گومانی مولحید و ڕۆژهەڵاتناس و قورئانیەکانە ، ئیعلامیش ڕۆڵی ناساندن و چەواشەکاری دەکەوێتەسەرلەم بارەوەو وبەباشترین شێوە پێی هەڵساوە ، شایانی باسە لە کەناڵە کوردییەکانی خۆیشمانەوە میوانداری کراوە بۆ ئەوەی تاکی کورد بێ بەش نەبێت لە بیرو باوەڕە لیبرالی نوێخوازەکانی ئەم ناوبراوە.

**لە چەندین چاوپێکەوتن و گرتەی ڤیدیۆییدا**

**باس لەوە دەکات کە قەدەر درۆیە وزیندووبوونەوەی پاش مردن ئەفسانەیە و باوەڕی بە هیچ لایەنێکی ئیسلام نییە.**

# ( عمرو خالد )



ناوی (عمرو محمد حلمي خالد) هـ ، لە دایکبووی ساڵی ١٩٦٧ز لە ئیسکەندەریە لە میسر ، لە ساڵی ٢٠١٠ز بڕوانامەی دوکتۆرای لە زانکۆی وێڵز بەدەست هێناوە لە بریتانیا ، ناوبانگی لە ڕێگەی پێشکەشکردنی هەندێ بەرنامە لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە پەیدا کرد وەکو بەرنامەی: (ونلقى الأحبة ، على خطى الحبيب ، صناع الحياة..). شوهرەت و ناوبانگ دەرکردن هۆکارێکی سەرەکی بوون بۆ گومڕابوونی ، چونکە لادانەکانی لە گەڵ ڕۆژگارداو زیاتر ناوبانگ دەرکردنیدا زیادی دەکرد ، تا ئەو کاتەی بە تەواوەتی پشتی لە زۆرێك لە بوارە ئاکاری و تیۆرییەکانی ئیسلام هەڵکرد کە پێشتر خۆی بانگەوازی بۆ دەکرد. دوای ئەوەی لەسەرەتای ساڵەکانی ٢٠٠٠دا چەند هەزارکەسێك گوێی لێدەگرت. گەیشتە ئەوەی لە یاریگاکاندا نەك هەر لە میسر و وڵاتە عەرەبییەکان

بەڵکو لە ئەوروپاش بەو شێوە پێشوازی لێدەکرا ، بەڵام پاش چەند ساڵێك ڕێژەی لادانەکانی لە زیادبووندا بوون و زۆرێك لە زانایان وپسپۆڕان کەوتنە وریاییدان لە عەمر خالد. ئەو پێش ئەوەی بە تەواوەتی پشت لە چەمکە ئیسلامییەکان هەڵکات و بچێتە نێو پارتێکی عەلمانی و پشتگیری سیسی ڕابگەیەنێت و لە هەندێ وێنەدا لە گەڵ ئافرەتی نیمچە ڕووتدادەرکەوێت ، هەندێ ڕەخنەی بە توندی ئاڕاستە کرا.

لەوانە:

- جەهل و بایەخ نەدانێکی زۆری پێوە دیار بوو کاتێك باسی خوای گەورەی دەکرد ، خوای گەورەی وەسف دەکرد بە: **(ربنا سهران - يعشق - عايز - غشش آدم - يتلذذ).**

- وەسفی پێغەمبەر(ﷺ) ی دەکرد بەوەی کە تەمسیلی کردووە لە گەڵ جیبریل سەلامی خوای لێبێت..

-دەربارەی فەرموودەی ناقصات عقل ودين دەڵێت: (كان بيهزر) واتە: پێغەمبەر(ﷺ) سوعبەتی دەکرد لەوفەرموودەیەدا.

-دەیوت پێغەمبەر (ﷺ) (فاشل بووە) لە هەندێ کارو باری بانگەوازدا!!

-دەیوت موسی سەلامی خوای لەسەر بێت پەیوەندی سۆزداری لە گەڵ کچی شوعەیبدا هەبووەو دواتر بە هاوسەرگیری تەواو بووە.

-بۆچوونی وابوو دژایەتی جولەکە لەبەر ئەوە نیە جولەکەن.

- باوەڕی بە تكامل الحضارات هەیە ، بەو پێیەش نابێت هیچ كێشەیەك لەگەڵ ئایینەكانی تر دروست بكرێت و بەڵكو پێویستە ڕێككەوتن و خاڵی هاوبەش زۆر بكرێن.

**بەكورتی:** كەسێكی عەقلانی پەتیە ،تەفسیری قورئان و فەرمودە لە خۆیەوە دەكات ، لە بانگەوازدا كەمترین پشت بەستنی بە قورئان و فەرموودەیە ، بەڵكو بە عەقڵی خۆی بێ ئاگا لە سنوورەكانی بیروباوەڕ وبنەما نەگۆڕەكانی ئیسلام قسەكانی ئاراستەی خەڵكی گشتی دكات ، ئامادەبوانی وانە و كۆڕەكانی بە گشتی خەڵكی ناشارەزاو تازە وابەستە بووە بە ئیسلامەوە ، بۆیە زۆر جار ئافرەتی سەر ڕووت و قاچ ڕووت زۆر بە ئاسایی بەرانبەری دادەنیشن لە وانەكانیدا و هەرگیز بەلای ئامۆژگاریكردنیاندا ناچێت.

تێكەڵكەرێكی بە توانایە لە نیوان حەق و ناحەقدا ، پێی ناخۆش بوو هیچ ئەكتەرو گۆرانی بێژێك دەست لەكارەكەیان هەڵگرن ، تەنانەت داوای لە( شادیە) كرد پاش چەندین ساڵ لە تەوبەكردنی كە بگەڕێتەوە و گۆرانی بۆ قودس بڵێت لە گەڵ عەمر دیاب و راغب عەللامە. هەروەها زۆر ڕێزی لە عادل إمام و تەكتەرەكانی تر دەگرت وپەیوەندی لە گەڵیاندا هەبوو. لە تێكدانی چەمكە شەرعیەكان و داهێنانی ڕێبازێكی دوور لە زانستی شەرعی و سنوورەكانی بیروباوەڕی ئیسلامی بوو بە پێشەنگ و داهینەری ڕەوتێكی لاسایی كراوە،

كە لە كوردستانی خۆیشماندا كەسانێك بە ناوی بانگخوازەوە پەیدا بوون و نەك وەكو عەمر خالد بەڵكو زۆر لەئەو شلتر و تێكەڵكەرتر و ئەمانیش وەكو ئەو زیانیان زۆر لە سودیان زۆرتر بوو ،

له کۆتاییشدا ماڵ و سەروەتێکی زۆر کۆ دەکەنەوەو و بانگەوازەکەیان بۆ بە دەستهێنانی پلەو پایە و وەزیفەی حکومی باڵا بە کار ئەهینن.

عەمر خالد بە توندی لە لایەن زۆر زاناو کەسی شارەوازو بەرپەرچ دراوە لەوانە: محمد حسان ، أبو إسحق الحويني ، محمد صالح اللحيدان ، وجدي غنيم وکەسانی تر.

**پاش چەند ساڵێك ڕێژەی لادانەکانی لە زیادبووندا بوون و زۆرێك لە زانایان وپسپۆڕان کەوتنە وریاییدان لە عەمر خالد.**

# ( عدنان إبراهيم )



لە دایکبووی ساڵی ١٩٦٦ز لە غەززە / فەلەستین ، لە یوغسلافیا کۆلێژی پزیشکی خوێندووەو لەوێ بۆی تەواو نەکراوە، دواتر چووەتە نەمسا و تەواوی کردووە ، شارەزایی ورۆچوونی لە بواری فەلسەفەدا هەیە ، چەند زمانێك دەزانێت وتوانایەکی زۆری هەیە لە قسەکردن و سەرنج ڕاکێشانی خەڵکیدا ، نیشتەجێی نەمسایە و لە فییەننا مزگەوتێك وناوەندێکی ئیسلامی هەیە. لەسەرەتا لادان و لە ڕێگەدەرچوونی لە جنێودان وتانەدان لە موعاویەوە ڕەزای خوای لێبێت دەستی پێکرد ، دواتر تانەکانی خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) گرتەوە بەتایبەتی عائیشە ڕەزای خوای لێبێت ودواتر زۆربەی هاوەڵانی گرتەوە ، تاکو لە کۆتاییدا بوو بە خاوەن ڕێڕەوەیەکی تایبەتی خۆی لە ڕەخنەگرتن لە مێژووی ئیسلام و سەرانی زانایان و موفوسیرانی قورئان.

عەدنان ئیبراهیم لە ڕەخنەکانیدا کە دەیگرێت لە هاوەڵان و مێژووی ئیسلام هەمان شێوازی شیعە لە تانەدان و دژایەتیدا کردندا ڕەچاو دەکات ، بۆیە زۆرێك لە شارەزایان ئەویان بە شیعە یان لایەنگرێکی تەواوی شیعە زانیوە. چونکە ئەو لە زۆر بۆنە و کۆڕو کۆبوونەوەکانی ستایشی شیعە دەکات وەکو محمد باقر الصدر و عەلی شەریعەتی و تەنانەت یاسر الحبيب یش ، هاوکات بەبەردەوامی ڕەخنە لە ئەهلی سوننەت دەگرێت و بە خراپترین شێوە باسیان دەکات و گاڵتەیان پێدەکات.

عەدنان ئیبراهیم عەقلانیەکی تەواوە ، واتە:بە عەقڵ وتێگەیشتنی خۆی دەقەکان لێکدەداتەوە دوور لە لێکدانەوەو تیگەشتن و بۆچوونی زانایانی ئیسلام ، عەقلێك کە وابەستەی فەلسەفەیە و ڕانەهاتووە لە گەڵ ڕێزگرتن وخۆ دانەدەست قورئان وسوننەتەوە،لە گەڵ ئەو هەموو بێ ڕێزییەش بەرانبەر دایکانی موسوڵمان وهاوەڵان و مێژووی ئیسلام وزانایان دەیکات ، هەندێ جاریش ستایشی هاوەڵان دەکات وهەندێ قسەی گونجاو و نزیك لەگەڵ ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا دەکات وەکو تێکەڵکردن و خۆڵ لە چاو کردن!

عەدنان ئیبراهیم: مامۆستایەکی نەبووە لە ژیانیدا زانستی ئیسلامی لێ فێر بێت ،تەنها خۆی پشتی بە کتێب خویندنەوە بەستووە بە تایبەت لە بواری فەلسەفەدا ، لە ڕەخنەکانیشیدا پشت بە سەرچاوەکانی شیعە دەبەستێت و قسەکانی ئەوان دووبارە دەکاتەوە ، هاوکات زۆر جار سەرچاوەکانی ئەهلی سوننەت ڕەتدەکاتەوەو بە ناشیرینترین شێوە باسیان دەکات

عەقڵی خۆیشی کردووەتە حاکم و بڕیاردەر بەسەر دەقەکانەوەو هیچ باکی لەوە نییە پێچەوانەی سەرجەم زانایانی ئیسلام قسەبکات و دەشیکات ،کاتێك تورە دەبێت چاوی دەنوقێنێت و دەست و لاشەی دەجوڵێنێت و هەرچی بە دەمیدا بێت نایگێڕێتەوە بەرانبەر عائیشەو هاوەڵان و زانایان و سەرچاوەکان و تێکڕای مێژووی ئیسلام.

بۆچوونەکان دەربارەی پیناسەکردنی ئەم ناوبراوە هەندێك جیاوازن ، هەندێکیان بە شیعەیان زانیوە ، یان بە لایەنگری ئەوان ، یان بە فیتنەگێڕ و تێکدەر.یان بە بیرمەندێکی ئازاد و وابەستە نەبوو بە جگە لە عەقڵ و بۆچوونی خۆیەوە .بەڵام بەهەر حاڵ هەرچییەك بێت ئەهلی سوننەت و جەماعەت نییە و گومرایەکی لادەرە.

لایەنگران و خۆشەویستانی عەدنان ئیبراهیم بریتین لە شیعە و ئەو سوننیانەی مێشکیان بە رەخنە بەرانبەر مێژووی ئیسلام و هاوەڵان ئاخنراوە ، یان کەسانێك کە زانیارییەکی کەمیان دەربارەی ئیسلام هەیە و دەکەونە ژێر کاریگەری ئەم ناوبراوەوە.

گەر بمانەویت باسی گومراییەکانی عەدنان ئیبراهیم بکەین و بەڵگە لە قسەکانی خۆی بێنینەوە ئەوە بێ گومان پێویستە کتێبێکی بۆ تەرخان بکەین ، بەڵام وەکو ئەوەی لەم زنجیرە باسانەدا رەچاومان کردووە لە جەختکردنەوە لەسەر تەنها ناساندن ،

بە کورتی و لە ڕۆشنایی بە دوادا چوونی هەندێ نووسەر و مامۆستای بەڕێزدەڵێم:

١- دەربارەی موعاویە ڕەزای خوای لێبێت عەدنان إبراهیم دەڵێت: (دعي بن دعي) واتە: درۆزنی کوڕی درۆزن ، ئینجا دەڵێت یەزیدی کوری موعاویە زۆڵە ، هەروەها دەڵیت: خێزانەکەشی خەریکی دڵداری بووە!

٢- دەربارەی دایکی موسوڵمانان عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: **(بدائية جاهلة ، رجلة ، طفيلية)** واتە: نەفام بووەو وەکو پیاو هەڵس و کەوتی کردووە..ئینجا دەربارەی دەڵێت:**(عائشة مبطلة وعلى باطل، وهي ضرس بِتَخوِّف ولذلك اشتراها معاوية بالمال حتى تسكت).**

ئەمە جگە لە گاڵتە پێکردنی و تانەو تەشەری بەردوامی لێی تەنانەت کە پرسیاری لێ دەکەن دەچێتە بەهەشتەوە قسە ناکات و دوای دەڵێت خوا ئەزانی حاڵی چۆن ئەبێت. بەڵکو دەڵێت لە نێوان عائیشەو تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا پەیوەندییەکی خۆشەویستی هەبووە! ئەمە لە کاتێکدا کەئەو کەسەی باسی دەکات دایکی ئیماندارانە و خێزان وخۆشەویستی پێغەمبەرەکەمانە وخوای گەورە ستایشی داوین پاکی و سەرڕاستی ئەوی بۆ کردووین لە قورئاندا.

٣-دەربارەی ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: **(أسلم من أجل بطنه، أسلم من أجل الخِرفان، حتى ضجِر منه النبي صلى الله عليه وسلم فقال: زر غبا تزدد حبا.)** هەروەها دەڵێت: **(بني أمية أعطوه الأموال ليروي الأحاديث لهم.)** واتە: لە بەر برسێتی موسوڵمان بووەو پارەی لە بەنی ئەمەییە وەرگرتووەو فەرموودەی بۆیان هەڵبەستووە!

٤- تانه له عومەر و ئەبو بەکر و ئەنەس و هاوەڵانی تر دەدات ڕەزای خوایان لێبێت و پشت به هەندێ ڕیوایاتی شیعەو درۆ دەلەسەی مێژوو لەو بارەوە دەبەستێت.هەندێ لەقسەکانی له خراپی و ڕەچاونەکردنی ئەدەبدا ناتوانم باسیان بکەم.

٥- قسەکردن و تانه دانی له زانایانی ئیسلام به ئەوپەڕی بێ ڕێزییەوە: دەڵێت**(ابن تيمية ناصبي عاشق لبني أمية، والذهبي ناصبي هواه أموي، ابن حزم ناصبي، ابن كثيرو ابن عساكر يؤرخان لبني أمية، الهيتمي هواه أموي...)**

دەربارەی کتێبی العواصم من القواصم دەڵیت: **(كتاب تضليل وتزويروبهتان).**

دەربارەی زانایانی ئەم سەردەمه دەڵێت:**(مشايخ اليوم أستحي ان أقول عنهم نساء ولا صبيان ولا حقراء بل هم ذباب وصراصير وفئران وأرانب.)**واته: به مێش و سیسەرکه ومشك و کەروێشك وەسفیان دەکات! هەروەها دەربارەی زانایانی ئەهلی سوننەت دەڵێت:**(هذه الأمة حُكمت بالطواغيت ألف وأربعمئة سنة من هؤلاء الطغاة الفقهاء وقال: علماؤنا ضللونا فكر متخلف ومنحط.).**

٦-تانەو بێ ڕێزی کردنی بەرانبەر بوخاری و موسلیم و فەرمودەناسانی تر: دەڵێت:**(إذا جاء الحديث و أثبتت التجربة أنه مخالف لها فرده ولو كان متصل السند في البخاري وإلا كنت أهبلا، وإذا أثبت التاريخ ما يخالف البخاري ومسلم فردهما وعليك أن تقول هذا كذب وغلط.).**

٧- تانەدانی بەردەوامی لەئەهلی سوننەت...

٨- ستایشکردنی بەردەوامی بۆ شیعە، لەو بارەوە دەڵێت: (مذهب الشيعة الإمامية في الصحابة أقل خطرا على العقول والنفوس من مذهب أهل السنة والجماعة.)هەروەها وتوویەتی:(الشيعة إخواننا، وهو مذهب أنت مخير أن تكون حنبليا أو شافعيا أو إماميا.) دەربارەی یاسر الحبيب یش دەڵیت: ئەو درۆزن نییە ، بەڵام بێ ئینصافە و لە کانگای دڵمەوە دوعای خێری بۆ دەکەم! بەڵکو ستایشی الطبرسي دەکات کە ئەو پێی وایە قورئان دەستکاری کراوە.

٩- قەناعەتی بە جیاوازی میراتی نێوان کوڕ و کچ نییە و دەڵێت لەم سەردەمە پێویستە میراتی بە یەکسانی دابەش بکرێت!

١٠- باوەڕی بە ئیجماعی زانایان نییە!

١١- جارێکیان وەسفی پێغەمبەر (ﷺ) ی کرد بە وشەی(نزق) واتە کێشەی هەبوو لە ڕەوشتیدا (پەنا بە خوا ).هەروەها قەناعەتی وایە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گومانی بووە لە ئیسلام!

١٢- دەڵێت قسەکانی عەلی ڕەزای خوای لێبێت لەسەرووی قسەی مرۆڤەکانەوەی و لە خوار قسەی خواوەیە: (كلام علي فوق كلام المخلوق ودون كلام الخالق.)

لە گەڵ یەك زنجیرە قسە و ڕاو بۆچوونی لە مانە خراپتر وەکو پشتگیری ڕاشکاوانە بۆ بیردۆزەی داروین وقسەی سەیروسەمەرە دەربارەی شەڕکردنی لەگەڵ جنۆکەکان و...سەرەرای ئەوەش دەڵیت من سوننیم و بەزمانی لوس خەڵکانێکی زۆری فریو داوە بەتایبەت گەنجە تازە پێگەیشتووەکان و چینی گومان لە دڵەکان دژی ئیسلام.

ئەمەی باسم کرد مشتێك بوو لە خەرواری گومراییەکانی عەدنان ئیبراهیم کە هیوادارم موسوڵمانان لە راستی ئەم کابرا تێبگەن و ئەوەش بزانن ئەمڕۆ لە کوردستانی خۆماندا بە داخەوە خەلکانێك کار دەکەن بۆ بڵاوکردنەوەی بیروبۆچونەکانی و راستیەکەی باس ناکەن و وکو ئامرازێکی وێرانکردن بە کاری دەهێنن بۆ کاریگەری دروستکردن لە سەر گەنجان و چینی ڕۆشنبیرە دابڕاوەکان لە زانست و رۆشنبیی ئیسلامی ، کەسانێکیش لەناو پارتە ئیسلامییەکان و هەندێ لە ڕێکخراوە ئیسلامییەکان بێ وچان سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی چەواشەکارییەکانی عەدنان ئیبراهیم ن ئیتر بە بەهانەی جۆراوجۆر و جیاواز.

**دەربارەی موعاویە ڕەزای خوای لێبێت عەدنان إبراهيم دەڵێت: (دعي بن دعي) واتە: درۆزنی کوڕی درۆزن.**

# ( د.علي جمعة )



ناوی (علي جمعة محمد عبد الوهّاب) هـ ، لە دایکبووی ساڵی ١٩٥٢ز لە میسر ، لە نێوان ساڵەکانی ٢٠٠٣ بۆ ٢٠١٣ز موفتی میسر بووە ، لە بنچینەدا بەکالۆریۆسی بازرگانی هەبوو بەڵام دواتر دوکتۆرای لە (أصول الفقه ) لە أزهر بەدەست هێناوە(کە ئەمەش مشت ومڕوناکۆکیەکی زۆری لەسەرە!). لەسەرەتای لاوێتی باوەری بە تەکفیر کردنی فەرمانڕەواکانی عەرەب بوو چونکە کار بە بەرنامەی خوا ناکەن و زۆر جار باسی زەرورەتی هەوڵدانی دەکرد بۆ گێڕانەوەی خیلافەتی ئیسلامی ، بەڵام پاش چاوپێکەوتنی لەگەڵ الشيخ الغماري کە صۆفیەکی مەغریبی بە ناوبانگ بوو ، ئەوی لە یسر کرد بە جێنشینی خۆی و لەو ڕۆژەوە عەلی جومعە بوو بە خاوەن تەریقەت و ئاڕاستەی باسەکانی گۆڕان بۆ باسی کەراماتی ئەولیا و تەریقەت وحەقیقەت و باسی لەو شێوە ،

ئینجا هاوکات پابەند بوونی بە شەرعەوە بە شێوەیەکی بەرچاو کەمی کرد و تەنانەت وای لێهات ئاهەنگی عید میلادی خۆی و مۆم کوژاندنەوەی لە ناوەڕاستی ئافرەتی نیمچە ڕووتدا دەگێڕا ،هەروەها بەوەش ناوبانگی دەرکرد هاوسەرگیرییەکی زۆری دەکرد بە شێوەی عورفی و لەگەڵ ئەکتەرە میسرییەکاندا و ینەی دەگرت و بڵاویش دەکرایەوە ، ئەمە جگە لە فەتوای سەیرو سەمەرەو پێچەوانەی شەرع و ئیجماع کە بەردەوام لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە بۆی پەخش دەکرا ، هەر لێرەشەوە حکومەتی میسر چاوی خستەسەری و لەلایەن دەزگاکانی ئاسایش و موخابەراتەوە بە بەهانەی ئاسان کۆنترۆڵکردنی لە لایەن دەسەڵاتەوە پێشنیار کرا بۆ موفتی میسر و ئیتر ئەو پۆستەی وەرگرت.(لەم بارەوە هەندێ بەڵگە نامە دەستکەوت پاش شۆرشەکەی میسر)

عەلی جومعە نمونەی زانای لە خوا نەترس و دینفرۆشە بە وتەی هەموو ئەوانەی دەکرێت حیساب بۆ ڕاو بۆچوونیان بکرێت ، جگە لە عەلمانی و ئەکتەرەکان و خاوەن تەریقەتە توندڕەوەکانی میسر کەس دانی خێری پێدا نەناوە ، بە تایبەت دوای دەرکەوتنی حەقیقەتی و هەڵماڵینی پەردە لەسەر هەڵوێست و بۆچوونە پێچەوانەکانی لە گەڵ شەرعی خوای کەورە کە لە کۆتاییدا ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەین.

-باوەڕی بە (توحید الأديان ) واتە: یەکگرتنی هەرسێ ئایینەکان هەیە لەم سەردەمە.

- باوەڕی وایە موسوڵمان بۆی هەیە لە ئیسلام هەڵگەڕێتەوەو لە دونیادا هیچی لەسەر نییە و لە قیامەتدا حیسابی لای پەروەردگارێتی.

-فەتوای داوە کە موسوڵمان بۆی هەیە لە وڵاتەکانی ئەوروپا دوکانی عارەق فرۆشتن دابنێ و کار بکات لەو شوێنانەی عارەق تێدا دەفرۆشرێت یان ڕیبای تیدا ئەنجام دەدرێت و گۆشتی بەرازی تێدا دەخورێت ، چونکە ئەو شتانە لای ئەوان حەڵاڵە.

-فەتوای هەیە دەربارەی جائیز بوونی ئەوەی ئافرەت لە ئیسلامدا ببێتە سەرۆك و هەروەها کەسی مەسیحی ش بەهەمان شێوە.

-باوەڕی وایە ئەولیای خوا ئاساییە زینا بکەن و باسی وەلییەك دەکات زینای کردووەو یەکێك لە موریدەکانی ئاوی بۆ گەرم کردووە بۆ غوسلی دوای زینا!

-باوەڕی وایە زۆربەی میسرییەکان تەڵاقیان ناکەوێت چونکە لە جیاتی ئەوەی لە کاتی جیابونەوەیان بە هاوسەرەکانیان بڵێن(أنت طالق) (انت طالء)چونکە مەعلومە ئەوان پیتی قاف بە هەمزە دەگۆڕن.

-بانگەشەی ئەوەی دەکرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبینێت لە غەیری کاتی خەودا و سەلامی لێ دەکات لە کاتی بێداریدا.

-پێش لابردنی حسني مبارك فەتوای ئەوەی دەرکرد بەشدابووانی خۆپیشاندانەکانی گۆڕەپانی تەحریر خەواریجن کە سەرکەوتن پەشیمان بوویەوە.

-پاش کودەتاکەی عبد الفتاح السیسی پشتگیری تەواوی بۆیان دەربڕی ولە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا بە ئامادە بوونی سیسی و گەورە ئەفسەرانی سوپای میسر فەتوای ئەوەی دا ئەوانەی خۆپیشاندان دەکەن لە رابیعەو شوینەکانی تر خەواریجن و بیانکوژن و دەستیان لێ مەپاریزن

و هەروەها وتی خوا پاشان پێغەمبەرەكەی(ﷺ) لە گەڵتاندایە لە كارەتان.

- چەندین وینەی هەیە لە گەڵ ئەكتەرە ئافرەتەكانی میسر بە پیكەنینەوە گرتویەتی لەوكاتەی موفتی میسر بووە.

-لە شوێنێكدا پرسیاری حوكمی دیموكراتی لیدەكەن دەڵێت: مەعقول نییە دیموكراتی كە ڕۆژئاوا ساڵانێك هەوڵ و كۆششی بۆ كردووە كوفر بێت یان شتێكی خراپ بیت!

-ساڵانێك پێش ئەوەی ببێتە موفتی میسر دەیوت نقاب بۆ ئافرەتان فەرزە ، كە بووە موفتی وتی ئەوە عادەتی عەرەبەكان بووە و من خۆم فەرمانم كردووە بە خیزان و كچەكانم وازی لێبهێنن و نەیپۆشن!

-پرسیاری لێكرا ئایا گۆرانی حەڵاڵە ، وتی: عبد الحليم حافظ بە ڕەحمەت بێت پیاوێكی ئیماندار بووەو مەبەستی لە گۆرانی أبو عيون جريئة پێغەمبەر بووە (ﷺ)!

- لە پرسەی كوڕەزایەكی حسني مبارك دا بڕیاریدا كە خوا لیخۆشبوو ئەهلی بەهەشتە و هەروەها دایك و باوكیشی و زۆر شتی پێچەوانەی عەقیدەی ئیسلامی وت كە بە ڤیدیۆ هەیە.
- لە كتێبێكیدا كە پڕە لە فەتوای پێچەوانەی شەرع دەڵێت جائیزە ئەو كچەی زینای كردووە پەردەی كچێنی خۆی بدورێتەوە بە نەشتەرگەری بۆ ئەوەی لە مێردەكەی بشارێتەوە.

- دەربارەی زەواجی موتعە و زۆر پرسی تر بیرو بۆچوونی گەلێك نزیكە لە شیعەكانەوە.
**تێبینی** :ئەمەی باسم كرد لەم چەند دێڕەدا تەنها وەكو نموونە هێناومەتەوە ، ئەگەر نا پەڕاوگەی عەلی جومعە وەكو شەوی تاریك رەش دەكاتەوە.

لە کۆتاییدا ئەڵێم: عەلی جومعە چەند ساڵێك لەمەوبەر سەردانی قودسی کردووە لە ژێر چاودێری قەوارەی زایۆنی لەوێ ماوەتەوە ،کەئەوە بووە مایەی ناڕەزاییەکی زۆر ئەو کاتە ، هەروەها لەبەر هەڵوێستەکانی ( سەبارەت بە ناشیرینکردنی ئیسلام) لە لایەن زانکۆی لیڤەرپول لە ئینگلتەرا خەڵات کرا و ڕێزی لێنرا.

جگە لە چەندین دوکتۆرای فەخری لە لایەن ئەوانەی چاویان بە سەروەری ئیسلام هەڵنایە.

زۆربەی ئەمانەی باسم کردووە بە دەربڕینی خۆی بە ڤیدیۆ لە یوتیوب هەیە .

**لەبەر هەڵوێستەکانی ( سەبارەت بە ناشیرینکردنی ئیسلام) لە لایەن زانکۆی لیڤەرپول لە ئینگلتەرا خەڵات کرا و ڕێزی لێنرا.**

# ( ابن الراوندي )



ناوی ( أبو الحسن أحمد بن يحيي بن إسحاق الراوندي) ه ، لە ساڵی ۲۱۰ی کۆچی لە گوندی راوەند لە نێوان ئەصفەهان و کاشان لە ئێران لە دایك بووە و لە تەمەنی چل ساڵیدا لە دونیا دەرچووە. پاش مردنی زیاتر لە دووسەد کتێبی بە جێهێشتووە زۆربەی لە بێباوەڕی و ئیلحاددا نووسراون بەڵام زۆربەیمان پێ نەگەشتووە ئەگەرچی زۆرێك لە بیرۆکەکانی لە ڕێگەی کتێبی (الانتصار) ی الخياط المعتزلي پێی ئاشنا بووینە.

ئەو لە بنچینەدا جولەکە بوو هاتە نێو ئیسلام و موسڵمانێتی خۆی راگەیاند ، پاشان بۆ ماوەیەکی زۆر بە یەکێك لە سەرانی ڕێڕەوی موعتەزیلەکان دەناسرا و داکۆکی لەسەر ئەو ڕێڕەوەی ئەوان دەکرد ، سەر ئەنجام وازی لەو بیرۆکەیەش هێنا و بەسەریاندا هەڵگەرایەوە و کتێبێکی لەو بارەوە نووسی بە ناونیشانی (فضائح المعتزلة) وەکو: بەرپەرچدانەوەی کتێبێکی (الجاحظ ) بە ناونیشانی:(فضائل المعتزلة) ،

ئینجا بۆ ماوەیەکی کەم بووە شیعە و کتێبێکی لە پشتگیریاندا نووسی بە ناونیشانی (الإمامة) ، بەڵام پاش چاوپێکەوتنی بە (أبي عیسی الوراق) بە جارێك لە ئیسلام دەرچوو و هەڵگەڕایەوە ،هاوکات بوو بە یەکێك لە سەرانی زەندەقە و (لا أدري)کان.

(ابن الراوندي) لە کتێبەکانیدا سوکایەتی بە خوا پاشان پێغەمبەرایەتی و قورئان دەکات ، پێشتریش بە زۆری لە گەڵ مولحید و شیعەکاندا دەبینرا ، کاتیك گلەیی لیدەکرا لەو بارەوە دەیوت: دەمەویت بزانم بۆچوونەکانیان چۆنە؟ (الدامغ) یەکێکە لە کتێبەکانی لە دژی قورئان نووسیویّتی ، هەروەها (الزمردة) لە دژی پێغەمبەران نووسیوێتی و زۆر شتی تریش لەو شێوە.

بۆ ماوەیەك سەرقاڵی لەبەرگرتنەوەی کتێب بوو ،بەڵام لەو کارەی دەرکرا چونکە دەستکاری بە زیادکردن و کەم کردن لە نووسینەوەی کتێبەکاندا دەکرد، دواتر لە لایەن سوڵتانەوە داوا کرا ئەویش خۆی شاردەوە لەلای هاوەڵێکی بە ناوی ( ابن لاوي) تاکو مرد. زانایانی ئیسلام بەرپەرچی بیرۆکەکانیان داوەتەوەو و لەکتێبەکانی (ابن الجوزي و ابن تیمیة و الذهبي) بە شیکراوەیی باس کراوە بەتایبەت لە کتێبی (سیر أعلام النبلاء) ی الذهبي جوزئي ١٤ لاپەڕە ٥٩.

(أبو الوفاء ابن عقیل) گلەیی لە موسوڵمانانی سەردەمی خۆی کردووە کە ڕازی بوونە کتێبی ئەو نووسەرە بخوێنریتەوە لەکاتێکدا هەمووی پڕ بووە لە زەندەقە!

پاش هەزار و دووسەد ساڵ لە مردنی ئەم بێ باوەڕە ناوەندیك درووست بووە بە ناوی (راند) كە گەورەترین ناوەندی فیكرییە لە جیهانداو كاریگەری زۆری لە سەر سیاسەتی ئەمریكا هەیە و تەنها یەك لقی لە دەوڵەتیكی عەرەبی هەیە ئەویش لە قەتەرە ،كاری ئەم سەنتەرە دژایەتی ئیسلامە بە گشتی و ، داواش دەكات لەعەلمانی و صۆفییەكان كە هەڵسن بە ئەركی گۆڕینی ئیسلام و ڕوبەڕوبونەوەی هەموو تەوژمە ئیسلامییەكان بە بێ جیاوازیكردن لە نێوانیاندا ، هەندێ میكانیزمیشی بۆیان دیاری كردووە وەكو پابەند بوون بە عەلمانیەت و بنەماكانی دیمەكراتیەت و مافی ئافرەتان و ..هتد

بۆ زانیاری زیاتر ،بڕوانە:

-**من ابنِ الراوندي إلى أبناءِ راند: الزنْدَقةُ تُجدِّدُ نفسَها/أحمد بن عبد المحسن** العساف. سایتی صيد الفوائد.

-تاريخ الالحاد فی الاسلام/ عبدالرحمن البدوي

-سایتی وێكبیدیا.

# ( الحلاج )



ناوی (أبو عبد الله حسين بن منصور الحلاج) هـ ، لە ساڵی ٢٤٤ك لە البيضاء لە وڵاتی فارس لە دایکبووە ،بەڵام لە واسط پەروەردە بووە کە دەکەوێتە باشوری عێراقەوە ، لە سەرەتای گەنجی و لەتەمەنی شانزە ساڵانەوە پەیوەندی کردە بازنەکانی تصوف و هاوڕێتی جونەیدی بەغدادی وسەهلی توستوری وهەندێ لەسەرانی تەسووفی ئەو سەردەمەی خۆی کردووە ، دواتر خۆی بووە خاوەن مورید و خەڵکێکی زۆر.

زۆری پێنەچوو تاکو پەیوەندییەکانی لەگەڵ سەرانی تەسووف تێکچوو ، چونکە لە ئاراستەو فەرمانی ئەوان دەرچوو ، بۆ ماوەیەکی زۆریش لە حەرەمی مەککە ئیعتیکافی کرد و ئارامگرتنێکی زۆری لێ بەدیکرا لەسەر عیبادەت و برسێتی ومانەوە لەبەر هەتاوی گەرم وسەرما و شتی لەوجۆرە.

حەللاج سەرەتا تەنها هەندێ شەتەحاتی هەبوو ،واتە: قسەیەکی دەکرد دوو واتای باش و خراپی هەڵدەگرت ، بەڵام دواتر بوو بە خاوەنی بیرۆکەی (الحلول) کە پێوە ناوبانگی دەرکرد ، واتە: باوەڕی وابوو خوای گەورە دەچێتە ناو دروستکراوەکانیەوەو بەوشێوەش جیاوازی نامێنێ لەنێوان خوا و دروستکراوەکانی ، وەکوچۆن نەسرانیەکانیش دەیانوت خوا چووەتە لاشەی مەسیحەوە ، بۆیە بە پێی ئەو بیروباوەڕە و ، هەروەها بیرۆکەی (الإتحاد) یش کە زۆرێك لەوانە باوەڕیان پێیەتی خوای گەورە لە لاشەی هەموودروستکراوەکانی خۆیدایە ، تەنانەت ئاژەڵێکیان دەدی ئەیانوت ئەوە خوای تێدایە والعیاذ بالله ،ئینجا گەشتێکی زۆری بە وڵاتاندا دەکرد لەسەر بنەمای فەلسەفەی حلول بە تایبەتی خەڵکانێکی زۆر شوینی کەوتن وپێی کاریگەر بوون، تاکو پرسەکەی گەیشتە خەلیفەی موسوڵمانان (المقتدر بالله العباسی) ودەستگیر کرا بەڵام لەبەر ئەوەی نکۆڵی کرد لەو تۆمەتانەو و دانی بەوەنا کە ئەهلی سوننەیە ئازاد کرا ، بەڵام پاش دەرچوونی زۆری نەبرد بانگەشەی خوایەتی کرد و هەمیشە دەیوت خوا لە ناو جوببەکەمدایە و دەیووت: أنا الحق.ئینجا خەڵکانیکی زۆر باوەڕیان بە بیروباوەڕەکانی هێنا و تەنانەت کەسانێك لەدەورو بەری خەلیفەش شوینی کەوتن ،

بەڵکو کۆمەڵانیکی زۆر لە وڵاتەکانی هندستان و عێراق و فارس و شوێنی تر وەکو کۆمەڵی سەر بە ئەو دروست بوون و نامەیان بۆدەنارد ولە هەر وڵاتێك بە نازناوێکەوە نامەیان بۆ دەنارد وەکو:

(المغیث و الممیز والمقیت و المصطلم ) بۆیە ئەمجارەیان هەندێك لە شوێنکەوتوانی دەستگیرکران و دانیان بەوەنا کە بانگەشەی خوایەتی دەکات ،

دواتر ماڵەکەیان پشکنی و هەندێ نووسراویان لەو بارەوە دەستکەوت وخێزانەکەشی دانی بەوە نا کەفەرمانی بە خۆی وکچەکەی کردووە سوجدەی بۆ بەرن و وتوویەتی خوایەك لە ئاسمان و خوایەك لە زەوی هەیە کە حەللاجە! بۆیە ئەنجومەنێکی باڵا لە زانا وشەرعناسەکان لە بەغداد کۆبوونەوەو فەتوای کافر بوونیاندا و خەلیفە فەرمانی دەرکرد هەزار قامچی لێبدرێت و دەست و قاچی بېڕیدرێت ولە ناو بەغداد هەڵبواسرێ.

لە ڕۆژی سێ شەممە ٢٤ ی ذي القعدة ساڵی ٣٠٩ك حوکمی شەرعی لەسەر جێبەجێ کرا وەکو زندیق و جادووباز ، لەوڕۆژەشدا خەڵکانێکی زۆر کۆبوونەوە بۆ بینینی کوشتنەکەی ، پێش کوژرانی بە خەڵکەکەی وت پاش سی ڕۆژی تر دەگەڕێمەوە ،بەڵام هەرگیز نەگەڕایەوە.

شایانی باسە کە زۆربەی زۆری زانایان بە خودی ئەهلی تەسووفیشەوە ئەویان بە زندیق زانیوە ، جگە لە کەسانێکی کەم نەبێت لە مێژوودا نەیانتوانیوە حوکمی لەسەر بدەن و پۆزشیان بۆ قسەکانی هێناوەتەوە .

-لەوتەکانی الحلاج:**من زعم أنه يوحد الله فقد أشرك.( أخبار الحلاج) - ص ٤١**

-بیرۆکەی حلول ی زۆر جار بەم دوو بەیتەی خۆی ڕووندەکردەوە:**أنا من اهوى ومن اهوى أنا نحن روحان حللنا بدنا فإذا أبصرتني أبصرته وإذا أبصرته ابصرتنا** . لەوتەبەناوبانگەکانی: **سبحاني ما أعظم شاني.**

- هەروەها فیرعەونی بە خواناسێکی گەورە دەزانی.

-هەروەها وەکو وتمان باوەری بە بیرۆکەی الحلول بووە وپێی وابووە خوای گەورە لە ناو هەموو شتێکدایە!

-لە هۆنراوەیەکیدا دەڵێت: **عَقَدَ الخلائقُ في الإله عقائدا وأنا اعتقدتُ جميعَ ما اعتقدوه**..واتە:خەڵکی دەربارەی خوا بیروباوەڕیانزۆر بووە ، بەڵام من باوەڕم بە هەموو ئەو بیروباوەڕانە هەیە.

-هەروەها دەیوت: : **إن أرواح الأنبياء أعيدت إلى أجساد أصحابه وتلامذته ، فكان يقول لأحدهم : أنت نوح ، ولآخر: أنت موسى ، ولآخر: أنت محمد.**

-دەربارەی حەللاج شيخ الإسلام ابن تيمية فەرموویەتی :

**( مَنْ اعْتَقَدَ مَا يَعْتَقِدُهُ الْحَلاجُ مِنْ الْمَقَالاتِ الَّتِي قُتِلَ الْحَلاجُ عَلَيْهَا فَهُوَ كَافِرٌ مُرْتَدٌّ بِاتِّفَاقِ الْمُسْلِمِينَ ; فَإِنَّ الْمُسْلِمِينَ إنَّمَا قَتَلُوهُ عَلَى الْحُلُولِ وَالاتِّحَادِ وَنَحْوِ ذَلِكَ مِنْ مَقَالاتِ أَهْلِ الزَّنْدَقَةِ وَالإِلْحَادِ كَقَوْلِهِ : أَنَا اللَّهُ . وَقَوْلِهِ : إلَهٌ فِي السَّمَاءِ وَإِلَهٌ فِي الأَرْضِ وَالْحَلاجُ كَانَتْ لَهُ مخاريق وَ أَنْوَاعٌ مِنْ السِّحْرِ وَلَهُ كُتُبٌ مَنْسُوبَةٌ إلَيْهِ فِي السِّحْرِ . وَبِالْجُمْلَةِ فَلا خِلافَ بَيْنِ الأُمَّةِ أَنَّ مَنْ قَالَ بِحُلُولِ اللَّهِ فِي الْبَشَرِ وَ اتِّحَادِهِ بِهِ وَأَنَّ الْبَشَرَ يَكُونُ إلَهًا وَهَذَا مِنْ الآلِهَةِ : فَهُوَ كَافِرٌ مُبَاحُ الدَّمِ وَعَلَى هَذَا قُتِلَ الْحَلاجُ )اه (مجموع الفتاوى )** ٢/٤٨٠.

-جێگای ئاماژە بۆ کردنە زانایان لە درێژایی مێژوو - جگە لە کەسانێکی زۆر کەم نەبێت - لەسەر پێناسەی زنديق بۆ حەللاج ڕێککەوتوون ،

بەڵام هەرچی تاقمە لادەرەکان هەیە بە ئەو پەڕی سۆزو بە زەیی و ڕێزەوە تەماشایان کردووە ، تا دەگاتە ئەم سەردەمەی خۆمان ڕۆژهەڵاتناسەکان وەکو ماسینیون و ئەوانی تر ، هەروەها هەموو عەلمانی وحەداسیەکان ، بەڵکو هەموو دوژمنانی ئیسلام بە شەهید و ستەم لیکراو وەسفیان کردووە ، تەنانەت بووە بە هێما و ڕەمزێکی پیرۆز لە لای شاعیرانی حەداسە کە هەڵوێستی زۆر توندیان لە ئیسلام هەیە ،وەکو ئەدۆنیس و عبد الوهاب البياتي و صلاح عبد الصبور وزۆرێکی تریان کە لە دیوانەکانیاندا ناوی دەهێنن.

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە :

- مقتل الحلاج الصوفي/ راغب السرجاني/سايتى قصة الاسلام.
- لە مجموع الفتاوى شێخ الاسلام ابن تيمية زۆر جار بە وردی باسی دەکات.
- پێشەوا الذهبي و مێژووناسانی تر لە کتێبەکانیاندا لە بەسەرهاتەکانی یان لە وەفەیاتی سەدەی سێیەمی کۆچی باسیان کردووە.بروانە: تاريخ بغداد للخطيب البغدادي (١١٢/٨-١٤١) .
- المنتظم لابن الجوزي (٢٠١/١٣-٢٠٦) .
- سير أعلام النبلاء للذهبي ( ١٤ / ٣١٣-٣٥٤ ) . البداية والنهاية لابن كثير ) ١٣٢/١١-١٤٤.

# ( سيد القمني )



له دایكبووی ساڵی ١٩٤٧ز له بەنی سوێف له میسر ، توێژەره له بواری مێژووی ئیسلامی له ڕوانگەیەكی ماركسیەوه ، دوژمنێكی توندڕەوی ئیسلامه ،خاوەنی چەندین كتێب وتوێژینەوەو وتاره له بواری رەخنەگرتن له مێژووی ئیسلام و كەسایەتی پێغەمبەر (ﷺ) و تەفسیری سەرهەڵدانی دەوڵەتی ئیسلامی ، بەڵام ئەو له كەناڵی جەزیره ڕایگەیاندبوو كه كەسێكی موعتەزیلیه وباوەڕی بەوقوتابخانه هەیه نەك مولحید بێت..سيد القمني زۆر شەیدای ناوبانگدەركردن بوو . ناوبانگیشی دەرنەكرد تاكو تەقینەوەكانی طابا له میسر له ٢٠٠٤ز ، ئەوكاته وتارێكی توندی نووسی بەناوونیشانی «إنها مصرنا يا كلاب جهنم!» تێیدا هێرشی كرده سەر ئیسلام و ئیسلامییەكان به گشتی تەنانەت ناوی يوسف القرضاوي و فهمي الهويدي شی هێنا لەوتارەكەیدا ، دوای ئەم وتارەی كۆمەڵه هەڕەشەیەكی ئاڕاسته كرا له لایەنی ئیسلامی جیا جیا وه ،

بەڵام بە وتەی خۆی ئەو هەڕەشانەی بە هەند وەرنەگرت تاکو گەیشتەی ئەووەی هەڕەشەیەکی لە لایەن (الجماعة الاسلامية)وە پێگەیشت ، کە ئەوکۆمەڵە چەکیشیان دانابوو و سەرقاڵی موراجەعات بوون سەبارەت بە رەوتی چەکداری خۆیان ، بۆیە ترسا و لە ڕێگەی نامەیەکەوە بۆ دەزگاکانی ڕاگەیاندن پەشیمانی خۆی لە هەموو شتێك نیشاندا و،وتی من نەك لە قەڵەم بەڵکو لە فیکریش وازئەهێنم و ،هەروەها وتی من هەرگیز وام نەدەزانی لە دینداریمدا تۆمەت بار دەکرێم ! من هەرگیز وانازانم ئیسلام بەدیلی هەیە وقسەی لەو جۆرە ، لەبەشێك لەڕوونکردنەوەکەیدا دەڵێت:

**«تصورت خطأ في حساباتي للزمن أنه بإمكاني كمصري مسلم أن أكتب ما يصل إليه بحثي وأن أنشره علي الناس، ثم تصورت خطأ مرة أخرى أن هذا البحث والجهد هو الصواب و أني أخدم به ديني ووطني فقمت أطرح ما أصل إليه علي الناس متصورا أني علي صواب وعلي حق فإذا بي علي خطأ وباطل، ما ظننت أني سأتهم يوما في ديني، لأني لم أطرح بديلا لهذا الدين ولكن لله في خلقه شئون.**

ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە سيد القمني لە کتێبی (الحزب الهاشمي ) پێغەمبەری (ﷺ) تۆمەتبار کردبوو بەوەی خوەیلیدی باوکی خەدیجەی هاوسەری سەرخۆش کردبوو، بۆ ئەووەی ڕازی بێت خەدیجەی لێ مارە بکات و دەیان قسەی لەو شێوەی لەکتێبەکانیدا هەیە،

سەرباری هەندێ توێژینەوەی بێ بنەما کە تێیدا درۆ و تۆمەتی زۆری دەربارەی ئیسلام هەڵبەستووە ، بەهۆی درۆکانیشیەوە دەربارەی مێژووی ئیسلام وەکو کەسێکی ساختەکار وخراپ سوود وەرگر لە سەرچاوە مێژووییەکان ناسرا.

بۆ ماوەیەکیش ڕاگەیاندنەکانی میسر سەرقاڵی بڕوانامەی دکتۆراکەی سید القمني بوون کە ساختەیەو و بەموراسەلە لە زانکۆیەکی ئەمریکی وەهمی بە دەستی هیناوە ودواجار خۆی دانی بەوەدا نا کە نەیزانیوە زانکۆی (جنوب کالیفورنیا) زانکۆیەکی وەهمیە !

بەڵام سەرەڕای کتێبەکانی کە بە ڕاشکاوی هێرش دەکانە سەر ئیسلام ، سەرباری ئەوەش کە دەرکەوت بڕوانامەی دکتۆراکەی ساختەیە وبەبڕێکی دیاریکراو ی پارە لە نوسینگەیەکی دورووستکردنی بڕوانامەی تەزویر بۆی دروستکراوە و،بە دانپێدانانی خۆیشی کاتێك بواری نکۆڵی کردنی بۆ نەما ، هەروەها پشتبەستنی ئەو بە تێکدان و گۆڕینی ڕاستیەکانی مێژوو و نەبوونی ئەمانەتی زانستی بە شایەتی زۆرێك لە نووسەران وتوێژەرانی میسر ، وەزارەتی ڕۆشنبیری لە میسر لەساڵی ٢٠٠٩ز ڕێزی لێگرت و (جائزة الدولة التقديرية)ی پێ بەخشی ، کە ئەمەش بووە مایەی ناڕەزایی هەرایەکی گەورەی لیکەوتەوەو وئەزهەر بە توندی هاتە سەر هێڵ و فەتوای پاشگەز بوونەوەی سید القمني يان لە ئیسلام دەرکرد و نکۆڵیان لەوە کرد کە بێباوەڕان لە جیاتی سزادان خەڵات بکرێن ، بەیانێکی توندیشیان لە دژی وەزیری ڕۆشنبیری دەرکرد و تێیدا بە گەندەڵی تۆمەتباریان کرد، هەروەها بەهەدەردانی سامانی گشتی بەسەر هاوڕێکانی خۆیدا ، هاوکات داوا لەسەر ئەو وەزیر بەرزکرایەوە. شایانی باسە پاشگەزبوونەوەی سید القمني و وازهێنانی لە دژایەتی ئیسلام لەترسی هەڕەشەی کۆمەڵە چەکدارەکان بوو ، وەکو خۆی لە چاوپێکەوتنێکی تازەیدا لە ڕۆژنامەی النبأ لە ٥-٨-٢٠١٥ ڕایگەیاندووە ئەو هەمان بیروبۆچوونەکانی خۆی هەیە و بەڵام لەبەر هەڕەشەی قاعیدە و گروپە چەکدارەکانی تر ئەو بڵاوکراوەی دەرکردووە ،

ئەوەشی وت کە ئەوترسی لە گیانی خۆی نەبووە ،بەڵکو لەبەر کچەکانی ئەوهەڵوێستەی نواندووە.

هاوکات لە چاوپێکەوتنەیدا ڕاشیگەیاند کە عبدالفتاح السیسی میسری لەئیسلامیەکان ڕزگارکردووە .

**ئەزهەر بە توندی هاتە سەر هێڵ و فەتوای پاشگەز بوونەوەی سید القمني یان لە ئیسلام دەرکرد و نکۆڵیان لەوە کرد کە بێباوەڕان لە جیاتی سزادان خەڵات بکرێن.**

# ( ابن العلقمي )



ناوی (محمد بن أحمد بن علي العلقمي الأسدي )ه لە هۆزی  بني أسد ، لە ساڵی ٥٩٢ك لە دایکبووە ، شیعە بووە ، وەزیری خەلیفەی عەبباسی (المستعصم بالله) بووە لە کۆتایی ولاوازی حوکمی عەباسییەکاندا ، ناوبانگی بە خیانەت دەرکردووە لە مێژوودا ، چونکە ئەو ئاسانکاری بۆ سوپای هۆلاکو کرد ونامە لە گەڵیاندا گۆڕییەوە بەنهێنی تاکو بەغدا داگیر بکەن ، ڕۆڵی ابن العلقمي لە ڕوخاندنی خیلافەت و داگیرکردنی بەغدا لە لایەن سوپای هۆلاکۆ بە سێ قۆناغدا تێپەڕی:

١- سوپای خیلافەتی ئیسلامی لاوازکرد بە کەم کردنەوەی خەرجی سەربازەکان وکەمکردنەوەی خەرجیەکانی کاروباری جیهاد لەو سەردەمە بە گشتی ، چونکە ئەو وەکو وەزیرێك ڕۆڵی گەورەی لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا هەبوو.

بە تایبەتی کە خەلیفە المستعصم بالله زۆر کەسایەتیەکی لاوازی هەبوو ، لەو بارەوە ابن کثیرلە البدایة والنهایة٢٣٥/١٣دا دەڵێت:"**وكان الوزير ابن العلقمي يجتهد في صرف الجيوش، وإسقاط اسمهم من الديوان، فكانت العساكر في آخر أيام المستنصر قريبًا من مائة ألف مقاتل، فلم يزل يجتهد في تقليلهم، إلى أن لم يبق سوى عشرة آلاف"**

٢- نامەنووسین بۆ تەتارەکان: ئەمە قۆناغی دووەم بوو لە خیانەتەکەی ، کاتێك نامەی بۆ سوپای تەتارەکان نووسی و زانیاری تەواوی بۆ ناردن ودەستی لە گەڵ تیکەڵ کردن ،ابن کثیر لەم بارەوە لە هەمان سەرچاوەی سەرەوە دەڵێت: **"ثم كاتب التتار، وأطمعهم في أخذ البلاد، وسهَّل عليهم ذلك، وحكى لهم حقيقة الحال، وكشف لهم ضعف الرجال."**

٣- ورەی خەڵکی و خەلیفەی دابەزاند و پاشگەزی کردەوە لەبەرگریکردنی سوپای هۆلاکۆ ، لەم بارەوە ابن تیمیة لە منهاج السنة النبوية ١٥٥/٥. دەڵێت: "**وكان وزير الخليفة ببغداد الذي يقال له ابن العلقمي منهم -أي من الر افضة- فلم يزل يمكر بالخليفة والمسلمين ويسعى في قطع أرزاق عسكر المسلمين وضعفهم، وينهى العامة عن قتالهم -أي التتار- ويكيد أنواعًا من الكيد".**

دواتر داوای لە خەلیفە کرد دەرچێت بۆ بینینی هۆلاکۆ و ئەویش لەگەڵ زۆرێك لە سەرکردە و پیاوانی دەوڵەت دەرچوون وبەم شێوەش هەموویان کوژران.

دوای کوشتنی خەلیفە هێزێك لەسوپای تەتار کتیبخانەی بە غدایان هەمووی فرەدایە نێو ڕوباری دیجلە و ڕەنگی روبارەکە هەمووی بە ڕەمگی مەرەکەب گۆڕی ، کە لەوکاتە کتیبخانەی بەغدا گەورەترین کتیبخانەی جیهان بوو ،

ئینجا پاش ئەوەی قەتڵ و عامێکی گەورەیان لە نێو موسوڵمانانی بەغدا ئەنجامدا ، نەخۆشی تاعون بڵاوبوویەوە بە هۆی ئەو هەموولاشەی لە ناوجادەو کۆڵان وگەڕەکەکاندا کەوتبوو ، بۆیە سوپای تەتارەکان لە بەغدا دەرچوون و ابن العلقمی بە فەرمانی هۆلاکۆ کرا بە فەرمانڕەوای بەغدا لە ژێر سەرپەرشتی کەسێك لە تەتارەکان.

بەڵام ابن العلقمي وەکو مێژوو نووسان دەگێڕنەوە ، هیچ خۆشییەکی لە حوکمڕانی بەغدا نەبینی و لە لایەن سەربازە بچووکەکانی تەتارەوە -نەك هۆلاکۆ خۆیشی - سوکایەتی پێ ئەکرا و بە هیچ شێوەیەك جێگای ڕیز نەبوو لە لای داگیرکەران ، دەربارەی بێڕێزی ابن العلقمي لە لای ئەوانەی خیانەتی بۆ کردن، السبكي لە طبقات الشافعية الكبرى ١٥٩/٨. دەڵێت : "**وأما الوزير-أي ابن العلقمي- فإنه لم يحصل على ما أمَّل وصارعندهم أخس من الذُّباب، وندم حيث لا ينفعه الندم، ويحكي أنه طُلِب منه يومًا شعير، فركب الفرس بنفسه ومضى ليُحصِّله لهم، وهذا يشتمه وهذا يأخذه بيده، وهذا يصفعه بعد أن كانت السلاطين تأتي فتُقبِّل عتبة داره، والعساكر تمشي في خدمته حيث سار من ليله ونهاره.**

**وإذا بامرأة تراه من طاقٍ، فقالت له: (يا ابن العلقمي، هكذا كنت تركب في أيام أمير المؤمنين)! فخجل وسكت، وقد مات غَبنًا بعد أشهر يسيرة، ومضى إلى دار مقبره ووجد ما عمل حاضرًا.** "

دوای چەند مانگێکیش لە هاتنی تەتارەکان و لە ساڵی ٦٥٦ك ابن العلقمي مرد و هیچ سوودێکی لە خیانەتەکەی نەبینی و بوو بە پێشەنگی هەموو خیانەتکارانی مێژوو بە شێوەیەك هەر کاتێ: باسی خیانەت بکرێت ئەو باسی دێتە پێشەوە.

شایانی باسە یەکێك لە هۆکارەکانی خیانەتی ابن العلقمي ئەو شەڕ وململانێیە بوو لە نێوان سوننە و شیعە لە بەغدا کە ماوەیەك پێش هێرشەکەی هۆلاکو شیعەکان لە کەرخ زیانێکی زۆریان لە ڕێگەی سوننەکانەوە بەرکەوتبوو، چونکە زۆر جار جەنگ لە نێوانیاندا بەردەوام بوو ،ئیتر ئەویش بەو شێوە تۆڵەی لێکردنەوە.

هەروەها شایانی ئاماژە بۆ کردنە کە شیعە وجولەکەکان نەبێت کەس لە چنگی مەرگی ئەو سوپا دڕەندەیە ڕزگاری نەبوو.

بۆ زانیاری زیاتر جگە لەو سەرچاوانەی سەرەوە ئاماژەی پێکراوە بڕوانە:- - -

سایتی قصة الاسلام راغب السرجاني.

- سایتی ویکبیدیا..

# ( محمد سليم العوا )



نووسەر و توێژەور و بیرمەندێکی ئیسلامیە، لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٢زلەئیسکەندەرییە لە میسر پێشتر ئەمینداری گشتی (الإتحاد العالمي لعلماء المسلمين) بووە ، ئەندامی دامەزرێنەری (الفريق العربي للحوار الإسلامي المسيحي) ،لەساڵی ٢٠١٢زخۆی بۆ سەرۆکایەتی میسر پاڵاوت ، یەکێکە لەوانەی بانگەشەی نزیکبوونەوەی شیعەوسوننە دەکەن ،لەسەرانی قوتابخانەی عەقلانیە کە پێی وایە دەقەکان دەبێت بخرێنە ژێر رکێفی عەقڵەوە ،نووسین وتوێژینەوەی زۆری هەیە لەبواری فیکرویاسا.

محمد سليم العوا بە ئیسلامییەکی چەپ پۆلین دەکرێت ، هەر لەو ڕوانگەشەوە چەندین بیروبۆچوونی نەگونجاوی لەگەڵ مەنهەجی قورئان وسوننەت و ڕەوتی تێگەیشتنی پێشەوایانی ئیسلامدا هەیە ، لەوانە:

-سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەکاتە دوو بەشەوە: سوننەتی تەشریعی و نا تەشریعی ، پێیشی وایە زۆربەی فەرموودەکان لەجۆری دووەمن و موسوڵمان ناچار نییە کاری پێ بکات ،بەڵگەش بەفەرموودەی (تأبير النخل ) دەهێنێتەوە ، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

**(إنما أنا بشر إذا أمرتكم بشيء من دينكم فخذوا به، وإذا أمرتكم بشيء من رأيي فإنما أنا بشر)**.دەڵێت تەنها ئەم فەرموودە بەسە بۆ کارنەکردن بە زۆربەی فەرموودەکان.

- زۆر جار بەرگری لە بیرۆبۆچوونی شیعەکان دەکات و تەنانەت کە پێی وترا یوسف القرضاوی مامۆستات لەم دواییەدا بە ڕاشکاوی قسەی بە شیعە کردووەو تۆمەتباری کردوون بە لەعنەت کردن لە هاوەڵان و بیروباوەڕیان دەربارەی قورئان کە گوایە دەستکاری کراەی ،هەروەها لە قەرزاوی پرسیار کرا ئایا حسن نصر الله یش هەر وەکو شیعەکانی ترە؟ وتی: بەڵێ وەکو ئەوانە : **"لا بل مثلهم تماما متعصبا لمذهبه وبدعته ..... وكل شئ عنده يا علي يا حسين يا حسين"** لەو بارەوە محمد سليم العوا پۆزشی بۆ دکتۆر قەرزاوی هێنایەوەو وتی: لێدوانەکانی قەرزاوی دەربارەی شیعەو حسن نصر الله بریتیە لە "سبق لسان" واتە بە زمانیدا هاتووەو مەبەستی ئەو قسانە نەبووە!

- پێی وایە حوکمی شەرعی لە گەڵ بەرژەوەندیدایە ، ئەگەر بەرژەوەندی هەبوو جێبەجێ دەکرێت ئەگەر نا کار بە فەرموودە ناکرێت. نموونەی هێشتنەوەی ڕیش دەهێنێتەوە کە ئەو کات بەرژەوەندییەکی شەرعی تێدا بووە ئێستا هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا نەماوە!

-دەڵێت سزای ئارەق خواردن لە ئیسلامدا بۆ گێڕاندنەوەی کەسەکەیە لە ئارەق خواردن جا بە هەر ڕێگایەکی تر بکرێت سزا بدرێت ئاساییە!

-دەربارەی سزای مورتەد بە هەمان شێوە دەڵێت دەکرێت بە هەر سزایەکی تر بگۆڕدرێت وەکو زیندانی کردن لە سێدارەدانیشی لەگەڵ بێت.

-العوا دەڵێت: "**المساواة بين الناس أصلها بالخلقة وليس بالدين**" واتە: خەڵکی هەموویان یەکسانن وجیاوازییەکیان نییە.

-لە کتێبی "الأقباط والإسلام" هاتووە کە مەسیحییەکان بە برای خۆی دەزانێت و،جزیەیان لەسەر نییە، و میسرییەکان هەموویان بە موسوڵمان ونەسرانییەو بران و جیاوازیان نییە .لە چاوپێکەوتنیکیشیدا وتی: "الإسلام والنصرانية يسيران في خطين متوازيين"

- دەربارەی ئافرەت دەڵێت دەتوانێت هەر ئیش و کارێك بکات و ئاساییە ببێتە سەروکی وڵاتیش، و دەڵیت من لەسەر ڕێرەوی هەردوو مامۆستاکەمم شێخ محمد الغزالي و شێخ یوسف القرضاوي سەبارەت بە ئافرەت.

-لە ٨-٦-٢٠١٠ لە کەناڵی بی بی سی لەو کاتەی ئەمینداری گشتی زانایانی جیهانی بوو ، بە ڕاشکاوی لە چاوپێکەوتنێکدا وتی:**لا نطالب الشيعي أن يكون سنيا،بل نريد أن يبقى السني سنيا، وأن يبقى الشيعي شيعيا، لا ذمة ولا جزية هذه مفاهيم عفا عليها الزمن، الخلافة هذا المصطلح من اختراع الصحابة.**

-بۆ کێشەی موسوڵمانان لەم سەردەمە باشترین چارەسەر لە دیموکراتیەتدا دەبینێ.ئەمەی لە زۆر نووسینەکانیدا باس کردووە ، وەکو: "العرب والشورى بعد أزمة الخليج" (ص٦٨-٦٩).

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

- نظرات شرعية فی فكر منحرف/ سليمان الخراشي.

- من هو محمد سليم العوا/ ملتقى أهل الحديث.

- موسوعة ويكبيديا/ محمد سليم العوا.

**محمد سليم العوا**

**بە ئیسلامییەکی چەپ پۆلین دەکرێت.**

# ( محمود درويش )



شاعیرێکی فەلەستینی بە ناوبانگە ، لە دایکبووی ساڵی ١٩٤١ز ، لەسەرانی ڕەوتی مۆدیرنیستەکانە لە شیعرو ئەدەبی عەربی هاوچەرخدا ، لە سەرەتای لاوی پەیوەندی بە (الحزب الشيوعي الإسرائيلي راكاح) کرد و لە بواری ڕۆژنامەگری کاری دەکرد ، بەڵام لە دوای شەستەکانەوە چەند جارێك لە لایەن ئیسرائیلەوە دەستگیر کرا و دواتر ڕۆیشت بۆ یەکێتی سۆڤیەت و ئینجا گەڕایەوە بۆ قاهیرەو لەوێ پەیوەندی بە (منظمة التحرير الفلسطينية) کرد و ئیدی بە شاعیری کێشەی فەلەستینی ناسرا.

محمود درويش خاوەن ڕێڕەوێکی مارکسی بوو لە بیرکردنەوەدا کە لە هەموو شیعرەکانیدا ڕەنگی دابویەوە ، هەروەکو خۆی دەڵێت: (أنا من أمة عزلاء منسية ، وكل رجالها فى الحقل و المحجر يحبون الشيوعية) ،

بەڵام زۆر جار دەزگاكانی ڕاگەیاندن سوكایەتیە ئاشكراكانی بە ئایین ناخەنە ڕوو ، هەر بۆیە دەبینین هەندێ لە بەناو ڕۆشنبیرە ئیسلامیەكان لە بێ ئاگایی خۆیان شیعری محمود درویش وەكو بەڵگە لەسەر هەندێ بابەتی نیشتیمانی و بابەتی تر دەهیننەوە.

محمود درویش دوژمنێكی سەرسەختی ئیسلام بوو ، بە بۆنەو بە بێ بۆنە جنێوی بە خوا پاشان پێغەمبەران و هەموو پیرۆزییەكان دەدا ، هەر بۆیە لە ناوەندە عەلمانی و سیاسیەكانی دونیا تاكو مردنی و پاش مردنیشی گەورە كرایەوەو وەكو سونبولێكی مەزنی شیعری سەردەم ناسێنرا ، هەموو حكومەتە عەلمانییەكانی جیهان هەمیشە هۆنرایەكی هەڵئەبژێرن لە مەنهەجەكانی پەروەردەو فێركردندا و بەشاعیرێكی نیشتمان پەروەر دەیناسێنن ، لە كاتێكدا هەموو دیوانەكانی ئەو شاعیرە پڕن لە بیرۆكەی بێ باوەڕی و ڕێزنەگرتن وبەڵكو سوكایەتی كردنی بەردەوام بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام كە هاوكات ئایینی فەلەستینیەكانە كە خۆی بە شاعیری ئەوان دەزانی.

محمود درویش - بە شێوەیەك لە شێوەكان - لە هەموو دیوانەكانیدا سوكایەتی بە پیرۆزییەكانی ئیسلام كردووە ، لە وانە دیوانی: **عاشق من فلسطين، آخر الليل، حبيبتي تنهض من نومها، أحد عشر كوكباً، العصافير تموت في الجليل**....هتد.

بۆ نمونە: لە دیوانەكەیدا كە دار العودة چاپی كردووەو زۆربەی كۆمەڵە شیعری ودیوانە بچوكەكانی تێدایە دەڵێت:

-**إنا خُلقنا غلطة في غفلة من الزمان**. لاپەڕە:٤٢

-خريف جديد لامرأة النار: كوني كما خلقتك الأساطيروالشهوات، كوني ملائكتي أو خطيئة.لاپەڕە ٤٥١.

-لە قەسیدەی «سرحان يشرب القهوة في الكافتيريا» دەڵێت: وسرحان يرسم شكلا ويحذفه: طائرات ورب قديم.لاپەڕە ٤٥١.

-لە قەسیدەی «مزامير» دەڵێت: نرسم القدس.. إله يتعرى فوق خط داكن الخضرة.لاپەڕە ٣٩٨.

-لە قەسیدەی «موت آخر وأحبك» دەڵێت: و أكمل هذا العناق البدائي، أصعد هذا الإله الصغير.. يسد طريقي إلى شفتيك، فأصعد هذا الإله الصغير.لاپەڕە٥٦٢.

-لەقەسیدەی «الموت في الغابة» دەڵێت: نامي فعين الله نائمة عنا وأسراب الشحارير. لاپەڕە٢٤.

- لە قەسیدەی «آه عبدالله»دەڵێت: إن هذا اللحن لغم في الأساطير التي نعبدها. قال عبد الله: جسمي كلمات، ودوي، هكذا الدنيا، و أنت الآن يا جلاد أقوى ولد الله.. وكان الشرطي...لاپەڕە٢٥٦.

-لە قەسیدەی «إلهي لماذا تخليت عني؟» کە شێوەیەکی هیستیری لەسەر زاری ئافرەتێکەوە کوفر دەکات و دەڵێت: «إلهي إلهي، لماذا تخليت عني، لماذا تزوجت مريم؟ لماذا وعدت الجنود بكرمي الوحيد، لماذا؟ أنا الأرملة... أطلقتني؟ أم ذهبت لتشفي سواي، عدوي من المقصلة، أمن حق من هي مثلي أن تطلب الله زوجا وأن تسأله، إلهي إلهي... لماذا تخليت عني، لماذا تزوجتني يا إلهي، لماذا... لماذا تزوجت مريم؟»لاپەڕە٨١.

-هەروەها لە قەسیدەی (أبي) دەڵێت: «**غض طرفا عن القمر، و انحنى يحضن التراب، وصلى، لسماء بلا مطر، ونهاني عن السفر!... و أبي قال مرة حين صلى على حجر: غض طرفا عن القمر، واحذر البحر، والسفر! يوم كان الإله يجلد عبده، قلت: يا ناس! نكفر، فروى لي أبي، وطأطأ زنده: في حوار مع العذاب، كان أيوب يشكر خالق الدود، والسحاب، خلق الجرح لي أنا لا لميت، ولا صنم**»لاپەڕە ١٤٤-١٤٥.

- هەروەها لە دیوانەدا دەڵێت: «**أقل احتفالا على شاشة السينما، فخذوا وقتكم لكي تقتلوا الله...** لاپەڕە ٤٢-٤٣.

-لە قەسیدەی (الصلاة) دا دەڵێت: **في الدنيا مصيرنا، فلماذا تتحادى على العذاب والشقاء السؤال الذي يغير علينا أقضيته بقبلة لا تراه من أنا؟ كافر بكل صيام مدمن...مدمن بكل قواه حب عمري..يأكل مطلب عمري إنني شاعر و أنت إله**...لاپەڕە٥٧ لە دیوانی أوراق الزيتون.

واتاکانم وەرنەگێڕا لەبەر ئەوەی ئەستەمە موسوڵمانێك بتوانێ ئەو کوفرانەی بە خوای پەروەردگار وەربگێڕێت، ئەمە هەندێکی کەم بوو لە هۆنراوەکانی دەربارەی خوای گەورە ، بەڵام ئەگەر بچینە سەر سوکایەتی کردنی بە پێغەمبەران و فریشتە و نوێژ و عیبادەتەکان و ڕۆژی دوایی ئەوە زۆر دەکێشێت و کەسێك بیەوێت دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کتێبی (الإنحراف العقدي في أدب الحداثة وفكرها) ی د.ناصر الغامدیی ان کتێبی:(الحداثة في ميزان الإسلام)ی عوض القرني ، یان هەر دیوانەکانی شاعیر لە چاپي دار العودة و زۆر کتێبی تر هەیە لەو بارەوە.

محمود درویش لە ساڵی ٢٠٠٨ز لە ئەمریکا و پاش نەشتەرگەرییەکی دڵ تووشی لە هۆش چوون و غەیبوبەیەکی درێژخایەن بوو ، بۆیە پزیشکەکان بە پێی ڕاسپاردەی شاعیر خۆی ئامێرەکانی بووژانەوەیان لێ کردەوە و بەو شێوە ژیانی کۆتایی پێهات و ڕووبەڕووی تاڵیی مەرگ بوویەوە ، کە ماوەیەك پێش مردنی لە چاوپێکەوتنێکدا مردنی بە ترسنۆك و جەبان وەسف دەکرد و گاڵتەی پێدەکرد وبێ باکی نیشان دەدا لێی.

**محمود درویش - بە شێوەیەك لە شێوەکان - لە هەموو دیوانەکانیدا سوکایەتی بە پیرۆزییەکانی ئیسلام کردووە ،**

# ( ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان )



(منظمة الأمم المتحدة ) ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیە لە ساڵی ١٩٤٥ز لە سان فرەنسیسکۆ لە ئەمریکا دامەزرا ، زۆربەی وڵاتەکانی دونیا تێیدا ئەندامن ، لە پێش دامەزرانی ئەم ڕێکخراوە نیودەوڵەتیە لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٩ بۆ ساڵی ١٩٤٥ز دامەزراوەیەکی تر هەبو لە جێگەی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ناوی: (عصبة الأمم) بەڵام ئەو دامەزراوە سەرکەوتوو نەبوو لە کارەکانیدا بە تایبەتی دوای هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم ، ژمارەی دەوڵەتەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە دوای دابەش بوونی سودان گەیشتە ١٩٣ وڵات. چەندین وڵاتی ئیسلامی ئەندامی دامەزرینەرن لەو ڕێکخراوە نێو دەوڵەتییە.

ڕێکخراوەکە بە گشتی لە شەش دەزگا پێکهاتووە: **الجمعية العامة، مجلس الأمن مجلس الوصاية ، الأمانة العامة، محكمة العدل الدولية ،المجلس الاقتصادي والاجتماعي للأمم المتحدة.**

شایانی باسە نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر کۆمەڵێك یاسا و بنەما دامەزراوە کە بە هیچ شێوەیەك ڕێز لە ئایینی ئیسلام و پیرۆزییەکانی ناگرێت ، سەرەڕای ئەندامێتی هەموو ئەو دەوڵەتانەی خۆیان بە موسوڵمان دەزانن تێیدا.

-بە پاساوی دژایەتیکردنی ئیرهاب و توندڕەوی ئیسلامی هەموو موسوڵمانان بوون بە ئامانجێکی ڕەوا بۆ لێدانیان و ستەم لێکردنیان لەسەر تاسەری جیهاندا ، لەم بارەشەوە دەوڵەتە ئیسلامیەکان داکۆکیکەری یەکەم بون بۆ کاراکردنی ئەم پاساوە بۆ قەڵاچۆکردنی ئیسلام وەکو سیستم و یاسا بۆ ژیان.

-دیارترین ئەو بوارانەی کە دژایەتی ڕاشکاوی تێدایە بۆ ئیسلام ، بریتین لەو یاسا و ڕێککەوتنامانەی کە پەیوەندیان هەیە بە ئاشتی نێودەوڵەتی و مافی ئافرەتان و ئازادی تاکە کەسی وزۆر بنەمای تر کە نەك هەر ڕێگە بە بەزاندنی هەموو هێڵە سوورەکانی ئیسلام دەدات بەڵکو سزای توندیش بۆ ئەو کەسە دیاری دەکات لە ڕێگەی جێبەجێکردنی ئەو یاساو بنەما و ڕێککەوتنانە ڕاوەستێت: لەوانە ئازادی ئایین گۆڕین و ،ئازادی ستەمکردن لە لایەن وڵاتە زلهێزەکان و پاراستنیان بە مافی ڤیتۆ ، ئازادی زینا کردن و هاوڕەگەزبازی و هەموو بەدڕەوشتیەك لە کۆمەڵگاکان و بەرگری کردن لە ئەنجامدەرانی و ، فەراهەمکردنی هەموو یاسایەك کە ڕەوشتی گەلان تێکبدات.

نەتەوە یەکگرتووەکان گەورەترین سەرپەرشتیای ستەمە لە جیهاندا ، ئەگەر بێت و تەماشای دروشمەکانی ئەو ڕێکخراوە بکەین زۆر وتەی جوان و بریقەداری تێدایە ،

بەڵام ئەو دروشمانە درۆیەکی گەورەن بۆ فریودانی گەلان ، چونکە مافی ڤیتۆ کە دراوە بە زلهێزەکان ، ئەو بەندەی لە ڕێکەوتنامەکە سەر لەبەر پوچەڵ کردووەتەوە ، وەکو دەڵێن نەتەوە یەکگرتووەکان بە دەستی ڕاست مافی مرۆڤ دەدات و بە دەستی چەپ وەریدەگرێتەوە لە ڕێگەی ڤیتۆ و ئامرازەکانی ترەوە.

-نمونەی ئەوەی کە ڕووی دا لە صبرا و شاتیلا لە لوبنان ، ڕووداوەکانی فەلەستین بە گشتی و کوشتارگەکانی کەرتی غەززە بە تایبەتی کە بریتی بوو لە جینۆساید کردنی موسوڵمانان تەنها لەبەر ئەوەی موسوڵمانن ! کوشتارگەکانی بۆرما بۆ موسوڵمانان لە سەر دەستی بوزییەکان ، لە نێوبردنی سەدان هەزار لە موسوڵمانی بۆسنەو هرسك کە دیمەنە جەرگبڕەکانی سەرتاسەری جیهانی هەژاند ، کارەساتی موسوڵمانان لە تەیموری ڕۆژهەڵات ،کارەساتی موسوڵمانان لە ئیفریقیا لەسەر دەستی گاورەکان ، ...هتد شایەتن لەسەر ڕازیبوون و بێ دەنگی ئەم ڕێکخراوە لەسەر هەڵوێستی ستەمکارانەی وڵاتە زلهێزەکان.

- دەست بەسەرا گرتنی جوڵەکە بەسەر ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا ، کە ئەمەش ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە دوای جەنگی جیهانی دووەم ئەم ڕێکخراوە وەکو دیارییەك پێشکەشی ئەوان کرا.

-نمونەیەکی بەرچاو: تاکو ئێستا شەست جار ڤیتۆ بە کارهاتووە لە دژی تاوان بارکردنی ئیسرائیل

سەبارەت بەو قەتڵ و عامەی بە خەلکی فەلەستینی دەکات لە غەززە و پێش تر لە ناوچەکانی تری فەلەستین، و کەس نەیتوانیوە دەست بهێنیتە ڕێگەیان بۆ کوشتن و لەناو بردنی ئەو فەلەستینیانەی کە تاوانی یەکەمیان ئەوەیە موسوڵمانن!

-سەبارەت بە مافی مرۆڤ بە گشتی ئەو ڕێکەوتننامە کە لە ڕاستیدا هەر وەکو ڕاسپاردەیەکە تا ئەوەی ڕێککەوتنامە بیت شەرمەزارییە بۆ مێژووی مرۆڤایەتی و ڕاسترە ناوی بنەین خەجاڵەت نامە چونکە هەرچی ئەم ستەمە بێ سنورەی لەسەر زەویدا دەکرێت لە گەڵ هەبوونی جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ و بە پیرۆزبایی وڵاتە زلهێزەکانی دونیا دەکرێت.

- سەبارەت بە ڕێککەوتنامەی ئەو ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیە بە مافی ئافرەتان زیاتر نییە لە ڕێگەدانێکی ڕەها بۆ بڵاوکردنەوەی بەدڕەوشتی بە سەرتاسەری جیهاندا ، وەکو مافی زیناکردن و هاوڕەگەزبازی ومافی لەناو بردنی کۆرپەڵەی درووست بوو لە ئەنجامی پەیوەندی ناشەرعی و دەستەبەرکردنی پێویستیەکانی لەناوبردنی کۆرپەلە (الإجهاض)و هاوکات دابینکردنی هەموو بەرگرییەك لە ئەنجامدەرانی و سزادنی کەسانی ناڕازی بەرانبەریان.

ئەمە چەند دێڕێکی خێرا بوو سەبارەت بەم چەترە ڕەشەی زلهێزە ستەمکارەکان هەڵیانداوە بەسەر جیهاندا و چەمکەکانیان ئاوەژوو کردووەتەوە وستەم بەبەرچاوی ملیونەها خەڵکەوە لە گەلان دەکەن ، لە ڕێگەی ڤیتۆی بەدناوەوە ئەم جیهانەیان گەڕاندووتەوە بۆ سەردەمی جەنگڵستانی نادادگەری و ستەمی بێ سنوور لە مێژوودا.

# ( الڤاتيكان )



بچووکترین دەوڵەتە لە جیهاندا ، ڕووبەرەکەی ٠,٤٤ کم و دانیشتوانی دەوری ٨٠٠ کەسن ، ڕابەرایەتی زیاتر لە ملیارێك مەسیحی کاسۆلۆکی لە جیهاندا دەکات لە ڕێگەی پاپا کە لەوێ نیشتەجێیە وبەجێگری مەسیح دادەنرێت ، ڤاتیکان ئەگەرچی مێژوویەکی دێرینی هەیە بەڵام بەم شێوازەی ئێستا لە ٧ ی حوزەیران ی ساڵی ١٩٢٩ز ڕاگەیەندراوە وەکو دەوڵەتێکیسەربەخۆ لەنێو شاری ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیا.

ڤاتیکان بە سەرکردایەتی پاپا میراتگری مێژوویەکی ڕەشی خاچ پەرستانەیە کە سەرجەم مرۆڤایەتی بەرانبەری شەرمەزارن ، چونکە لە هەموو سەردەم وچەرخەکاندا کڵێسا سەرپەرشتی خوێن ڕشتنی نەیارانی کردووە و بە ئەوپەڕی دڕەندەییەوە شەڕە ئایینیەکانی کردووە.

سەرەتا لە سۆنگەی ئەوەی کە خودی ئینجیل تێکدرا وە و شوێندراوە ، زۆرێك لەدەقەکانی هانی کوشتنی نەیارانی مەسیحیەکان دەدات ، وەکو لە ئینجیلی لوقا ١٩:٢٧ دەڵێت: **"اما اعدائي اولئك الذين لم يريدوا ان املك عليهم فأتوا بهم الى هنا واذبحوهم قدامي"** ، یان لە ئینجیلی متی ١٠:٣٤ **"لا تظنوا اني جئت لألقي سلاما على الارض. ما جئت لألقي سلاما بل سيفا"** هەر بۆیە هەر لە یەکەم جارەوە کە دولەتی ڕۆمانی لە ساڵی ٣١٥دوای لە دایکبوون دەسەڵاتیان گرتە دەست هەڵسان بە لە ناوبردنی بتپەرستەکان و نەیارەکانی تریان و پەرستگاکانیان ڕوخاندن، لە ماوەی دەسەڵاتیاندا بە ناوی مەسیحیەتەوە کوشتارگەی گەورەیان بۆ خەڵکی ئەنجامداوە.

-یەکێك لە گەوەر سەرکردەکانی مەسیحیەت لە مێژووداەڵێت: **إذا لم يتب غير المؤمن فمن واجب الكنيسة ومهمتها أن تنقذ الأمة -يقصد المسيحية- وأن تطرد هذا الهرطقي من العالم بقتله** (توما الإكويني ١٢٦٧م).

-لە ساڵی ٧٨٢ ئیمپراتۆر کارل شارلمان فەرمانی کرد بە سەربڕینی ٤٥٠٠ کەس لەبەر ئەوەی رازی نەبوون ببنە مەسیحی.

-لە ساڵی ١٢٣٤ کەنیسە باجێکی زۆری خستە سەر جوتیارەکانی ناوچەی ستیدینج لە ئەڵمانیا ، ئەوانیش کە نەیانتوانی ئەوباجە بدەن دەوری یانزە هەزار کەسیان لێ سەربڕا کە ژن و مناڵی لێ بەدەر نەبوو.

-لە سەدەی پانزەیەم و بە فەرمانی کەنیسە هەژدە هەزار گوند تاڵان کرا کە ژمارەی قوربانیانی دیار نییە چەند بووە.

-لە سەدەی شانزە وحەڤدەی میلادی ، سوپای ئینگلیز هێرشیان کردە سەر ئێرلەندییەکان بۆ ئەوەی خوایان پێ بناسێنن ! چونکە پێیان وابوو ئەوان نەفام ودرەندەن بۆیە سەرکردەکەیان همفري جلبرت فەرمانی کردبە سەربڕینان و دەیان هەزاریان لێکوشتن و مەبەستیشیان ناساندنیان بوو بە خوا وڕەوشتی جوانی ئینجیل!

-لە ساڵانی (١٤٨٤-١٧٥٠) هەزاران جادوبازیان سوتاند و لە سێدارەدا کە زۆربەیان ئافرەت بوون.

-لەنێوان ساڵەکانی (١٠٩٥-١٢٩١) زنجیرەیەك لەو جەنگانەی بە (الحروب الصليبية) دەناسرێت ئەنجامدرا کە سەدان هەزار خەڵکیان بە ناو بلاوکردنەوەی مەسیحیەت و کوشتنی نەیارەکانیان ئەنجام دا کە مەگەر لەکتێبێکی سەربەخۆدا وردەکاری ئەو قەتڵ و عامانە باس بکرێت.

-بە دریژایی مێژوو ئەوان هەمیشە لە جەنگی دوور لە ڕەوشتدا بوونە و ، پاپاکان بە خۆیان سەرپەرشتی کوشتارگەکانیان کردووە ،بۆنموونە: لەساڵی ١٢٠٩ و بەسەرکردایەتی پاپا ئەنوسنت ی سێیەم: (کە تا دەرکەوتنی نازییەکان بە گەورەترین تاوانباری جەنگ دێتە ئەژمار) شاری بیزیرس ی لە فەرەنسا وێرانکرد و هەموو دانیشتوانەکەی سەربڕی کە ژمارەکەیان نزیکەی حەفتا هەزار دەبوون تەنانەت هەموو ئەوکاسۆلیکانەش کە ڕازی نەبوون دراوسێ و هاوڕێکانیان لە جولەکەو مەسیحیەکانی تر بدەن بە دەستەوە سەر بڕدران.

-ئەگەر باسی (محاكم التفتيش ) بکەین کە پاپا دایمەزراند بۆ لیپرسینەوە لە گەڵ نەیارانی کاسۆلیکەکاندا وبە تایبەتی موسوڵمانان ئەوە چەندین کتێبی پێویستە بۆ ئەوەی مێژوویەکی رەش لەکوشتنی موسوڵمانان لە ئەندەلوس بگێڕێنەوە کە مێژووی مرۆڤایەتی هەرگیز تاوانی لەو جۆرەی بە خۆیەوە نەبینیوە.

-ئەگەر باسی کوشتنی زانا وگەردوونناس وفەیلەسوفەکان بکەین بە فەرمانی کەنیسە هەرگیز بە ئاسانی کۆتایی نایەت!

سەدەکانی هەژدە و نۆزدە بە تایبەت پر بوون لە زۆرو ستەمی کەنیسە و هەموو خەڵکی بە دەستی وەحشیەتی ئەوانەوە دەیانناڵاند و لە کۆتاییدا ئەوە بوو هەڵگەڕانەوە سەر کەنیسە و دروشمی (دوا پاشا هەڵواسن بە ڕیخۆڵەی دوا قەشە ) یان بەرزکردەوە.

-لەسەدەی بیستەم و تاکو ئێستاش بە هەندێ جیاوازییەوە تاوانەکانی کەنیسە بەرانبەر بە ئاییەنەکانی تر و بە تایبەت موسوڵمانان کۆتایی نەهاتووە وهەوڵ ئەدەین بە نووسینێکی سەر بەخۆ باسی بکەین.

ئەم نموونانەی باسمان کردهەمووی بەروبوومی کەنیسەی مەسیحی وبە تایبەت کاسۆلیکی بوو کە ڤاتیکان سەرپەرشتی کردووە لە مێژوودا ، یان دەزگای تر بووە کە ڤاتیکان درێژەپێدانی ئەوانە.

ڤاتیكان بە فەرمی لە لایەن (محكمة العدل الدولية)لە لاهای لە بەرواری ٤ی ئاب ٢٠١٣م.بە قەوارەیەكی تاوانباری نێودەوڵەتی ناسێندرا: «الفاتيكان كيان إجرامي دولي» بە هۆی ئەو مێژووە ڕەشەی لە كوشتنی گەلاندا هەیانە.

سەرچاوەكان: كتێبی الاسلام والعالم ، سایتی وێكبیدیا ، الفاتيكان وجرائمه ضدالإنسانية..

**ڤاتیكان بە سەركردایەتی پاپا میراتگری مێژوویەكی ڕەشی خاچ پەرستانەیە كە سەرجەم مرۆڤایەتی بەرانبەری شەرمەزارن ،**

# ( علي منصور كيالي )



ئەندازیارێکی سوریە لە حەلەب لە ساڵی ١٩٥٢ لە دایکبووە ،پسپۆڕە لە بواری ئەندازیاری و فیزیاو ماتماتیك ، لەم چەند ساڵەی دواییدا ناوبانگی پەیدا کرد لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێك بیروبۆچوونی نامۆ لە گەڵ بیروباوەڕی ئیسلام و بە ناوی ئیسلامەوە ، بەبەهانەی ڕاڤەکردنی دەقەکانی قورئانی پیرۆز لە ڕوناکی زانستی سەردەمدا و بێ گرنگیدان نەك بە تەنها سوننەت بە ڵکو بە قورئانیش لە ڕێگەی لێکدانەوەی سەردەمیانە بەو واتایەی کە متمانەی تەواوی بە هەموو زانستێکی تازە هەیە و هەرچی دەقەکانیش هەیە ئەگەر لە گەڵ ئەو زانستانەدا ناکۆك بن لە قەفەسی تۆمەتدان و جێگای گومانن.

ئەم ناوبراوە جیاوازی لە گەڵ قورئانی و عەقلانی و موعتەزیلە هاوچەرخەکاندا ئەوەیە بە بێ هیچ هەست بە ئیحراج بوون و شاردنەوەیەك دەقەکان ڕەتدەکاتەوەو تەفسیری قورئانیش دەخاتە ژێر دەسەڵاتی فیزیا و کیمیا و ماتماتیك ،

ئەمانەی خوارەوەش هەندێکن لە بیروبۆچوونەکانی کەیالی:

-تەفسیری قورئان بە پێی یاساکانی فیزیا دەکات ئیتر کێشەی نییە لە گەڵ تەفسیری زانیان و پێشەوایانی ئیسلام ناکۆك بێت.

- وەکو زۆربەی موعتەزیلە هاوچەرخەکان نکۆڵی لە دەرکەوتنی المسيح الدجال دەکات.هەروەها باوەڕی بە سزای ناو گۆر نییە..

-بە بە ڵگەی هەبوونی پەیکەری (أبو الهول) لە میسر لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب دا (ڕەزای خوای لێبێت) بت و پەیکەر بە حەرام نازانێت.

-دەڵێت خوا ناخەوێت لە بەر ئەوەی گەردوون وێران نەبێت!(بۆچوونی هاوشیوەی ئەمەشی زۆرە)

- بە ڤیدیۆ و بە راشکاوی : نکۆڵی لە سزای ناو گۆڕ و يأجوج و مأجوج دەکات.

- نکۆڵی لە پردی سیرات و تەرازوو و بینینی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت دەکات.

-ڕەتکردنەوەی فەرموودە زۆر کارێکی ئاسانە بە لایەوەو بێ ئەوەی هیچ بایەخێك بۆ فەرموودەناسان و ڕاڤەکارانی فەرموودەو پێشەوایانی ئیسلام دابنێ وەکو ئەوەی خۆی لە ئەوان بە راستتر و زاناتر بزانیت.!

-بە گشتی هاوڕایە لە گەڵ موعتەزیلەکان لە بیروبۆچوونەکانیاندا.

-یەکێك لە تەفسیرەکانی بۆ نموونە تەفسیری ئایەتی (**أولم یر الذين كفروا أن السموات والأرض كانتا رتقا ففتقناهما**)..دەڵێت:

هەموو دروستکراوەکان بریتین لە گەردیلە (ذرات) گەردیلەکانیش لە ئەلکترۆن و نیوترۆن و پرۆتۆن پێکهاتوون ..ئەلکترۆنەکان لە خولگەیەکدا بە دەوری ناوکدا (نوی) دەسورێنەوە .

بۆشایی لە نیوان ئەلیکترۆکاندا هەیە هەروەها لەگەل پرۆتۆن و نیۆترۆنەکانیشدا بە هەمان شیوە هەر بۆشایی هەیە..بۆیە ئەگەر پەستانمان لەسەر ئەو بۆشاییانە درووست کرد دەکرێت هەموو گەردوون لە ناو شقارتەیەکدا جێگای بێتەوە! کەواتە تەفسیری ئایەتەکە ئەوەیە هەموو گەردوون ئەوەندە بچووك بووە و خوای گەورە دوایی بۆشاییەکانی گەڕاندووەتەوەو دووبارە گەورە بووەتەوە! زۆربەی ئەو جۆرە ئایەتانەش وا تەفسیر دەکات.

-لە تەفسیری سورەتی( الكوثر) دەڵێت: دەوڵەمەندەکان پێویستە ڕۆژانە پێنج جار ماڵ ببەخشن چونکە باسی نوێژ لە هەمان سورەتدا هاتووە!

- تەفسیرەکانی بۆ قورئان زۆر نامۆو و پڕ لە سەیر و سەمەرەن و ئەمانەی باسم کرد هەر نموونەی خێرا بوو بۆ ناساندنی.

-بەڵام ئەوەی کێشە درووست دەکات دەربارەی ئەم دکتۆرە ئەوەیە قسەکانی تێکەڵەیەکە لە قسەی حەق و ناحەق و لە ڕاستە لە چەواشەکاری بۆیە زۆر جار کاریگەری نەك لەسەر خەڵکی سادەو بەڵکو لەسەر پسپۆڕ و خەڵکی زانایش هەیە.

محمد صالح المنجد زۆرێکی لە بۆچوونەکانی بەرپەرچ داوەتەوە. بۆ زانیاری زیاتر: http://alradnet.com/من-هو-الدكتور-الفيزيائي-الفيلسوف-علي-م/

# ( جلال الدين الرومی )



ناوی (محمد بن محمد بن حسين بهاء الدين البلخي ) ه ، بەڵام ناوبانگی بە مولانا جلال الدين الرومی دەرکردووە ، لە ساڵی ١٢٠٧م- ٦٠٤ ه لە ناوچەی بلخ لە ئەفغانستان لە دایکبووەو لە ساڵی ١٢٧٣م- ٦٧٢ ه لە شاری قونیە لە تورکیا وەفاتی کردووە ، شاعیر و زانا بووە لە فیقهی مەزهەبی حەنەفی و زانستەکانی تر ،دوا قۆناغی ژیانی خۆی بۆ تەسووف یەکلا کردووەتەوەو کتێبێکی بە ناوبانگی هەیە لەو بارەوە بە ناونیشانی (المثنوي) کە بریتیە لە کۆمەڵە هۆنراوەیەك لە لای موریدەکانی بە (الکتاب المقدس) ی تصوف پێناسە دەکرێ ،هەروەها جلال الدين سەرۆکایەتی ڕێبازێکی تەریقەتەتیشی کردووە پێی دەوترێ (الطريقة المولوية).

لە تەمەنی چوار ساڵیدا لە گەڵ باوکی چوونە بەغدا و بۆ ماوەیەك لەوێ بوون و دواتر کۆچیان کرد بۆ زۆر شوێن و وڵات و دواجار بە بانگهێشتی سوڵتانی سەلاجیقەکان لە قۆنیە جێگیر بوون ، لەوێ

جلال الدين بۆ ماوەی چوار ساڵ سەرقاڵی وانەوتنەوە و کتێب نووسین بووە ، بەڵام لەدەوروبەری ساڵی ٦٢٣ کۆچی گۆڕانکارییەکی گەورە لە ژیانیدا درووست بوو ، لەو ڕۆژەوە وازی لە دونیا هێنا و دەستی کرد بە نووسینی شیعری تەسەووف و گرنگیدان بە وێرد و گوێگرتن لە مۆسیقا وەکو ڕێگایەك بۆ بە هێزکردنی لایەنی ڕوحی خۆی و گەشتنی خۆی و گەیاندانی موریدەکانی بە خوا، بەتایبەتی لە پاش کوژرانی هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستی کە سۆفییەکی بە ناوبانگە بە گومڕایی بە (الشمس التبریزی). دەناسرێ، وەرچەرخانێکی گەورە لە ژیانیدا درووست بوو ، بە جارێك لە تصوف دا - بە واتا خراپەکەی - ڕۆچوو! بەرهەمەکانی بە گشتی بریتین لە: **(الرباعيات ، ديوان الغزل ، مجلدات المثنوي الستة ، المجالس السبعة و رسائل المنبر، فيه ما فيه...)**کە بەگشتی بە فارسی نووسراون و دەربارەی تەسەووفن.

بەرهەمەکانی جلال الرومی بۆ زۆرێك لە زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراوەو لەبەر بیروباوەڕی دەربارەی کاریگەری مۆسیقا وسەما کردن ،گۆرانی بێژەکانی ئەوروپا و ئەمریکا وەکو (مادۆنا) کردوویانە بە گۆرانی.

بە ناوبانگترین و گوماناویترین کتێبەکانی بریتین لە (المثنوي) کە لایەن (محمد عبد السلام كفافي )وەرگێڕدراوەتە زمانی عەرەبی ، تێیدا بە ڕوونی دەڵێت کە ئەم کتێبەی لە لایەن خواوە بە ئیلهام بۆی هاتووە ، خۆیشی لە ڕاستیدا بە گشتی لە بەسەرهاتەکانی کتێبی (كليلة و دمنة) و بیروباوەڕەکانی بیردۆزەی (وحدة الوجود) و بیروبۆچوونەکانی الحلاج و ابن عربي و السهروردي و کەسانی هاوشێوەکانیان وەرگرتووە ،

بەڵام بە تەعبیرو هەندێ تایبەتمەندی خۆی دەیانخاتە ڕوو! جلال الدین ئەگەرچی بانگەشەی پیغەمبەرایەتی نەکرووە بەڵام وەسفی کتێبەکەی خۆی کردووە بەوەی کە **(لا يأتيه الباطل من بين يديه ولا من خلفه)** بە ڕاشکاویش دەڵێت ئیلهامەو لە لای خواوە بۆم هاتووە.

جلال الدین الرومی هەموو لادان و و گومڕایی و وتە پێچەوانەکانی ئەهلی تەسووفی لە خۆیدا بە زیاد کۆکردبوویە ، ئەوەندەی من دەربارەی ئەو شاعیرو کەسایەتیە خوێندوومەتەوە هیچ کارەساتێکی لادەرانی وەکو حلاج و ابن عربي و الشمس التبريزي والسهروردي و هاوشێوەکانیان نەبووە لەلای ئەم بە زیادەوە بوونی نەبێت:

-سوجدەی بۆ براوەو خۆیشی سوجدەی نەك بۆ موسوڵمان بەڵکو بۆ گاور و جولەکەش بردووە.

- باوەڕی بە هیچ جیاوازییەك لە نێوان ئاییەنەکاندا نەبووە ، بەڵکو کاتێك جولەکەیەك پرسیاری لێ دەکات دینەکەی من باشترە یان دینەکەی تۆ؟ پێی دەڵێت دینەکەی تۆ.

- مۆسیقا و سەماکردن و خولانەوەی موریدی بەدەورەی خۆیدا بە چاکترین ڕێگا داناوە بۆ خوا پەرستن.

-بە پاساوی جۆراجۆر سنوورەکانی ڕەوشتیشی بە ناو زیکر و فەناء و وحده الوجود و وحدة الشهود بە شێوەیەك بەزاندووە ناگونجێت لێرە شیکرێتەوە.

-لە زۆر جێگەی مەسنەوییەکەیدا جیاوازی لە نێوان خالق و مەخلوق دا ناکات ،باسی خۆشەویستی خواو عەشقی خوا بە شێوازێك دەکات هەرگیز لە گەڵ مەزنی پەروەردگار ناگونجێت.

-وەسفی خوا دەکات بە دەریا و بوونەوەر شەپۆلەکانیەتی.

-کتێبەکانی لێوان لێون لە وتەی لێڵ و واتای خراپ هەڵگر.

- جاروباریش هەندێ قسەو شیعری هەیە خەڵکی سادەی پێ دەخەڵەتێت وەکو خۆڵ لە چاوکردن دەربارەی بیروباوەڕە تێکگیراوەکانی لە گەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیدا.

-سەرباری هەموو بیروباوەڕە ناکۆکەکانی لە گەڵ بیروباوەڕی ئەهلی سوننەتدا ، کەسێکی بە کرێگرتە بووە بۆ مەغۆلەکان و وەسفی جەنگیزخانی وەکو پێغەمبەرێك کردووە ، هەندێ لە سەرکردە سەربارزییەکانی ئەوانیشی بە ئەولیا وەسف کردووە ، کاتێکیش عەلائی کوڕی لە شەڕی دژی مەغۆلەکان دەکوژرێت ئەو نوێژی لەسەر ناکات!

وەکو شاعیرێکی بە ناو بانگ و بە تواناش یەك بەیت شیعری نییە باس لە کارەساتی هاتنی مەغولەکان بکات و ئەو ڕەشە کوژییەی کردیان لە بەغدا ، ئەمە لە کاتێکدایە کە سەعدی شیرازی بە عەرەبی و فارس یش لەو بارەوە شیعری هەیە!

-هەر کام لە کتێبەکانی جلال الدين الرومي بخوێنیتەوە ئەو ڕاستیەت بۆ دەردەکەوێت کە ئەو زیندووکەرەوەو میراتگری هەموو گومڕاکانی پێش خۆی بووە لە سۆفییەکانی وەکو الحلاج و ابن عربێ و السهروردي.

ئەمانەش کە ئاماژەی بۆ دەکەم و زۆر زۆر لەوەش زیاتر لە خودی کتێبەکانیدا هاتووەو لەلای ئەو مێژووناسەش کە خۆیان بە موریدی ئەو زانیوە وەکو الأفلاکی وەکو مناقب و شانازی باس کراون و جێگای گومان نین. سەبارەت بە بۆچوونی بانگخوا ز و پیاوێکی بەڕێز وەکو (أبو الحسن الندوي) کە لە نێو کتێبی (رجال الفکر والدعوة) دا بە باشی باسی جەلالی ڕۆمی کردووە، بێگومان هەڵەیەکی گەورەی کردووە بە هەرچی پاساوێك بووبێت ، چونکە گومرایی جلال الدین الرومي و لادانەکانی لە هێڵە پانەکانی ئیسلام لەوە ئاشکراترە لەکەس شاراوە بێت نەخوازەڵا لە ئەبو حەسەنی نەدەوی ، حەیفیش بۆ ئەو پیاوەی کە (ماذا خسر العالم)ی نووسیوە کەسێکی لادەری وەکو جلال الدین بە چاکسازو بانگخواز بزانێت.

سەبارەت بە کتێبی (المثنوي) بە پشتیوانی خوای گەورە لە نووسینێکی تایبەتدا باسی دەکەم چونکە قسە زۆر هەڵدەگرێت. بەڵکو خودی جلال الدین الرومێ شایستەی ئەوەیە کتێبێکی کوردی سەربەخۆی لەسەر بنووسرێت لە وێنەی کتێبی ( أخبار جلال الدین الرومي)ی أبو الفضل القونوي بۆ ئەوەی لەسەر حەقیقەتی خۆی بناسرێت ، نەك وەکو ئەوەی هەندێك باسی دەکەن بە ناحەق و ستایشی خۆڕایی بۆ پێوانە دەکەن ،یان هیچ نەبێت ئەو کتێبەی ئاماژەم بۆ کرد بکرێتە کوردی کە بە تێروتەسەل باسی ئەو پیاوەی کردووە ،بۆ ئەوەی چیدی خەڵکی پێ فریو نەدرێت و ڕاستیەیەکەی بخرێتە ڕوو ، دوای ئەوە ئیتر هەموان ئازادن پاش دەرچوونی سپێدەی حەق شوێنی بکەون یان وەکو گومڕایەك تەماشای بکەن. لە گەڵ ڕێزم بۆ ئەو کەسە باشانەی گومانی باش بە جلال الدین ئەبەن لەبەر هەر هۆکارێك بێت ،

بەڵام هاوکات جێگای تێڕامان و سەرنجیشە ئەم پیاوە بووەتە جیگای ڕێزو و بەرگری لێکردنی هەموو ئەوانەی چاویان بە ئیسلامدا هەڵنایەت ، یان کێشەی فیکری و عەقیدیان هەیە ، تەنانەت لە ڕۆژئاوادا ئەو پەڕی بایەخ بە بەرهەمەکانی دەدرێت و گۆرانی بێژەکانی ڕاپ یش شیعرەکانی دەکەنە گۆرانی ، ئایا ئەگەر نوێنەرایەتی حەقیقەتی ئیسلامی بکردایە هیچ بایەخێکی پێدەدرا؟.

لە کۆتاییدا من نکۆڵی لەوە ناکەم جلال الدین شاعیرێکی گەورە بووە ، وتەکانی پڕ مەعنا و خۆش و کاریگەر بوونە ، هاوکات قسەی باش و گونجاویشی لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا هەیە ، بەڵام عیبرەت بەو هەموو لادان و هەڵە گەورانەیەتی کە لە ڕێبازی هەموو زانایانی ئیسلام لایداوەو پێچەوانەیان بووە لە کردارو گوفتاردا.

-بۆ نووسینی ئەم کورتە بابەتە بۆ چەندین سەرچاوە گەڕاومەتەوە ، بە تایبەتی:

الأعلام للزركلي.

أخبار جلال الدين الرومي ، أبو الفضل القونوي .

چەند بابەتێك لە سایتی (ملتقى أهل الحديث) و

سەرچاوەی تر لە ئینتەرنێت وەکو سایتی ویکبیدیا.

# ( الشمس التبريزي )



ناوی( شمس الدين التبريزي محمد بن ملك داد التبريزي ) یە ، لە تەبرێز لە ساڵی ٥٨٢ ی کۆچی بەرانبەر ١١٨٥ میلادی لە دایکبووە ، شاعیرێکی فارسیە بە قوتب و سۆفی گەورەو عارف و خاوەنی عیشقی ئیلاهی! دەناسرێت ، مامۆستای ڕۆحی و هاوڕێی گیان بە گیانی جلال الدين الرومی بووە ،کە توانی گۆڕانکارییەکی گەورە لە ژیانی جەلالدا درووست بکات لە زانایەکی ئاساییەوە بیکاتە شاعیر و سۆفیەکی خاوەن تەریقەت.

هەر لە تەمەنی دە ساڵانەوە - وەکو دەگێڕنەوە - خەونی زۆر دەبینی ،بەڵام باوکی باوەڕی پێنەدەکرد ، بۆیە ماڵی بە جێهێشت و دەڵێن هەرگیز زیاتر لە شەوێك لە جێگەیەکدا نەدەمایەوە و هەردەم جێگای دەگۆڕی ،

ئەو دەیوت لە خەونەکانیدا خواو مەلائیتەکان دەبینێ ، پارەی بۆ بژێوی خۆیشی بە لێکدانەوەی خەونەکان و خوێندنەوەی ناو لەپ بۆ خەڵکی پەیدا دەکرد ، لە لای خەڵکی بە دێوانەو شێت دەناسرا.

لە گەشتە بەردەوامەکانیدا گەیشتە شاری قۆنیە و لەوێ لە گەڵ جلال الدین ی ڕۆمی یەکتریان ناسی و چەند ساڵێك پێکەوە بوون ، بۆ ماوەی چل ڕۆژ پێکەوە چوونە خەڵوەتگا و لە ئەنجامدا چل بنەمایان بۆ عیشقی ئیلاهی! درووست کرد ، دواتر لە بارودۆخێکی تەمومژاویدا شەمس بەرەو دیمەشق هەڵهات و پاش ماوەیەك بە هەوڵی جەلال و ناردنی کوڕەکەی بە دوایدا بۆ دیمەشق دیسان گەڕایەوە بۆ قۆنیە وپێشوازییەکی شکۆداریان بۆ ئامادەکرد وبەڵام دواجار لەوێ هەندێ لە نەیارەکانی بە کوشتن کۆتاییان بە ژیانی شەمس هێنا لە ساڵی ٦٤٥ ی کۆچی بەرانبەر ١٢٤٨ ی میلادی وگۆڕەکەی ئێستا لە شاری خوی ئێرانە و پێشنیاز کراوە بکرێتە یەکێك لە شوێنەوارە کلتوریە جیهانیەکان ی سەر بە یونسکۆ.

وەکو باسمان کرد شەمس هەر لە سەرەتای ژیانیەوە کەسێکی ئاسایی نەبوو ، کاتێك مامۆستا بوو لە (أرضروم) بە شێوەیەکە دڕندانە لە خوێندارەکانی دەدا و خوین بە دەست و قاچیاندا دەهاتە خوارەوە وە کو الأفلاکی لە مناقب العارفین دا دەگێڕێتەوە ، لە زانستی کیمیا - نەك بە واتای کیمیای ئەم سەردەمەی خۆمان - بە ڵکو زیاتر بە واتای سیحرو جادوو کردن شتی سەیرو سەمەرەی لێ بەدیدەکرا .

جارێك لە لای جەلالدا کتێبێکی خستە ناو ئاویکەوە و تەر نەبوو ،جەلال دەیوت: زانایانی زاهیر بین تەنها شارەزای فەرموودەکانی پێغەمبەرن (ﷺ) بەڵام سەرگەورەمان مەبەستی شەمس بوو لە نهێنییەکانی پێغەمبەرمان شارەزایە و منیش ڕووناکییەکانی دەخەمەڕوو. لە هەردووکیانەوە قسەو باس و بانگەشەی گەورە دەربارەی توانایان و پەیوەندییان بە خواو تایبەتمەندییان لە مەسەلەی دینداری زۆر شتی سەیر دەگێڕنەوە ، کە هەندێکیان الأفلاکی مێژوونوس و سپهسالاری مێژوونووس باسیان کردووە ، لەوانە شەمس دەیوت ئەگەر جنێو بە کافرێك بدەم سەدساڵ کافر بووبێت دەبێتە ئیماندار ، ئەگەر جنیویش بە ئیماندارێك بدەم دەبیتە ئەولیا و دەچێتە بەهەشتەوە ، کەسێکیش لێی پرسی ئیبلیس کێیە؟ پێی وت تۆ ئیبلیسی! ..

ئەگەر پرسیارت بکردایە جیبریل کێیە دەموت تۆ جیبریل ی ! هەروەها دیوت: مورید لە سێ ڕێگەوە دەگاتە لامان: بە مال و حال و ابتهال! واتە: بە پارەو حاڵ و پاڕانەوە! هەروەها دەیوت: تاکو کەی تەنها باسی ئایەت و فەرموودە دەکەن و دڵتان لە خوا شت ناگێڕێتەوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ!

الأفلاکی دەگێڕێتەوە: جارێکیان شەمس سەماعی دەکرد واتە:گوێی لە گۆرانی دەگرت ،

کەسێك وتی بڕوانە دەروێشەو گوێ لە مۆسیقا دەگرێت! شەمس وتی: دەك نەبینیت و نەبیسیت ئیتر ئەویش دەست بە جێ کوێرو کەڕ بوو !چەندیش تکایان کرد بێ سوود بوو کە لێی خۆش بێت!

جارێکی تریش لە کەسێکی تر تورە بوو ئەویش کوێرو کەڕ بوو بەڵام دواتر لێی خۆش بوو و چاك بوویەوە! شەمسی تەبرێزی دەربارەی جەلالی ڕۆمی دەیوت: هەرکێ دەیەوێت پێغەمبەر (ﷺ) ببینێت با تەماشای جەلال بکات بەهەشت لە ڕازیبوونی ئەودایەو دۆزەخ لە تووڕەبوویدایە ،

سەرگەورەمان جەلال کلیلی بەهەشتە! ئەمە چەند بەسەر هاتێکی کەم لەوانەی لە مەناقیبی شەمس باسکراوە کە دەشێت بۆ باسکردن، هاوکات زۆر هەواڵی تر دەگێڕنەوە دەربارەی پەیوەندی ئەو بە ئافرەت و مناڵی جوان و گەنجی موو لێنەهاتوو و عارەق و تریاق خواردن..هەرگیز شیاوی باس کردن نین خوێنەر خۆی دەتوانیت لە هەواڵەکانی الأفلاکی و سپهسالارو کتێبە کەی أبو الفضل القونوي (أخبار جلال الدين الرومي) خۆی بیخوێنێتەوە.

بۆیە کاتێك جەلالی ڕۆمی کوڕە تازە پێگەیشتووەکەی خۆی بە شەمسی تەبرێزی پێشکەشکرد لەوانەیە بۆ خزمەتکردن بیت ، لە نێو خەڵکدا لە قۆنیە وتی وتی پەیدا بوو بۆیە جەلال ناچار بوو گومانی خراپ لە کوڕەکەی دوور بخاتەوەو بڵێت:بەهادینی کوڕم هەرگیز نە حەشیشە ئەخوات و نە کاری قەومی لوط ئەنجام دەدات! شەمس کێشەیەکی گەورەی تری هەبوو ئەویش ئەوە بوو بە کرێگرتەی مەغۆلەکان بوو ، بۆیە خەڵکێکی زۆر بە تایبەتی دانیشتوانی قۆنیە ڕقیان لێ بوو ، بە پێی ئەوەی مێژوونووسە تورکەکان ئاماژەیان پێکردووەو نووسەری کتیبی (أخبار جلال الدين الرومي) دەیگێڕێتەوە کوڕێکی جەلال لە گەڵ خەڵکی قۆنیە بەشدار بوون لە کوشتنی شەمسی تەبرێزیدا، هەندیکیش پییان وایە وەکو بە ئەفسانەکردنی کوشتنەکەی کە ئەو دیار نەماوەو چووە بۆ شاری (خوی) و هەر لەوێش مردووەو نێژراوە!

لە پاش کوژرانی شەمس ئیتر جەلال کەوتە خراپترین بارودۆخەوەو بەردەوام دەهات و دەڕۆیشت وئارامی لێ بڕابوو، دواتر مێزەرێکی خاکی ، یان وەکو ڕەنگی دووکەڵ پێچایە سەری و جۆرە جل و بەرگێکی تایبەتی پۆشی تا کۆتایی تەمەنی.

- بڕوانە: (أخبار جلال الدين الرومي) أبو الفضل القونوي ) .
- مشاهير شعراء الشيعة .

**کەسێکیش لێی پرسی ئیبلیس کێیە؟ پێی وت تۆ ئیبلیسی!.**

**ئەگەر پرسیارت بکردایە جیبریل کێیە: دەموت تۆ جیبریلی !**

# ( غلام أحمد القادياني )



**ناوی** (الميرزا غلام أحمد القادِياني) (١٢٥٥ - ١٣٢٦ ھ / ١٨٣٩ - ١٩٠٨ م) لە ناوچەی (قادیان) ی سەر بە کەرتی بەنجاب لە هیندستان لە دایکبووە ، سەرەتای پێگەیشتنی وەکو بانگخوازێکی ئیسلامی ناوی دەرکرد ،دواتر بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە تازەکەرەوەی ئیسلامەو ئیلهامی بۆ دێت لە لای خوای گەورە ، ئینجا هەنگاوێکی تر چووە پێشەوەو خۆی وەکو مەهدی چاوەڕوانکراو و دواتر بە ڕاشکاوی وتی ئەوەی پێی دەوترێت مەسیحی کوڕی مەریەم منم.بەڵام دوای ئەم قۆناغە وتی حەقیقەتی موحەممەد (ﷺ) لە مندا بەرجەستە بووەو بەم شێوەش دەستی بە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد و خەڵکانێکی زۆر لە نەفام و نیاز خراپ بەرانبەر ئیسلام شوێنی کەوتن.

ئەحمەدی قادیانی سەر بە بنەماڵەیەك بوون بە شانازییەوە لە گەڵ داگیرکەری ئینگلیزدا بوون دژ بە خەڵکی هیندستان ، زۆر جاریش دانی بەو ڕاستیەدا دەنا ، وەکو ئەوەی خۆی دەڵێت:

**"لم نقصر في إراقة دمائنا والتضحية بأنفسنا في سبيل الحكم الإنجليزي"** له ڕووی مێژووییشەوە جێگای گومان نییە ، کە ئەحمەدی قادیانی درووستکراوی ئینگلیز بوو بۆ مەبەستی ساردکردنەوەی خەڵکی لە جیهاد کە داگیرکەران بە هۆیەوە زۆرترین زیانیان بەردەکەوت.، بۆیە ئینگلیزەکان هەموو هەوڵێکیان بەخەرج دەدا لە پێناو کاڵ کردنەوەی ئەو واتایەی کە خەڵکی هیندستان لەو دەمە باوەڕیان پێ بوو ، قادیانی بە ڕاشکاوی وەسفی بریتانیای دەکرد کە بریتیە لەو سێبەروسایەی کە خوا لە قورئاندا باسی کردووە:( **وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ** [ المؤمنون ] ٥٠

**ولما جعلني الله عز وجل مثيل عيسى جعل لي السلطنة البريطانية ربوة أمن وراحة ومستقراً حسناً؛ فالحمد لله مأوى المظلومين، ولله الحكم والمصالح، ما كان لأحد أن يؤذي من عَصَمَهُ الله، والله خير العاصمين).** ضميمة الوحي ص ٥٠.

ئەحمەدی قادیانی خاوەنی کتێبێکی زۆرە کە بە عەرەبی و ئینگلیزی و ئوردی نووسیونی ، لە کتێبی یادەوەرییەکانید دەربارەی حیکمەتی ڕەوانەکردنی خۆی وەکو پێغەمبەر بۆ گوندەکەی دەڵێت:"**كانت قريتي أبعد من قصد السيارة، وأحقرَ من عيون النظارة، درَست طُلولها، وكُرِه حلولها، وقلَّت بركاتها، وكَثُرت مضراتها ومَعرَّاتها، والذين يسكنون فيها كانوا كبهائم، وبذِلَّتهم الظاهرة يدعون اللائم، لا يعلمون ما الإسلام، وما القرآن، وما الأحكام، فهذا من عجائب قضاء الله، وغرائب القدرة أنه بعَثني من مثل هذه الخربة.**"

ئەو لە بنەڕەتەوە نکۆڵی لە ئایینی ئیسلام نەدەکرد وەکو ئەوەی ڕاستەوخۆ نکۆڵی لێ بکات! بەڵام دەیوت منیش پێغەمبەرم و وەحی م بۆ دادەبەزێت و ئیسلام کۆتا ئایین نییە ، دەربارەی ئەو ئایەتانەش کە گوایە بۆی دادەبەزین هەر هەمان ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی دەهێنا و دەستکاری دەکرد بۆی زیاد و کەم دەکرد و وەکو وەحیی تازە پێناسەی دەکرد ، بۆنمونە دەیوت: "**يقولون: أنى لك هذا، أنى لك هذا، إن هذا إلا قول البشر، وأعانه عليه قوم آخرون**" یان دەیوت ئەم ئایەتەم بۆ دابەزیوە: "**إني رافعك إلي، وأَلقيتُ عليك محبةً مني، لا إله إلا الله، فاكتب وليطبع (هەربەوشێوە)، وليرسل في الأرض، خذوا التوحيد، التوحيدَ يا أبناء الفارس (هەربەوشێوە)، أصحاب الصفة، وما أدراك ما أصحاب الصفة.**"

ئەحمەدی قادیانی کەسێکی زمان زبر و بێ شەرم و درۆزن بوو ، هەمیشە بە درۆ دەکەوتەوە دەربارەی ئەو وەحیانەی کە بانگەشەی دەکرد ، جاریکیان دڵی لە کچێك چوو ، بەڵام باوکی کچەکە ڕازی نەبوو لێی مارە بکات وکچەکەی لە کەسێکی تری مارە کرد ، ئیتر قادیانی هەڕەشەی لێکرد و وتی وەحیم بۆ دابەزیوە کە مێردەکەی بە هیلاك دەچیت : "**وهنَّأني ربي وقال: إنا مُهلكو بعْلها كما أهلكنا أباها، ورادُّوها إليك، الحق من ربك فلا تكونن من الممترين، وما نؤخره إلا لأجل معدود، قل تربَّصوا الأجل، وإني معكم من المتربصين، وإذا جاء وعد الحق هذا الذي كذبتم به، أم كنتم عمين".بەڵام ئەو دوای مردنی قادیانی سی ساڵ ژیا . کاتێکیش نەیارەکانی بەوە تۆمەتباریان کرد کە ئایەتی قورئان و قسەی تر دەدزێت و ئایەتەکانی خۆی لێ پێکدەهێنێت ، یەکسەر وتی ئەم وەحیەم لەم بارەوە بۆ دابەزیوە :والله إنه ظل القرآن؛ ليكون آيةً لقوم يتدبرون، أتقولون سارق،**

**فأتوا بصفحات مسروقة كمثلها في التزام الحق والحكمة، إن كنتم تصدقون"** هەروەها وتی لەو بارەوە ئەم ئايەتەشم بۆ دابەزيوە: **"ألا لعنة الله على مَن افترى على الله، أو كذَّب الصادقين، وكل مَن كذَّب الصادق أو افترى، جمَعهم الله في نار أُعِدَّت لهم، وليسوا منها بخارجين، قال كم لبثتم في الأرض عدد سنين.**"

هەروەها كاتێك پەتای (طاعون) بڵاو بوویەوە لە هیندستان وتی ئەو پەتایە ناگاتە ناوچەی قادیان : " **و آية له أن الله بشره بأن الطاعون لا يدخل داره، وأن الزلازل لا تهلكه و أنصاره، ويدفع الله عن بيته شرهما** ". بەڵام وا دەرنەچوو ، پەتاكەش پێیان گەیشت و خۆی و شوێنكەوتوانیشی لە ناوبرد.

جارێكیان وتی ئەم ئایەتەم بۆ دابەزیوە: "هوشعنا نعسا" بەڵام وتی خۆیشم نازانم مەعنای چییە یان بە چی زمانێك دابەزیوە ، جارێكی تریش وتی ئەم ئایەتم بۆ دابەزیوە: "بریشن عمر براطوس یا بلاطوس" دواتر وتی: نازانم بلاطوسە یان براطۆسە، چونكە وەحیەكەم بەپەلە بەسەردا دابەزی!

ئەو دەیوت جاری وا هەیە وەحیم بۆ دادەبەزێت نازانم بە چی زمانێك دابەزیوەو لێی تێناگەم ،یان دەچوو سەیری قاموسی دەكرد بۆ زانینی واتاكانی، ئینجا ئەوەی لە بیر دەچوو و لە كتێبێكی تردا خۆی بە درۆوە دەخست و دەیوت :هەرگیز مەعقول نییە كەسێك وەحی بۆ دابەزێت لە واتاكەی تینەگات!

جاریكیان قەسیدەیەكی نووسی زۆر لاواز بوو ، تەنانەت ژنی جەرگ سوتاوی دەهێناوە پێكەنین ،بۆ نموونە تێیدا هاتبوو كە دەیوت: **إنَّ الْعِدَا صَارُوا خَنَازِيرَ الْفَلاَ**وَنِسَاؤُهُمْ مِنْ دُونِهِنَّ الأَكْلُبُ**.واتە: نەیاران بوونە بەرازی بیابانەكان و ژنەكانیانیش بوونە سەگ!بۆیە كەسێك ڕەددی دایەوەو

وتی: ئەوە هەر شیعر نییە ، ئیتر غولام ئەحمەد بە ناشیرینترین شێوە وەڵامێکی لەدژی نووسی ئەمە هەندێکیی: **(أمَّا ما أنكَرت في كتابك بلاغة قصيدتي، وما أكّلت عصيدتي، فلا أعلم سببه إلا جهْلك وغباوتك، وتعصُّبك ودناءتك، أيها الجهول، قم وتصفَّح دواوين الشعراء؛ ليظهرلك منهاج الأدب والأدباء، أتُغلط صحيحًا، وتظن الحسن قبيحًا، وتأكل النجاسة، وتعاف النفاسة).**

هەندێ لە عەقیدە و بیروباوەڕی قادیانییەکان:

١- تناسخ الأرواح: واتە باوەڕیان وایە گیانەکان کە دەردەچن جارێکی تر دەچنە لاشەی کەسانی ترەوە ، دەڵێن ئیبراهیم دوای دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ لە ماڵی عەبدولموتتەلیب دا بەرجەستە بوو لە لاشەی محمد (ﷺ) ، هەروەها خودی پێغەمبەر (ﷺ) دوو جاری تر لە دایکبووە ، مەبەستیان پێغەمبەرایەتی ئەحمەدی قادیانییە.

٢- باوەڕیان وایە خوای گەورە نوێژ دەکات و ڕۆژوو دەگریت و دەخەوێت وهەڵەش دەکات:

**" قال لي الله : إني أصلي وأصوم وأصحوو أنام " وقال :" قال الله : إني مع الرسول أجيب أخطيء وأصيب إني مع الرسول محيط."**

٣- دەڵێن پێغەمبەرایەتی بە هاتنی محمد (ﷺ) کۆتایی پێ نەهاتووە ، بەڵکو هەر بەردەوامە و غولام میرزا ئەحمەد چاکترینی پێغەمبەرانە.

٤- دەڵێن: قورئان ئەوەیە کە بۆ میرزا دابەزیوەو فەرموودەش قسەو ڕێنماییەکانی ئەوە.

٥- هەروەها پێیان وایە خۆیان خاوەن شەریعەتێکی سەربەخۆن و هاوەڵانی میرزا هاوشێوەی

هاوەڵانی پێغەمبەرن (ﷺ).وەکو لە "الفضل، دا مارەی ٩٢ " هاتووە: " **لم يكن فرق بين أصحاب النبي (ﷺ) لم وتلاميذ الميرزا غلام أحمد، إن أولئك رجال البعثة الأولى وهؤلاء رجال البعثة الثانية."**

٦- حەجی گەورە (الحج الأكبر)ر واتە :سەردانی قادیانی و گۆڕی قادیانی. شوێنە پیرۆزەکانیش بە لایانەوە سی شوێنن: مەککەو مەدینە و قادیان ، وەکو لەو کتیبەیاندا هاتووە: " **أن الحج إلى مكة بغير الحج إلى قاديان حج جاف خشيب، لأن الحج إلى مكة لا يؤدي رسالته ولا يفي بغرضه."**

٧- عارەق و تلیاك بە حەڵاڵدەزانن.

٨- هەموو موسوڵمانیك بە لایانەوە کافرە تاکو نەچێتە نێو قادیانیەکانەوە ، هەرکێیش ژن و ژنخوازی لە گەل موسوڵماناندا بکات کافرە.

٩- شتێك نەماوە بە ناوی جیهاد و پێویستە هەموان بۆ دەسەڵاتی ئینگلیز ملکەچ بن.

١٠- خوا بە ئینگلیز ناو دەبەن چونکە وەحی بەو زمانە دادەزێنیت بۆ قادیانی.

زانایانی ئیسلام بەردەوام بەرپەرچی ئەم تاقمەیان داوەتەوەو لە ساڵی ١٩٧٤٤ لە کۆنگرەی (رابطة العالم الإسلامي في مكة المكرمة) بە ئامادەبوونی نوێنەرانی ڕێکخراوە ئیسلامیەکان

لە سەرانسەری جیهانەوە دەرچوونی ئەوانیان لە دینی ئیسلام ڕاگەیەندرا و فەتوایش لە زۆربەی لایەنە پسپۆڕەکانی دونیا دەرچوو بە بێ باوەڕی ئەوان ، وەکو:

(**المجمع الفقهي التابع لرابطة العالم الإسلامي، ومجمع الفقه الإسلامي التابع لمنظمة المؤتمر الإسلامي، وهيئة كبار العلماء بالمملكة العربية السعودية،**)

ئەمە جگە لە فەتوای زانایان لە هەموو وڵاتانی جیهانەوە.

گەورەترین هۆکاری درووست بوونیان کاتی خۆی جەهلی موسوڵمانان بە دینەکەیان بوو ، ئێستاش لە بەر هەمان هۆکارو سستی ئەهلی سوننەت لە بەرگری کردن لە عەقیدەکەیان ، بە تایبەت لە ساڵانی دواییدا چالاکی ئەو تاقمە زۆر زیادی کردووە ، لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی کتێب بە زۆرێك لە زمانەکانی دونیا و بە میکانیزمی چەواشەکاری و یارمەتی ڕۆژئاواو و ئاسانکردنی سەرانی ولاتە عەرەبیەکاندا بوونیان هەیە - بەتایبەتی لە ئەوروپا -و چالاکییەکان تەشەنە دەکات و تەنانەت لە کوردستانیشدا هەوڵی بڵاوکردنەوەی ڕێڕەوەکەیان دەدەن.

بۆ زیاتر شارەزا بوون بڕوانە:

- براءة الإسلام من القادياني ميرزا أحمد الغلام، د. يزيد حمزاوي.
- موسوعة الفرق/ الدرر السنية .
- القاديانية .... أفكارها وعقائدها/موقع اسلام ويب.
- هەروەها ئەو کتێبانەش کە بە گشتی باسی تاقمە هاوچەرخە گومڕاکان دەکان وەکو :
- موسوعة الفرق والاديان المعاصرة/ ممدوح الحربي ، ....

# ( مسيلمة الكذاب )




ناوی تەواوی (مسلمة بن حبيب الحنفي) ە ، یەكێكە لە بەناوبانگترین ئەو كەسانەی لە ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دا بانگەشەی پێغەمبەرایەتی كرد ، لە یەمامە لە دایكبووەو هەر لەوێیش گەورە بووە ، تەمەنی لە تەمەنی پێغەمبەر(ﷺ) گەورە تر بوو ، ئەو لە پێش سەرهەڵدانی ئیسلام بەوە دەناسرا كە خەریكی رمڵ لێدان و جادو و پێشبینی كردن و كاری لەو شێوە بوو ، خەڵكی مەككەش زانیاریان دەربارەی هەبوو.

موسەیلەمە پێش بانگەشە كردنی پێغەمبەرایەتی كەسێكی گەڕۆك بوو ، بەردەوام بە نێو هۆزەكاندا گەشتی دەكرد هەوڵی فێربوونی هەندێ شتی وەكو جادوو و بە دەستهێنانی هەواڵی ئەو جۆرە كەسانەی دەدا.

لە ساڵی ٦٣٢ ی میلادی لە گەڵ هەندێ لە خزمانی خۆی لە بەنی حەنیفە ڕۆیشتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ، كاتێك ئەوان موسوڵمان بوون و بەیعەتیاندا ،

موسەیلەمە خاچەکەی پۆشیبوو بە پێغەمبەر (ﷺ) ی وت: دەمەویت موحەممەد بەشدارم بکات لە پێغەمبەرایەتی وەکو چۆن موسا هارونی برای بەشدار کرد ، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) چڵە دارخورمایەکی هەڵگرت و فەرمووی: سوێند بە خوا ئەی موسەیلەمە داوای ئەم چڵە دارەشم لێبکەیت پێت نادەم. ئتر موسەیلەمە لەسەر گاوری خۆی مایەوەو بەیعەتی نەدا.بەڵام کاتێك گەڕایەوە بە هۆزەکەی خۆی وت لەوانەیە موحەممەد هاوبەشم بکات لە پێغەمبەرایەتی ،ئینجا وەکو هەوڵێك بۆ ئەو پرسە نامەیەکی نارد بۆ پیغەمبەر (ﷺ) کە تێیدا هاتبوو: لە موسەیلەمەی پێغەمبەری خوا بۆ موحەممەدی پێغەمبەری خوا ، منیش وەکو تۆ نیوەی پێغەمبەرایەتیم بۆ هاتووە ، نیوەی سەر زەوی بۆ تۆیە و نیوەکەی تری بۆ منە ، بەڵام قورەیش خەڵکێکی ستەمکارن.پێغەمبەری خوایش (ﷺ) وەڵامی دایەوەو فەرمووی لە موحەممدی پێغەمبەری خوا بۆ موسەیلەمەی درۆزن ..«**من محمد رسول الله إلى مسيلمة الكذاب، السلام على من أتبع الهدى، أما بعد، ﴿إِنَّ الْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾**

لە پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژهەڵاتی نەجد ئافرەتێکی گاور دەرکەوت بە ناوی سجاح التميمية کە ئەویش بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد.

ویستی هێرش بکاتە سەر یەمامە ی هۆزی موسەیلەمە ،بەڵام موسەیلەمە لە گەڵیان ڕێککەوت و سەجاحی مارەکرد لەسەر بنەمای یەکگرتنی ئامانجەکانیان ، بەڵام سەجاح لە پاش هەشت مانگ ژیانی هاوسەرگیری لە گەڵ موسەیلەمەی درۆزن ، کۆچی کرد بەرەو عومان وئەوی بە جێهێشت.

لە پاش وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێبێت) جەنگی لە گەڵ نکۆڵیکەران لە زەکاتدان و هەڵگەڕاوەکان لە ئیسلام بە گشتی ڕاگەیاند ، لەو جەنگانەشدا موسەیلەمەو هێزەکانی تیکشکان بەرانبەر سوپای خالیدی کوری وەلید و موسەیلەمە لە ساڵی ٦٣٣ میلادی لە شەڕی یەمامە لەسەر دەستی وەحشی کوڕی حەرب کە بکوژی حەمزە بوو کوژرا ، بە پێی کتیبی: تاريخ الخلفاء ی السيوطي موسەیلەمە کاتی کوژرانی تەمەنی لەسەرووی سەد ساڵەوە بوو ، هەندێکش پییان وایە تەمەنی نزیکەی سەد و پەنجا ساڵ دەبوو.موسەیلەمە سەبارەت بە بانگەشە کردنی پێغەمبەرایەتی هەندێ هەوڵی لاساییکردنەوەی قورئانیدا ، دەرەنجام ئایەتەکانی هەندێ قسەی مناڵانەو پێکەنیناوی بوون ، وەکو ئەوەی دەڵیت:

١- وَاللَّيْلُ الدَّامِسْ، وَالذِّئْبُ الْهَامِسْ، مَا قَطَعَتْ أَسَدٌ مِنْ رَطْبٍ وَلَا يَابِسْ.

٢- لَقَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَى الْحُبْلَى، أَخْرَجَ مِنْهَا نَسَمَةً تَسْعَى، مِنْ بَيْنِ صِفَاقٍ وَحَشَا.

٣- إن بني تميم قوم طهر لقاح، لا مكروه عليهم ولا إتاوة، نجاورهم ما حيينا بإحسان، نمنعهم من كل إنسان، فإذا متنا فأمرهم إلى الرحمن.

٤- وَالْفِيلْ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْفِيلْ، لَهُ زَلُّومٌ طَوِيلْ.

٥- وَالْمُبَذِّرَاتِ زَرْعًا، وَالْحَاصِدَاتِ حَصْدًا، وَالذَّارِيَاتِ قَمْحًا، وَالطَّاحِنَاتِ طِحْنًا، وَالْخَابِزَاتِ خَبْزًا، وَالثَّارِدَاتِ ثَرْدًا، وَاللَّاقِمَاتِ لَقْمًا، إِهَالَةً وَسَمْنًا، لَقَدْ فُضِّلْتُمْ عَلَى أَهْلِ الْوَبَرِ، وَمَا سَبَقَكُمْ أَهْلُ الْمَدَرِ، رَفِيقَكُمْ فَامْنَعُوهُ، وَالْمُعْتَرَّ فَآووه، والناعي فواسوه.

٦- **يَا ضِفْدَعُ بَنَتَ الضِّفْدَعِينْ، نَقِّي كَمْ تَنِقِّينْ، لَا الْمَاءَ تُكَدِّرِينْ، وَلَا الشَّارِبَ تَمْنَعِينْ، رَأْسُكِ فِي الْمَاءِ وَذَنَبُكِ فِي الطِّينْ.**

(ابن كثير) دەگێڕێتەوە کە عەمری کوڕی عاص پێش موسوڵمان بوونی چاوی بە موسەیلەمەو کەوتبوو ، ئەویش لێی پرسیبوو: چی تازە بەسەر موحەممەددا دابەزیوە ، عەمریش وتبووی ، سوڕەتیکی پڕ لە ڕەوانبێژی بەسەردا دابەزیوە بریتیە لە: **(والعصر إن الإنسان لفي خسر إلا الذين آمنوا وعملوا الصالحات وتواصوا بالحق وتواصوا بالصبر).**

موسەیلەمەیش بیرێکی لێ کردەوەو وتی: منیش سورەتێکی وام بەسەردا دابەزی ،

عەمر وتی کامەیە؟ ئەویش وتی:

"**يَا وَبَرُيَا وَبَرُ، إِنَّمَا أَنْتِ أُذُنَانِ وَصَدْرٌ، وَسَائِرُكِ حَقْرٌنَقْرٌ**"

ئینجا لە عەمری پرسی : پێت چۆن بوو؟ عەمریش وتی:

**( والله إنك لتعلم أني أعلم إنك لتكذب).** واتە: سوێند بە خوا تۆ دڵنیای لەوەی من دەزانم تۆ درۆ دەکەیت. زانایان پرسی موسەیلەمەیان لەوە پێ کەمتر و بێ بایەختر بووە کە وەلامی بدەنەو و لە کتیبەکانیاندا بەرپەرچی بدەنەوە.

ناوەڕۆکی زانستی ئەم بابەتە ڕاستەوخۆ من لە سایتی وێکیبیدیا وەرمگرتووە ، بەڵام ئەو لەم سەرچاوانە وەریگرتووە: البلاذري: فتوح البلدان، ص١٠٠.

**السهيلي: الروض الأنف،٢/ ٣٤٠.**

**اليعقوبي: تاريخ اليعقوبي، ١/ ١٢٠.**

**الزركلي: الأعلام، ٧/ ٢٢٦**

**.بن سعد: الطبقات الكبرى: ١/ ٣١٧، ٥/ ٥٥٠.**

**البدء والتاريخ: ٥/ ١٦٣.**

**الذهبي: سير أعلام النبلاء: ٣/ ٩٦.**

**ابن كثير: البداية والنهاية: ٦/ ٣٣٦،**

**تفسير القرآن العظيم: ٨/ ٤٧٩.**

**ابن حجر: الإصابة في تمييز الصحابة: ٢/ ٥٣٩.**

**الباقلاني: إعجاز القرآن، تحقيق: سيد صقر: ص١٥٦.**

# ( ئۆشۆ )



ناوی (تشاندرا موهان جاین) لە دایکبووی ساڵی ١٩٣١ ، لە دوای ساڵی ١٩٦٠ بە ناوی: (أتشاریا راجنیش) ناسرا، لە دوای ساڵی ١٩٧٠ بە (بهاجوان شري راجنیش) ناسرا لە دوا قۆناغی تەمەنیدا بە ئۆشۆ ناوبانگی دەرکرد، لە لای شوێنکەوتوانی لە جیهاندا بە مامۆستایەکی روحی وەسف دەکرێت.و یەکێکە لە سەرانی تەسووفی فەلسەفی هاوچەرخ ، لە ڕێگەی نووسین و وتارەکانییەوە بیرۆکەکانی خۆی بە جیهاندا بڵاوکردووەتەوە و بە گشتی جەخت لە سەر ئیلحاد و بێ باوەڕی دەکاتەوە و پێی وایە سەردەمی باوەڕبوون بە خوا تێپەڕیووە ، یەکێك لە بە ناوبانگترین کتێبەکانیشی ناونیشانی بریتییە لە: (موت الإله) واتە: مردنی خوا! ئەمەش هەندێکە لە سەرەباسەکانی نێو ئەو کتێبە:

الإله هو محرك الدمى(خوا بزوێنەری بوکەڵەکانە)

الإله كذبة (خوا درۆیە)

الإله هو شعورك بالنقص.(خوا هەستکردنی تۆیە بە کەمی)...هتد.

بە کورتی و پوختی ئۆشۆ مولحیدێکی قسەزانەو بە هەموو شێوازێك هەوڵی داوە لە ڕێگەی وتارو نووسینەوە قەناعەت بە خەڵکی بکات کە ئایینەکان زیاتر نین لە ئامرازێك بۆ سڕکردن و گێلکردنی ئەوان.

ئۆشو لە خێزانێکی هەژاردا پەروەردە بووە لە هندستاندا سەر بە ئایینی جینی ، فەلسەفەی خوێندووە لە زانکۆی (جبل پور) و لەو کاتەی خوێندکار بووە سێ جار لە سەر بێ ڕەوشتی دەرکراوە لە خوێندن ، دواتریش کە بووەتە مامۆستا لەوێ لە جیاتی فەسڵ کردن و وەکو بەزەییەك داوای لێکراوە دەست لە کارکێشانەوەی پێشکەش بکات و دوای ئەوە ناوی خۆی گۆڕییەو دەستی کردووە بە وتاردان و قسەکردن بۆ خەڵکی لە شارەکانی هیندستان ، لەم سەروبەندەدا و بەردەوام کێشەی سێکسی و گێچەڵکردنی سێکسی بە کچان هەبووە ، هەر بۆیە پاش دەستدرێژیکردنی بەسەر کچێکی ئەمریکی و دووگیان بوونی ئەو کچە لە ئۆشۆ کێشەی بۆ درووست دەبێت لە گەڵ کونسوڵخانەی ئەمریکی لە هیندستان ، لە ڕاستیدا ئەو پەرستگاو ناوەندانەی بۆ تێڕامان دایمەزراندبوو بە زۆری کاری بەدڕەوشتی تێدا ئەنجام دەدرا و هەر بۆیە نازناوی مامۆستای سێکس (معلم الجنس) یان بە ئۆشۆ بە خشیبوو .

جارێکیش داوایەکی پێشکەشی دەسەڵاتداران کرد کە ڕێگەیان بدەن شوێنکەوتوانی بە ڕووتی بسوڕێنەوە بە ناو خەڵکیدا بە بەهانەی ئەوەی خەڵکی لە بنچینەدا بە ڕووتی لە دایکبوونە!(دوتریش کە لە ئەمریکا نیشتەجێ ئەبیت هەمان ئەم داواکارییە پێشکەشی دەسەڵاتدارانی ئەوێ دەکات) بەڵام هەر دوو جارەکە داواکەی ڕەتدەکرێتەوە .

هەروەها ڕێگەشی لێگیرا هیچ موڵکێك بکرێت بۆ ئەوەی پەرستگاو ناوەندەکانی زیاتر نەکات هاوکات ئەو سەرانەو باجیشی بە حکومەتی هیندی نەدەدا.سەفارەتەکانی هیندیش لە وڵاتاندا ڤیزەیان بەکەس نەدەدا بۆ سەردانی ئۆشۆ ، هەموو ئەمانە و زۆر شتی تر وای کرد ئۆشۆ ڕوو بکاتە ئەمریکا و لەوێ پارچە زەوییەکی گەورەی کڕی بە شەش ملیۆن دۆلار کڕی و پێشتریش بە سکرتێرەکەی وتبوو کتێبێك دەربارەی ئایینی ڕاجنیش بنووسێت بۆ ئەوەی کەش و هەوای لەبار بۆ خۆی لە ئەمریکا دروست بکات.پەرستگاکەی لە ئەمریکا زۆر گەورە بوو ، بە شێوێنکەوتوانی دەوت عەقڵت لەدەرەوەی دەروازەکە دابنێ ئینجا وەرە ژوورەوە ، پاش ماوەیەك بە هۆی سەرپێچی کردنی زۆری ئۆشۆ بۆ یاساکانی ئەمریکا کێشەی زۆری بۆ دروست بوو و هەڕەشەی دەرکردنی لێکرا لە لایەن دەسەڵاتدانەوە ، سەرکێشییەکانی و ئۆشۆ و شوێنکەوتوانی لە ئەمریکا ڕۆژ لە ڕۆژ ڕوو لە زیاد بوون وەکو ئەوەی هەوڵیاندا ئاوی زیاتر لە ویلایەتێك ژەهراوی بکەن و لە پەرستگاکانیاندا هەندێ نەخۆشی وەکو ئێدزیان ئامادە کرد بۆ بڵاوکردنەوە وشتی تر بۆیە دەستگیران و دواتر هەوڵیاندا هەندێ چالاکی دژ بە هەڵبژاردنەکانی ئەمریکا ئەنجام بدەن ، سەرەنجام شوێنکەوتووەکانی هەڵهاتن بۆ وڵاتان وهەندێکیان دەستیان گرتە سەر بڕێکی زۆر لەو پارانەی لە بانکەکانی سویسرا هەبوون ، خودی ئۆشویش هەڵهات و لە کاتی نیشتنەوەی فرۆکەکەی لە یەکێك لە ویلایەتەکانی ئەمریکا بۆ وەرگرتنی بەنزین دەستگیر کرا و دواتر حکومەت ڕازی بوو تۆمەتەکانی لەسەر لابدات بە مەرجی ئەوەی ئەمریکا بە جێ بهێڵێت ، بەڵام بیست و یەك دەوڵەت ڕازی نەبوون پێشوازی لێ بکەن ،

تاكو گەیشتە ئەوەی هند بەزەیی پێدا بێتەوە لە ساڵی ١٩٨٧ ڕازی بوو بگەڕێتەوە هیندستان.ئۆشۆ نەخۆشی زۆری لە گەڵدا بوو بە تایبەتی نەخۆشی جنسی ، هەمیشەش بە بێ دکتۆر ڕێی نەدەکرد..

لە ساڵی ١٩٩٠ بە کەسە نزیکەکانی دەوروبەری وت: جەستەم لێ دوور بخەنەوە وەکو دۆزەخی لێ هاتووە بۆم و دوای چەند سعاتیك لەو قسەیە مرد.

ئۆشۆ لە سەرەتای لاوێتییەوە دەستی کرد بە گەڕان بە دوای ڕاستیدا بە پێی پێوەرو ئەزموونی خۆی ، لە تەمەنی بیست و یەك ساڵیدا گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە سەری بوو تا مردن ، خوێنەرێکی زۆر هەناسە درێژ بوو لە خوێندنەوەدا لە قۆناغی سەرەتایی تاکو مردنی بە چڕی خەریکی کتێب خوێندنەوە بوو، بەڵام هاوکات کوتلەیەکیش لە بێباوەڕی و ئارەزووی سێکسی و هەوڵی وێرانکردن بۆ دەوروبەر.

ئۆشۆ خاوەنی سەدان کتێب و نووسینی جیاجیایە ، زۆربەشیان بریتین لەو وتارانەی کە لە هند و ئەمریکا پێشکەشی کردوون بە خەڵکی.و دواتر کراوە بە کتێب ، دەڵێن: زیاتر لە سیانزە هەزار سعات وتاری هەیە!شایەنی باسە فیلمە سینەماییەکان ڕۆڵیان بووە لە گەورەکردنی ئۆشۆ بە بەهانەی بانگەشەکردنی ئەو بۆ دوورکەوتنەوە لە توندو تیژی و ڕق لە یەکتر بوون وبانگکردنی خەڵکی بۆ یەکتر خۆشویستن ، بەڵام بێگومان ئەوان پێش هەموو شتیك چاك لە ڕەهەندە فیکرییەکانی ئۆشۆ شارەزابوونە ، ئەوان حکومەتەکانیش دڵنیابوونە لە توانای ئەو پیاوە بۆ تێکدانی بەها ڕەوشتیەکان و شێواندنی بیروباوەڕی خەڵکی دەربارەی خوا و ڕۆژی دوایی ، هەروەها لە دەرەنجامی خوێندنەوەم

دەربارەی ئەم فەیلەسوفە سێکس پەرست و بێ باوەڕە بۆم دەرکەوت جگە لە سینەما ئافرەتیکیش بەناوی مەریەم نور ڕۆڵیکی کاریگەری بووە لە ناساندن و ناوبانگ پەیداکردنی ئۆشۆ .

ئەمەش هەندێکن لە بیروباوەڕەکانی:

باوەڕی بە خوایەك نەبوو لە دەرەوەی گەردوون ، بەڵام باوەڕی بە خوای (وحدة الوجود) هەبوو کە بریتیە لە دارو بەرد و سروشت بە گشتی.

-دژایەتی هەموو ئایینەکانی دەکرد و موسوڵمانانی بە موحەممەدییەکان ناو دەبرد ، بانگەشەی دەکرد بۆ ئایینی تاکە کەسی بێ وابەستەبوون بە هیچ ئایینێکی ڕێکخراوەوە.

-دەیووت بە هاو ڕاستیەکان مەسەلەیەکی ڕێژەیین ، ئەوەی ئەمڕۆ حەق بێت لەوانەیە سبەی ناحەق بێت.

دەیووت : ڕاستیەك نییە بەردەوام هەر ڕاستی بێت ، یان هەڵەیەك هەمیشە هەر هەڵە بێت ، هەموو ئەوانە قابیلی گۆڕانکارین.

-ئۆشۆ کەسێکی بەد ڕەوشت و خراپەکار بووە بە بەردەوامی ، هەرگیز لە لە کێشەو گێچەڵی سێکسی بە دوور نەبووە و پەرستگاکانی جێگایەکی بەرین بوونە و بۆ سێکس کردنی ئاژەڵ ئاسا و گۆرینەوەی هاوسەر و دەستدرێژی سێکسی. بەڵام وێڕای ئەوەش خراپییە فیکرییەکانی زۆر خراپتر بووە لە خراپییە سێکسییەکانی.

-ئۆشۆ پێی وابوو خوا و شەیتان دوو ڕوون بۆ یەك دراو ، هەموو ئەم بیروباوەڕانەش بەڵگەی قسەی خۆی لەسەرە بە نووسین و تۆماری ڤیدیۆیی تەرجەمەكراو لە یوتیوب.

لەوانەیە كەسێك بڵێت: كێشە چییە یان نیشانەی سەر سوڕمان لە كوێدایە كە كەسێكی هیندی گومڕاو مولحید ئەوە كاروكردەوەو قسەی بێت؟ منیش دەڵێم :كێشە لەوەدایە كەسانێك نەك هەر لە جیهانی ئیسلامی ، بەڵكو لە كوردستانی خۆیشمان سەرسامن بە قسەكانی و بەكەسێكی فەیلەسوف و مامۆستای ڕوحی و پیاوی (مستنیر) ناوی دەبەن ، بێ ئەوەی ئاگەداری ژیان مێژووی بن ، یان ئاگەدارن و بە ئەنقەست دەیانەوێت خەڵكی بەلارێدا ببەن و سەریان لێ بشێوێنن و خۆڵیان بە نرخی زێر پێ بفرۆشن.

**ئۆشۆ كەسێكی بەد ڕەوشت و خراپەكار بووە بە بەردەوامی ، هەرگیز لە لە كێشەو گێچەڵی سێكسی بە دوور نەبووە و پەرستگاكانی جێگایەكی بەرین بوونە و بۆ سێكس كردنی ئاژەڵ ئاسا و گۆرینەوەی هاوسەر و دەستدرێژی سێكسی. بەڵام وێڕای ئەوەش خراپییە فیكرییەكانی زۆر خراپتر بووە لە خراپییە سێكسییەكانی.**

# ( ملا جامی )



ناوی (نور الدين عبد الرحمن جامي بن نظام الدين أحمد )ھ ، لە لە خوراسانی گەورە ساڵی ٨١٧ ھ لە دایکبووە و لە ھەرات ی ئەفغانستان ساڵی ٩٩٨ ھ وەفاتی کردووە ، شاعیرو سۆفی و زانایەکی ناودارە ، قۆناغەکانی تەسەووفی بڕی تاکو گەیشتە سەرۆکایەتی تەریقەتی نەقشبەندی لەسەرەمی خۆیدا ، ھەر لە سەردەمی منالّییەوە لە گەل باوکی چووە ھەرات و سەمەرقەند بۆ فێربوونی زانست لە سەردەمی تەیمووریەکاندا ، ھەر لە سەرەتای تەمەنیەوە ناوبانگی دەرکرد و بوو بە جێگەی بایەخی خەڵکی ، چونکە لێھاتووی نیشاندا لە زانستەکانی (التصوف . التفسير . الحديث - والأدب والبلاغة - النحو - الصرف) دەشگرێنەوە کە ناوبانگی گەیشتووەتە سوڵتانە عوسمانییەکان و محمد الفاتح و دواتر یەزیدی کوڕیشی بانگهێشتیان کردووە بۆ ئەستانە و ئەو ڕازی نەبووە بڕوات ،

کتێبیشی بوارەکانی زانستدا هەیە و لە کوردستانی خۆیشمان هەندێ لە کتێبەکانی جێگای بایەخی مامۆستایانە ، وەکو وتمان کتێبی زۆرن لەوانە: سبحات القدس کە باسی طبقات الصوفیة دەکات ، هەروەها تەفسیری قورئانی هەیە و شەرحی هەیە لەسەر کتێبی: فصوص الحکم ی ابن عربي و شەرحی لەسەر الکافیة ی ابن الحاجب یش هەیە.. بەڵام ئەوەی کە زۆرێك لە خوێنەیری کتێبەکانی دەربارەی نازانن ، یان دەیزانن و باسی ناکەن ئەوەیە:

- مەلا جامی سۆفیەکی توندڕەو بووە لەسەر ڕێڕەوی الحلاج و ابن عربي و باوەڕی تەواوی بە (وحدة الوجود) و (الحلول ) هەیە کە حەلاجی لەسەر کوژرا.

- زیادەڕەوی زۆری هەیە دەربارەی جەلالی ڕۆمی و لەو کتێبانەی کە باسی مێژووی مەولانا دەکات باس لەوە دەکەن کە جاری وا بووە چەند بڕگەیەکی مەسنەوی لە جیاتی قورئان لە ناو نوێژدا خوێندووەتەوەو پاساویشی بۆی هێناوەتەوە!

-لە بابەتەکانی عەقیدەدا بە روون و ئاشکرا لادانی هەیە ، بەڵام زانایەکی گەورەش بووە لە بوارەکانی نحو و صرف و بلاغة و بواری تر و کتێبەکانی جێگای بایەخن.

# ( د.عەلی شەریعەتی )



ناوی (علي محمد تقي شريعتي مزيناني)ە ، لەساڵی ١٩٣٣ لە گوندێکی نزیك دەڤەری خوراسان لە ئێران لە دایکبووە، پاش تەواوکردنی خوێندن لە کولێژی ئاداب ، لە گەڵ نێردەیەکدا کاندید کرا بۆ گەشتی خوێندن بۆزانکۆی سۆربۆن لە فەرەنسا ، لەوێ توانی دوو بڕوانامەی دوکتۆرا بە دەست بهێنێ، یەکێکیان لە زانستی کۆمەڵناسی و ئەوی تریان لە ئایین ناسی.

عەلی شەریعەتی هەر لەسەرەتای لاویتی سەرگەرمی سیاسەت بوو ، سەرەتا لەگەل (محمد مصدق) کاری کرد ، کاتێکیش لە فەرەنسا بوو هەندێ چالاکی سیاسی لەوێ هەبوو، بۆ نموونە بەشداریکردنی لە خۆپیشاندانێکی پشتگیری بۆ یەکەم سەرەك وەزیرانی کۆنغۆ (پاتریس لۆمۆمبا ) کە لە لایەن دەزگاری هەواڵگری بەلجیکا تیرۆر کرا ، ئینجا کاتێك لە فەرەنسا گەڕایەوە بۆ ئێران لە ساڵی ١٩٦٩ حوسەینییەی (الإرشاد ) ی دامەزراند،

بە مەبەستی پەروەردەکردنی گەنجان وئاراستەکردنیان، لە ساڵی ١٩٧٣ حوسەینییەکە داخرا وخۆی و باوکی بۆ ماوەی یەك ساڵ و نیو زیندانی کران کە دوا جار بە کاریگەری هەندێ هەوڵ وداکۆکی نێودەولەتی و بەتایبەت هەندێ هەوڵی سیاسەتمەدارانی جەزائیری ئازادکران، چەند جارێکی تریش لە سەردەمی ڕژێمی شاە زیندان کراوە.

شەریعەتی خاوەنی ژمارەیەکی زۆرە لە کتێب و هەندێ سەرچاوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لە حەفتاکاندا چەند ملیۆن نوسخەیەك لە کتێبەکانی فرۆشراوە ، لەوانە:

**(العودة إلى الذات ،الحسين وارث ادم ، الإسلام والإنسان ،التشيع العلوي والتشيع الصفوي، فاطمة هي فاطمة ، النباهة والاستحمار،مسؤلية المثقف ،بناء الذات الثورية ، دين ضد دين ، الأمة والإمامة ،الشهادة .أبي.. أمي.. نحن متهمون...**

شەریعەتی نەیارێکی سەرسەختی ڕژێمی شاە بوو، ئەوانیش بە کەسێکی کاریگەر و ترسناك تەماشایان دەکرد و حسابیان بۆ دەکرد، چونکە بیرۆکەکانی لە ناو گەنجاندا لە ئێران بەردەوام لە پەرەسەندندا بوو، هاوکات بە بڕوای هەندێ لە کەسایەتی و لێکۆڵەرەوان بە سەرکردەیەکی سروش بەخش دانراوە بۆ شۆرشی ئیسلامی ئێران، هەرچەندە شەریعەتی دوو ساڵ پێش هەڵگیرسانی شۆرشەکە لە دونیا دەرچووە، هەر بۆیە هەندێك بە عەقڵی هەڵسوڕێنەری شۆرشەکە ناساندوویانە، ستایشی زۆریش کراوە لە لایەن هەندێ لە سەرانی شیعەوە وەکو خامینەئی و، ڕەفسەنجانی و، ئەحمەد خومەینی و، موسی الصدرو، طالقانی.

بە کورتی شەریعەتی یەکێکە لە کەسایەتیە ناودارە گەورەکانی شیعە لەم سەردەمەدا ، سەرەڕای جیاوازی کەسایەتییەکەی کە ئەستەمە لە گەڵ هیچ کەسایەتییەکی تری شیعەدا بەراورد بکرێت ، بەڵام ڕاستی کەسایەتی شەریعەتی لە ڕووە ئایینیەکەیەوە بە باشی ڕوون نییە لە لای ئەهلی سوننەو، بگرە لای شیعەکانیش بەڕاددەیەك کە هەندیکیان زۆر ستایشی دەکەن و، لەبەرانبەردا هەندێکی تریان تەکفیری دەکەن، هۆکاری ئەو تێکەڵ بوونەش دەگەڕێتەوە بۆ:

١-ئەو هەمووڕەخنەی شەریعەتی ئاڕاستەی فیکری شیعەکانی کردووە و هەندێ لە بیروباوەڕەکانی ئەوانی بە ئەفسانە ناوبردووە، هەروەها لە کتێبەکانیدا جۆرێك لە ڕەخنەو بێزاری دەردەکەوێت لە دامەزراوە فەرمییەکانی شیعە وئەوانەی پێیان دەوتریت پیاوی ئایینی.

٢- ڕەخنەگرتنی شەریعەتی لە دەولەتی سەفەویەکان کە لەسەرەتای سەدەی دەیەمی کۆچی ئێرانیان کرد بە دەوڵەتێکی شیعە و جیاوازیکردنی لە نێوان شیعەگەرای سەفەوی و عەلەوی، یان شیعەگەرای سوورو ڕەش.

٣-هەندێ وتەی باش وئەرێنی هەیە دەربارەی هەندێ لە هاوەڵان و زانایانی ئەهلی سوننەت بە پێچەوانەی بۆچوون وبیروباوەری شیعەکان.

٤-بانگەشەکردنی بۆ بیرۆکەی نزیکبوونەوە (التقريب) لە نێوان سوننە و شیعەدا.

ئەوەی کە شاراوە نییە شەریعەتی هەر زوو کەوتە ژێر کاریگەری هزری مارکسییەکان و بە بیری سۆشیالیزمی سەرسام بوو،

لەوانەشە سەرەتای کاریگەر بوونی بە کۆمۆنیستەکان لەو کاتەوە بێت کە پەیوەندی کرد بە کۆمەڵەی (نهضت خدابرستان سوسیالیست)، هەروەها شەریعەتی هاوسەرگیری کرد لە گەڵ خوشکی سەرکردەیەکی کۆمۆنیستی ئەندام لە پارتی (تودە) ی چەپ ، کاتێکیش لە فەرەنسا بوو پەیوەندی لەگەل چەپەکان هەبوو ، لەگەڵ هەواری بومیدیەن یش پەیوەندییەکی تایبەتی بوو ، جگە لەوەش بەردەوام ڕۆژنامەو گۆڤاری چەپەکانی دەخویندەوەو، کتێبی (حرب العصابات) گیڤارا شی وەرگێڕا. جگە لەوەش پەیوەندی لەگەل جان پۆڵ سارتەری فەیلەسوفی وجودی بە ناوبانگ هەبوو، کتێبیکیشی لە کتێبەکانی سارتەر وەرگێڕابووە سەر زمانی فارسی ، لە گەڵ گەرانەوەشی لە فەرەنسا بۆ ئێران پەیوەندی باشی لەگەڵ سەرانی موجاهیدین خەلقی کۆمۆنیستی دا هەبوو، زۆریش پێیان سەرسام بوو ، پێشتریش ڕۆمانێکی (عبد الحميد جودة السحار )ی بە ناونیشانی:"أبو ذر الغفاري: الاشتراكي المؤمن"."أبو ذر، خدابرست سوسیالیست". وەرگێڕابووە سەر زمانی فارسی.

بەڵام لەبەر ئەو ڕۆڵە دیارەی کە هەیبوو لە سەردەمی شاە لە دژایەتی ڕژێمەکەی، دەبینین کەسایەتییەکی وەکو خومەینی خۆی لە قەرەی ڕەخنەگرتن لە شەریعەتی نەداوە ، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لەلایەن (مرتضى المطهري) بە هۆی لایەنگری تەواوی شەریعەتی بۆ بۆ هەندێ لە بیروباوەرەکانی کۆمەنیستی و سۆشیالیزمی تەکفیر کرا و، زۆرێك لە شیعەکان حوسوینییەکەی شەریعەتییان بە کوفرستان واتە: مۆڵگای بێ باوەڕی ناو دەبرد.هاوکات هەندێ زانای تری شیعەش زۆر بەرگرییان لێ دەکرد وەکو (طالقاني).

شەریعەتی لە لایەکەوە بەرگری لە شیعە دەکرد و داوای خاوێن کردنەوەو پاڵاوتنی ڕێڕەوی شیعەی دەکرد لە لادان ودرۆو ئەفسانە ، لە لایەکی تریشەوە باوەڕی بە بیری سۆشیالیزم و شیوعییەکان هەبوو ! لە ڕاستیدا شەریعەتی نەك تەنها کۆکردنەوەی نێوان شیعەگەرایەتی و سۆشیالیزمی لەلا ئاسایی بوو ، بەو پێیەی ئەو بانگەوازی بۆ ئیسلامێکی پێشکەوتنخوازی ڕەخنە ئامێزدەکرد ، بەڵکو ئەو ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ تێهەڵکێشکردنی سۆشیالیزم لە گەڵ بنەما پێشکەوتنخوازەکانی ڕێڕەوی شیعە وەکو خۆی دەڵێت.

بەمەش دەکرێت بەو دەرئەنجامە بگەین کە شەریعەتی نەك هەر تەنها بە تێگەیشتنێکی مارکسیزم لە ئایین تێگەیشتبوو، بەڵکو ئایین و شیعەگەرایەتی - بەشێوەیەك لە شێوەکان - کردبوو بە ئامرازێك بۆ تێپەراندنی مارکسیەت بۆ هزری خەڵکی.

لە ڕاستیدا عەلی شەریعەتی بە هۆی پسپۆڕییەکەی لە بواری کۆمەڵناسی و کاریگەری ڕاستەوخۆی ئایین لەسەر کۆمەڵگا، زانیارییەکی زۆری هەبوو ، خاوەنی تێگەیشتن و عەقڵێکی زۆر گەورە بوو، مەبەستیشی ئەوە بوو ئایین بەکاربهێنیت بۆ هوشیارکردنەوەی خەڵکی بە پێی ئەو ڕێڕەوەی خۆی باوەری پێی بوو، کە بێگومان تیگەیشتنی شەریعەتی بۆ ئاییین و بۆ مەزهەبی شیعە زۆر جیاواز بوو لە تیگەیشتنی هەر شیعەیەکی تر، من لەبەدواداچوونمدا بۆ تێگەیشتن لەم بیرمەندە، سەرەڕای کاریگەر بوونی بە سۆشیالیزم و شیوعی و وجودییەکان ، بەڵام لە کۆتاییدا بە پێناسەیەکی تایبەت دیندار بووە و باوەری بە مەزهەبی شیعە بووە، لەوانەیە باوەری بە زۆر وردەکاری نەبوو بێت،

لەوانەشە ئەو حوسوینییەی کە لە پاش گەڕانەوەی لە فەرەنسا دایمەزراند خۆی لە ناخیدا باوەری پێنەبوو بیت و وەکو ئامراز و هۆکارێك ئەو هەنگاوەی هەلگرتبیت لە پێناو هۆشیار کردنەوەی خەلکی وڵاتەکەی، بەڵام بێگومان بە نیازبووە چاکسازی گەورە لەو مەزهەبە ئەنجام بدات بە پێی بنەماکانی بیرکردنەوەو قەناعەتی خۆی کە تا ڕادەیەکی زۆر ڕەنگ و تامی سۆشیالیزم واڵ بوو بەسەریدا. ئەو وێڕای ئەوەی لە هێڵە پانەکاندا لە گەل شیعەکاندا ناکۆك نەبووە، بەڵام وا دیارە دەمارگیری نەبووە بۆ ئەو ڕێڕەوە و لە کاتی پێویستدا ڕەخنەشی لێیان گرتووە، ئەمەش بووەتە هۆی دابەش بوونی تێڕوانینی سەرانی شیعە بۆ ئەو بیرمەندە.

ئینجا بێگومان عەلی شەریعەتی ڕێڕەوی ئەهلی سوننەی پێ باش نەبووە و بەهەڵەی زانیوەو، ڕێڕەوی شیعەشی - وێڕای ڕەخنەکانی - بۆ شوێنکەوتن بە ڕاست تر زانیوە ، لە کتێبی (التشيع العلوي والتشيع الصفوي)لاپەرە ٧٦ - ٧٧ دەڵێت:

"إن الخلاف بين الشيعة والسنة هو في الأساس خلاف فكري وعلمي وتاريخي يرتبط بطريقة فهم حقيقة الإسلام، وكل ما يدّعيه الشيعة في هذا المجال – وهو ادّعاء وجيه – أنه ينبغي لمعرفة حقيقة الإسلام الاقتداء بأهل بيت النبي وعلي (ع) لأجل أن تكون المعرفة مباشرة ومن دون واسطة، وهذا بحدّ ذاته كلام معقول، كما يدّعي الشيعة أن مواصلة طريق الرسالة وروحها بعد النبي مرهونة باتباع علي (ع) والاعتراف به خليفة بعد النبي دون غيره ممّن عجزوا عن مواصلة الرسالة بروحها حتى آل أمر المسلمين إلى ما آل إليه مما يعرفه الجميع"

هەلوێستی شەریعەتی دەربارەی هاوڵان بە شێوەیەکی گشتی وەکو هەر شیعەیەکی ترە ، کە وەکو کۆمەڵێك خاوەن بەرژەوەندی و خەڵکی لادەرو پیلانگێڕی دوور لە بنەماکانی ئایین و زەوتکەر بۆ مافی خیلافەت لە عەلی لە دژی ئیسلام تەماشایان دەکات ، بەڵام سەرەڕای ئەوەش شەریعەتی نکۆڵی دەکرد لە جنێودان بە هاوەڵان و هەندێ جار ستایشی عومەری دەکرد ڕەزای خوای لێبێت، شەریعەتی دەڵێت:

"إن منطق عليٍّ لم يسوغ له الإساءة إلى عمروالتقليل من شأنه، بالرغم من إهدارحقوقه وجعله حبيس الداربتواطؤ سياسي بين عمرو أبي بكر، بل إنه لم يتنكّرللخدمات التي قدّمها عمرللدولة الإسلامية لأنه لا يريد أن يغمط حق الرجل على خلفية أخذ الخلافة منه بغيرحق" التشيع العلوي و التشيع الصفوي/١١٦-١١٧..

بەڵکو جاروبار دەبینین شەریعەتی ستایشی هەندێ لە زانایانی سوننە دەکات ، کە لە وردبوونەوەدا دەردەکەوێت ستایشی ئەوانەی کردووە کە هەڵوێستیان نەرم و (متساهل) بووە بەرانبەربە شیعە، یان لەو کەسانە بوونە کە بانگەشەی نزیکبوونەوەی نێوان هەردوو مەزهەبی سوننەو شیعەیان کردووە، وەکو: عبد المجيد سليم و،شەیخی پێشووتری ئەزهەر محمود شلتوت کە ئەو پێی وابوو مەزهەبی شیعە وەکو هەر مەزهەبێکی تری سوننەکان وایە بۆ خوا پەرستن. هەروەها ستایشی ئەو زانایانە دەکات کە ستایشی شیعەکانیان بە باشی کردووە.

هەڵوێستی شەریعەتی لە دەوڵەتی سونی لە ئیسلامدا لە درێژایی مێژوودا، هەمان هەڵوێستی شیعەکانە کە وای دەبینن دەوڵەتێکی ستەمکاروگەندەڵ بووە، چونکە دانیان بە مافی پێشەوایەتی و ئیمامەت بۆ شیعەکان نەناوە، هەموو ئەو دەوڵەتانەش لە سەردەمی ڕاشیدین تاکو عوسمانییەکان، لە دیدی عەلی شەریعەتییەوە، لەسەر بنەمای زەوتکردنی مافی عەلی و نەوەکانی درووست بوونە، شەریعەتی لە هەمان سەرچاوەی پێشوودا دەڵێت:

"تمكن جميع المستكبرين وطواغيت الزمان وأصحاب البيوتات من العرب والعجم والترك والمغول والتتار من بلوغ سدة الحكم والاستواء على مسند خلافة النبي ما عدا آل النبي وأهل بيته من أئمة الحق والهدى"

دەربارەی بەنی ئومەییە دەڵێت: "أما بنو أمية فصحيح أنهم يكنّون عداء تاريخيا للإسلام، وكل المصائب التي جرت على الدين كان لهم فيها اليد الطولى.."، دەربارەی دەوڵەتی عوسمانیش دەڵێت: "لا ينبغي الشك هنا في أن الحكومة العثمانية كانت حكومة فاسدة، ولم تكن تليق بحمل وسام الحكومة الإسلامية". بەڵام هاوکات لە ڕوانگەیەکی سیاسییەوە دەبینین لە جێگەیەکی تردا خۆزگە دەخوازێت کە( صلاح الدين) لە فەلەستین زیندوو بێتەوە و، خالیدی کوڕی وەلید جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شمشێرەکەی لە دژی ڕۆمەکاندا هەڵکێشێت.

هەروەها شەریعەتی لەوانەیە لە هەموو شیعەکان بەوە جیابێتەوە، کە ڕەخنەی توندی هەیە لە دژی دەوڵەتی سەفەوییەکان و پێی وایە ئەوان زیانیان بە مەزهەبی شیعە گەیاندووەو،

پێویستە ئەو بیرۆکە گومڕایانەو توندڕەوانەیان جارێکی تر لەسەر بیری شیعە لابدرێت ، شەریعەتی لە ڕوانگەی بیرکرنەوەی سۆشیالیزمی خۆیەوە پێی وایە دەوڵەتی سەفەوی ئەوپەڕی خراپەیان بەرانبەر مەزهەبی شیعەکان کردووە، کاتێك لە مەزهەبێکی شۆڕشگێڕانەی نکۆڵیکار لە ستەم.

کردوویانە بە مەزهەبێکی فەرمی بۆ خەڵکی کە بە زەبری هێز بەهرەمەند بووە لە پشتگیری دەوڵەت و فەرمانڕەواکان ، ئەو دەڵێت:

(للتشيع حقبتان تاريخيتان، بينهما تمام الاختلاف، تبدأ الأولى من القرن الأول الهجري حيث كان التشيع معبّرا عن الإسلام الحركي في مقابل الإسلام الرسمي والحكومي الذي كان يتمثل في المذهب السني، وتمتد هذه الحقبة إلى أوائل العهد الصفوي، حيث تبدأ الحقبة الثانية والتي تحول فيها المذهب الشيعي من تشيع حركة ونهضة إلى تشيع حكومة ونظام"

بەڵام ئەم بۆچوونەی شەریعەتی لەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەو پێی وایە سەفەوییەکان زیانیان بە ڕێڕەوی شیعە گەیاندووە و لاوازیان کردووە و بوونەتە ڕێگر لەبەردەم خەڵکیدا کە بەشیوەیەکی ڕاست و ڕەوا ببنە شیعە ، لەم هەڵوێستەشیدا ئەبینین شەریعەتی وەکو پارێزەرێك و خاوەن هەڵوێستیك لەسەر مەزهەبی شیعە ڕەخنە لەوان دەگرێت ، چونکە ئەو شانازی بەوە دەکرد کە زۆر دڵسۆزی ڕێڕەوی شیعەیە و هەرچی بەرهەمێکی نووسین و تاری ئەو کە جێگەی ڕەخنەیە بەلای هەندێکەوە، مەبەستی بەرژەوەندی و سەروەری شیعەکانە ، شەریعەتی دەڵێت:

" أما أنا فتشهد جميع آثاري المطبوعة والمسموعة والتي هي الآن في متناول الجميع بأنها كانت تدور في الغالب على محور واحد هو الدفاع عن هذا المذهب. ويعزز ذلك أن أساس نظرتي الفلسفية والاجتماعية تبتني على رؤية شيعية واضحة، وكان أول كتاباتي صدر قبل ثمانية عشر عاما حول (أبي ذر) وآخرها كتاب (الشهادة رسالة الحسين) و(الدعوة رسالة زينب)، وإن ميولي الشيعية واضحة جدا، سواء في هذه الكتب أو في غيرها من القضايا الاجتماعية"..

ئاساییە بەلامەوە و بەڵکو بە پیویستی دەزانم بڵێم : وردبوونەوە و توێژینەوەی بەرهەمەکانی عەلی شەریعەتی ئاسان نییە ، چونکە بۆ نموونە لە کتێبێکی گرنگی وەکو کتێبی (العودة إلى الذات) - کە بە پێی بۆچوونی هەندێ لە توێژەرە سوننییەکان، لەوانەیە گرنگترین کتێبی شەریعەتی بێت ، لە هەموو لاپەڕەیەکیدا زیاتر لە بیرۆکەو بۆچوونێکی تایبەتی ئەو بیرمەندەی تێدایە، بەڵام من لەو بڕەی توانیم بیخوێنمەوە لەبەرهەمەکانی و، ئەو سەرچاوانەی دیراسەیان کردووە چی لە ئەهلی سوننەت - کە کەمن ئەوانەی ئاماژەیان پێ کردووە - یان ئەوانەی لە ناوخۆی مەزهەبی شیعەوە باسیان کردووە ، کە دوو هەڵسەنگاندنی دژ بە یەکیان بۆ کردووە ، بەم دەرەنجامە سەرەتاییانە گەیشتم:

١- شەریعەتی بیرمەندێکی خاوەن توانای فیکری و فەلسەفی تایبەت بووە، کتێبەکانی زۆر داهێنان و بیرۆکەی ڕۆشنبیری ورد و ئاماژەی فەلسەفی و پێناسەی گرنگ لە خۆ دەگرن، بەڵام تێگەشتن لە بەرهەمەکانی ئاسان نییە و تەنها ئەوانەی ئاستێکی باڵایان هەیە دەتوانن لە مەبەستەکانی تێبگەن ، چونکە تێڕوانینەکانی زۆر جار فەلسەفە ئامێزن.

٢- شەریعەتی کەسێکی شۆڕشگێڕ بووە وبۆ ئەم مەبەستەش بە شێوەیەکی گشتی باوەڕی بە ڕێبازی فیکری ڕۆژئاوایی بووە ، بە شێوەیەکی تایبەتیش باوەری تەواوی بە بیری سۆشیالیزم بووە ومارکسییەتی بە میکانیزمێکی گونجاو بینیوە بۆ مامەلە کردن لە گەل تاك و کۆمەڵگا و هۆشیارکردنەوەیان و، لەو بارەوە هەوڵ و کۆششی زۆری هەبووە و پەیوەندی لە گەڵ سەرانی وجودی و شیوعییەکانی سەردەمی خۆی هەبووە، وەکو: جان پۆڵ سارتەر و، هەواری بومیدیەن و، سەرکردەکانی موجاهیدین خەلقی ئێرانی.

٣- سارتەر سەرسام و موعجیب بووە بەشەریعەتی و، وتوویەتی : ئەگەر بڕیار بووایە دینێکم هەڵبژاردایە - کە سارتەر باوەری بە دین نەبووە - ئەوا دینەکەی عەلی شەریعەتیم هەڵدەبژارد.

٤- سەرەڕای ئەوەی بە تەواوی لە ژێر کاریگەری فیکری مارکسیزم بووە، بەڵام بە پێی پێناسەیەکی تایبەتی خۆی و، بێ دەرچوون لە بنەما سەرەکییەکانی ڕێڕەوی شیعەکان، ئەو هەمیشە شیعە بووەو جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە کە جگەرسۆز و بەئەمەك بووە بۆ ئەو مەزهەبە.

٥- ڕەخنەی هەبووە لە پیاوانی ئایینی شیعەو بە تایبەتی ڕەخنەی لەدەوڵەتی سەفەوییەکان هەبووە کە زیانیان بە مەزهەبی شیعە گەیاندووە و ناشیرینیان کردووە، لە ڕاستیدا ڕەخنەکانی شەریعەتی لە مەزهەبی شیعە، دەچێتەی خانەی رەخنەی بونیاتنەرو، وا دیارە ویستوویەتی بە میکانیزمێکی سۆشیالیزمی چاکسازی لە کۆمەڵگای ئێرانی شیعە مەزهەبدا بکات.

٦- وەکو زانایەکی کومەڵناس، کە کاری لەسەر کۆمەڵگا کردووە، خاوەنی کۆمەڵێك ئامرازو کەرەستەی مەعریفی زەبەلاح بووە ، هۆشیارییەکی زۆری هەبووەو، هەوڵی داوە ئەو هۆشیارییە بە کۆمەڵگا بگەیەنێت، بەڵام وەکو هەندێ لە توێژەرەوان دەڵێن: شەریعەتی هۆشیارییەکەی وەکو جەستەیەکی زۆر گەورە بووە کە قاچەکاتی بریتی بن لە دەنکە شقارتە! لەو ڕووەی کە نەیتوانیوە پێیان ڕێ بکات، هەر بۆیە زانیارییەکانی لە ئاستێکی نەزەریدا ماونەتەوە.

٧- مەگەر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ئەگینا نەسەلمێندراوە کە شەریعەتی عەقڵی هەڵسوڕێنەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران بووبێت ،یان گوایە سرووش بەخشی سەرانی ئەو شۆڕشە بووبێت، چونکە سەرباری ئەوەی کە گومان نییە لەوەی شیعەبووە، بەڵام میکانیزمی ئیشکردنی لە گەڵ مەلاکاندا زۆر جیاواز بووە ، ، تەنانەت خومەینی هیچ ئاماژەیەکی بە ڕاشکاوی نییە دەربارەی شەریعەتی، ئەگەر چی ڕەخنە لێ نەگرتنی جێگای سەرنجە و لەوانەشە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە شەریعەتی لەو هەل و مەرجە ڕۆڵی بەرچاوی دژ بە ڕژێمی شاە هەبووە و لە ئێراندا خاوەن جەماوەری بەرفراوان بووە ، بۆیە خومەینی لێی بێ دەنگ بووە.

٨- شەریعەتی سەرەڕای ئەوەی ستایشی هەندێ هاوەڵانی وەکو عومەری کوری خەتتاب رەزای خوای لێبێت کردووە، هەروەها ستایشی هەندێ لە زانایانی سوننەی کردووە کە هەڵوێستیان نەرم بووە بەرانبەر بە شیعە، بەڵام ئەهلی سوننەتی وەکو لایەنی تیۆری و سیاسی پراکتیکی تێکرا بە هەڵە زانیوەو لە بەرانبەریشدا کێشەی شیعەی بە کێشەیەکی ڕاست و ڕەوا بینیوە، لە گەڵ هەندی جیاوازی میکانیزمی و ڕواڵەتی کە هەیبووە.

٩- شەریعەتی باوەری بە ململانێی نێوان شیعەو سوننە نەبووە و پێویستییەکی نەبینیوە بۆ پێکدادانییان.

١٠- شەریعەتی لە هەندێ لە کتێبەکانیدا وێڕای ڕەخنە گرتنی توندی لە سەفەوییەکان و زانا گەورەکانی شیعە وەکو مەجلیسی خاوەنی( بحار الأنوار) کە تۆمەنباری کردووە بەوەی وەکو سوننیە ئومەوییەکانە ئەویش ، بە هەمان شێوە ڕەخنەی لە ڕۆژهەڵاتناسەکان و مارکسییەکانیش گرتووەو هەندێ لە بیروباوەرەکانیانی گەنگەشە کردووەو بەرپەرچی داونەتەوە، ئەمەش ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی عەلی شەریعەتی هەوڵی داوە بە ویژدانەوە بنووسێت و بکۆڵێتەوە، هیچ نەبێت بە پێی بەرنامەو پلان و ڕێبازی خۆی کە باوەڕی پێی هەبووە.

١١- شەریعەتی باوەری بە دەولەتی دینی نەبووە بە هیچ شیوەیەك، هەر بۆیە شەرعییەتی دەولەتی سەفەوییەکان رەت دەکاتەوەولە کتێبەکانیدا بە توندی ڕەخنەییان لێ دەگرێت.

١٢- شەریعەتی خویندنەوەی بۆ مێژوو، بۆ ڕووداوکان، بۆ کۆمەڵگا،بۆ دیاردە گەورەکان، جۆرێك لە ناڕوونی پێوە دیارە و بە پێی پێوەرەکانی قورئانیش نەبووە، تێڕوانین و لێکدانەوەی بۆ ئەو دیاردانە، لە دیدێکی مارکسی و حەتمییەتی مێژوویەوە بووە، تەکفیر کردنی هەندێ لەسەرانی شیعەکانیش بۆ ئەو ڕەنگە لەم ڕوانگەوە سەرچاوەی گرتبێت.

١٣- شەریعەتی بەو تایبەتمەندیانەی کە هەیبووە، بەو دیدو تێڕوانینەی کە لەسەری بووە و کاری پێ کردووە، کەسێکی تری هاوشێوەی لە ناو شیعەکاندا نییە،

تەنانەت لە کەسێکی وەکو (موسى الموسوي )و (علي الوردي) ش جیاوازبووە، هەندێ لە توێژەرەکان پێیان وایە لە ڕووی توانای فیکری و فەلسەفی وبەدەر لە ئینتیمای مەزهەبی وبیرو بۆچوونەکانی ، جۆرێك لە نزیکی لە نێوان کەسایەتیەلی شەریعەتی و محمد قطب دا هەیە.

١٤- شەریعەتی لەو بەرنامەی کە هەیبووە و، لە هەوڵەکانیدا بۆ چاکسازی لە ئێراندا سەرکەوتوو نەبووە ، نەشیتوانیوە بیرۆکەکانی لە ناو کتێبەکانی دەربکات بۆ سەر زەمینەی واقیع لەووڵاتە، لە کۆتاییشدا - لە ژیانیدا و لە پاش مردنیشی - بەکارهێنراوە لە لایەن شیعەوە بۆ هەندێ مەبەست و مەرامی تایبەت.

١٥- کەسانێکی زۆر بە عەلی شەریعەتی سەرسامن و پێوەی ئەنازن، مولحید و وجودییەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە جان پۆڵ سارتەر، عەلمانییەکان بە گشتی، قورئانییەکان وەکو جمال البنا و عدنان إبراهيم کە بە شێوەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش لە یەکیك لە وتارەکانیدا ستایشی دەکات ، ئەهلی سوننەش ژمارەیەکی بەرچاویان پێی سەرسامن - بە تایبەتی ئەوانەی کە لە ڕووی فیکرو بیروباوەڕەوە کێشەیەك لە مەزهەبی شیعەدا نابینن، یان ئەوانەی بە ناو سوننین و هەستیاری زۆریان لە گەڵ ئەو زاراوایە هەیە، یان ئەوانەی کەوتوونەتە ژێرکاریگەری هزری شیعەو هەمیشە ڕەخنەیان لە مێژووی ئیسلامی و سیستەمە سیاسیە حوکمڕانەکانی سوننە لە درێژایی مێژوودا هەیە، تەنانە کتێبەکانی وەردەگێڕدرێت و دەخوێنرێتەوە وەکو هەر بیرمەندێکی تری سونی مەزهەب.

١٦- شەریعەتی ئەگەر وەکو بیرمەندێك و زانایەکی کۆمەڵناس و نووسەرێکی بە توانا تەماشا بکرێت وتەنها لەو ڕوانگەوە هەڵبسەنگێنرێت ،

بێگومان سەنگینی خۆی هەیە و ژمارەیەکی گرنگە لە گۆڕەپانی فیکر و دونیای نووسیندا، بەڵام ئەگەر بە پیوەری قورئان وسوننەت و پێوەرەکانی بیروباوەری ئیسلامی وبنەما و بنچینە جێگیرەکانی ئیسلام تەماشا بکرێت ، لەو حاڵەتەدا کەسێکە خاوەن بیرێکی نامۆیە بە قورئان و بە سوننەت و بناغە نەگۆڕەکانی ئیسلام، بەو پێیەش بە هیچ شێوەیەك ناکرێت وەکو پێشەنگ و کەسی متمانە پێکراو مامەڵەی لە گەل بکرێت، بەلکو کتێبەکانی سەرەڕای گرنگییان جۆرەها بیروبۆچوونی جیاوازی ئیسلامی و شیعی و سونني و فەلسەفی و مارکسی و سۆشیالیزمی و ڕۆشنبیری گشتی تێدایە ، هەرگیز ئامۆژگاری کەسی سەرەتایی ناکرێت بیانخوێنیتەوە ، مەگەر بە سەرپەرشتی مامۆستایەکی شارەزا کە بە جوانی حەق و ناحەق لە ڕوانگەی شەرعی خوا لە یەکتر جیا بکاتەوە ، بۆیە ئەو نووسەر و بیرمەندێکە گرنگییەکەی لە دەرەوەی بازنەی ڕێنوێنی ئیسلامی سەرچاوە دەگرێت.

شەریعەتی پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٥ بە بە فشارێکی نێو دەوڵەتی و بە ڕوولێنانێکی جەزائیری لە زیندان ئازادکرا، لە ساڵی ١٩٧٧ڕێگەی پێدرا بچێت بۆ بەریتانیا و پاش سێ هەفتە لەشاری لەندەن بە کوژراوی لە شوقفەکەی خۆیدا دۆزرایەوە، تۆمەتباری سەرەکیش لە کوشتنیدا دەزگاری هەواڵگری ڕژێمی شای ئێران بوو، بەڵام بەریتانیا بە فەرمی لە ڕاپۆرتی نەخۆشخانەی ( ساوث هامبتون) ڕایانگەیاند کە هۆکای مرنەکەی جەڵتەیەکی کوشندەی دڵ بووە. ئێران ڕازی نەبوو پێشوازی لە تەرمەکەی بکات ، بۆیە تەرمەکەیان بۆ دیمەشق گواستەوەو لە گۆڕستانی (السيدة زينب) لە دیمەشق بە خاك سپێردرا، لەبەر ئەوەش کە موسى الصدر - برادەری گیان بە گیانی شەریعەتی - نوێژی لەسەر جەنازەکەی کرد، ڕژێمی شاە ڕەگەزنامەی ئێرانی لە ناوبراو وەرگرتەوە.

# ( غاندی )



ناوی **(موهانداس کرمشاند غاندي )** یە،سیاسەتمدارو سەرکردەیەکی دیارو بەناو بانگی هیندستانە، لە ساڵی ١٨٦٩ز لە ویلایەتی گوجارات لە هیندستان لە دایکبووە، لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و سیاسەتمەدار بووە، باوك و باپیریشی لە میرنشینی بوربەندەر سەرەك وەزیران بوونە، لەسەرەتای لاوێتی و لە ساڵی ١٨٨٢ز چووەتە بریتانیا و یاسای خوێندووە، دواتر بۆ ماوەی بیست ساڵ لە ئیفریقیا بووە، لەوێش وەکو پارێزەرێك چالاکی زۆری هەبووە، داکۆکی لە مافی هیندییەکان کردووەو، چەند ساڵێکیش زیندان کراوە.

غاندی وەکو هیندۆسییەك کەسێکی ڕووەکی (نباتي) بوو گۆشتی نەدەخوارد، کەسێکی سادە بوو تیکەڵی خەڵکی هەژاری دەکرد، باوەڕی بە توندو تیژی و شەڕ و بەکارهێنانی هێز نەبوو، دەوترێتیش ئەوەی لە ڕۆماننوسی بە ناوبانگ تۆلستۆی وەرگرتووە، چونکە ڕۆمانەکانی ئەوی دەخوێندەوەو کاریگەری لەسەری درووست کردبوو.

حیزبێکی دامەزراند و ڕۆژنامەیەکی دەرکرد، بە گشتی وەکو تیکۆشەرو داکۆکارێك لە مافی مرۆڤەکان تەماشا دەکرا.

غاندی لە سالی ١٩١٥ز گەڕایەوە هیندستان، لە چەند ساڵێکدا توانی ببێتە بە ناوبانگترین کەسایەتی وچالاکوان و داکۆکیکار لە مافی هیندییە چەوساوەکان. بەڵام جگە لەم زانیاریانە کە زۆربەی خوێنران و ڕۆشنبیران پێی ئاشنان پێویستە بوترێت:

هیندستان سەردەمانیك بوو پێش قۆناغی غاندی لە لایەن مەغۆلەکانەوە بە ئیسلام حوکم دەکرا، ئەوروپییەکانیش بەردەوام تەماحیان لەو وڵاتەدا هەبوو، بەڵام سەرکردەکانی هیندستان وریا بوون و ڕێگەیان بە ئینگلیزەکان نەدەدا پیلانیان بۆ بگێڕن، بۆیە ئەوان بیریان کردەوە لە ڕێگەی بازرگانییەوە ئامانجەکانیان لە داگیرکردنی ئەو وڵاتە جێبەجێ بکەن، بۆیە هەڵسان بە درووستکردنی کۆمپانیایەکی گەورە بۆ کەشتیوانی و بازرگانی بە ناوی:(شركة الهند الشرقية للتجارة الإنجليزية ) لەو ڕێگەشەوە و لە ماوەی چەندین ساڵ توانیان دەست بگرنە سەر بازرگانی ئەو وڵاتە و لە ڕێگەی سیخوڕەکانیانەوە لە هەموو شتیك لەو وڵاتە ئاگەدار بن، لەو سەروبەندەدا دەسەڵاتی سەفەوییەکان بە یارمەتی و کۆمەکی ئینگلیزەکان هێرشیان کردە سەر هیندستان و ئەگەرچی نەیانتوانی داگیری بکەن، بەڵام توانیان لاوازی بکەن و بشێوی تێدا درووست بکەن و بەم شێوەش لە پاش خۆیان ڕێگەیان بەتەواوەتی بۆ بریتانیا خۆش کرد و توانیان هیندستان وەکو موستەعمەرەیەکی خۆیان ڕابگەیەنن و خیلافەتی ئیسلامیشیان لابرد و کۆتاییان پێ هێنا. لێرەوە بەرەیەکی ئیسلامی بەرفراوان لە گەل کەمینەیەکی هیندۆسی بۆ دژایەتی ئینگلیزەکان درووست بوون .

ئینگلیزەکان ئەوەی پێشتر بۆیان نەدەچووە سەر ئەم جارەیان کە بوونە خاوەن هێزی سەربازی لەو وڵاتە بۆیان ئاسان بوو، بۆیە بەتایبەتی دوای ئەوەی موسوڵمانان دەستیان کرد بە چەك هەڵگرتن لە دژی ئەوان، ئینگلیزەکان شاڵاوێکی زیندانی کردنی سەرکردەکانی موسوڵمانان وهاوکات دەستیان بەرپی هیندۆسەکان نەدەهێنا، بەڵام موسوڵمانان بەم کارە سارد نەبوونەوەو بەردەوام بوون لە بەرگریکردن و لە خاك و نیشتمان و موسوڵمانان لە دژی داگیرکەری ئینگلیز...ئا لێرەوە رۆڵی هندۆسەکان دەستی پێکرد کاتێك کە ئیستیعماری ئینگلیزی پەنایان بۆ بردن و بەشێوەیەکی تایبەت رۆڵی غاندی دەستی پێکرد وەکو رۆشنبیرێك وسەرکردەیەکی هیندۆسەکان و وەکو کەسێکی دونیا نەویست! بە گوێرەی بەنامەی راگەیاندراوی، غاندی دژی توندوتیژی وشۆرشی چەکدار بوو، ئەو شۆرشەی زۆری نەمابوو دژ بە داگیرکەرانی ئینگلیز موسوڵمانان بەرووبوومەکەی بدوورنەوە. موسوڵمانان دەرکیان بەوە کرد کە بریتانیا خەریکی پاڵپشت کردنی غاندییە بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی ئیسلامی سەرلە نوێ لە هیندستان سەرهەڵنەدات، لە کاتێکیشدا بریتانیا بە تۆپ و چەکی قورس لە موسوڵمانانی دەدا، هیندۆسەکان بەرابەرایەتی غاندی بە هێمنی سەرقاڵی یاخی بوونی شارستانی بوون،

ئینگلیزەکانیش بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراو غاندییان وەکو پاڵەوانێکی نەتەوایەتی نیشاندەدا و جار جار زیندانیان دەکرد و بۆ تەواوکردنی پیلانەکە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە شێوازی (العصيان المدني) بەروبومی باشترە و بەسوودترە لە رووبەرووبوونەوەی سەربازی، موسوڵمانان زیانی زۆریان دەکرد و بە ناچاری ئاوارە دەبوون وهەڵدەهاتن بەرەو ئەفغانستان،

هەر بۆیە لە ماوەیەکی کەمدا هندۆسەکان وەکو هێزێکی کاریگەر لە گۆڕەپانەکەدا دەرکەوتن، ئینجا غاندی لە گەڵ کونسوڵی بریتانیا لە هندستان ڕێککەوتن لەسەر لە باربردنی شۆڕشی موسوڵمانان بە مەرجێك ئەو دژایەتیکردنە بە زەقی دەرنەکەوێت، لە لایەکی تریشەوە غاندی لە گەڵ موسوڵمانان سازشی دەکرد و هەوڵی دەدا ساردانیان بکاتەوە لە شۆڕشی سەربازی وبەردەوام بانگهێشتی دەکردن بۆ یاخیبوونی شارستانی، هندۆسەکان بەو شێوازە سەرکەوتنیان بە دەست هینا لە ڕێگەی ئەو سازش و گفتوگۆی غاندی لەگەل ئینگلیزەکان ئەنجامی دەدا و دواجار لە سایەی کشانەوەیەکی ڕواڵەتی بریتانیا لە هیندستان، هندۆسەکان قەوارەی خۆیان ڕاگەیاند و پاشان لە گەل ئینگلیزەکان دەستیان کرد بە لێدانی موسوڵمانان.

بەو شێوەی کە باسمان کرد غاندی لە ڕێگەی پیلان و فێڵ و دەست تێکەڵ کردن لە گەڵ داگیرکەری ئینگلیزدا وتوانی شۆڕشی موسوڵمانان بدزێت و ئاواتی سەربەخۆیی وڕاگەیاندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی بۆ موسوڵمانانی هیندستان لەبار برد.

بێگومان موسوڵمانانی هیندستانیش خۆیان جێگای ڕەخنەو لۆمەن کە بە غاندی فریویان خوارد و وادیارە باوەڕیان وا نەبووە غاندی بە کرێگرتەیەکی ئینگلیزەکان بێت، بە تایبەتی وەکو هندۆسییەك کە مەبەستی بوو خزمەتی هاودینەکانی خۆی بکات و دەوڵەتێکیان بۆ ڕابگەیەنێت.

-جیاواز لەوەش کە دەربارەی بڵاو دەکرێتەوە، غاندی بۆچوونی بەرانبەر ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) زۆر خراپ بوو،

بەڵام لە قۆناغیکی داهانوودا و لەبەر ئەو پێگە جیهانییەی بە دەستی هێنا گوتاری خۆی بە ڕواڵەت گۆڕی، ئەوەشی پێشتر ڕاگەیاندبوو کە ئیسلام ئەو دینەیە بە زەبری شمشێر و هێز بڵاوبووەتەوەو زانایانی هندستان بەرپەرچیان دایەوە لە کاتی خۆی، بە تایبەتی لە لایەن (أبو الاعلى المودودی ) کە هۆکاری دانانی کتێبی (الجهاد في الاسلام) وەکو ڕەددانەوەی ئەو وتانەی غاندی بوو.

-لە ڕاستیدا بریتانیا لەوە دڵنیا بوو کە بەرگەی جەنگی موسوڵمانان ناگرێت و، بە بەردەوامی لە هیندستان بمێنێتەوە، بۆیە زنجیرەیەك ڕێ و شوێنی گرتەبەر لەوانە درووستکردنی چەندین کوشتارگە بۆیان و درووستکردنی هەندێ بە کرێگرتەی وەکو غولام ئەحمەد قادیانی و زیندوو کردنەوەی بیرۆکەی دژایەتی سوننەت لەڕێگەی چەند کەسایەتییەکی ئیسلامی لادەری ئەو وڵاتە و، هەروەها گۆڕین و تێکدانی مەنهەجی خوێندن لە قوتابخانەکان، کە ئەمەش وای کرد موسوڵمانان لەو جۆرە حوێندنگایانە دوور بکەونەوە و،بە کارهێنانی غاندی ش چەکێکی تری کاریگەری ئینگلیزەکان بوو بۆ لاوازکردنی ئەوان و شکست پێ هێنانیان.

-غاندی کاتێك لە گەڵ فەرمانڕەوای ئینگلیزەکان (ریدینج) کۆبوویەوە، داوای سەربەخۆیی هندۆسەکانی لێکرد، ئەویش لە وەڵامدا پێی وت: ئەگەر ئێمە سەربەخۆییتان پێ بدەین موسوڵمانان ئەوە دەقۆزنەوەو دەبنە خاوەنی، بۆیە پێویستە سەرەتا هاوکارمان بن بۆ شکست هێنان بە ئەوان و دوای ئەوە داواکارییەکەتان جێبەجێ دەکەین، ئەمەش دەقی وەڵامەکەی بوو بۆ غاندی:

(إن مصدر الحركة الاستقلالية في الهند هم المسلمون ، وأهدافها بأيدي زعمائهم ، ولو أجبنا مطالبكم ، وسلمنا لكم مقاليد الحكم ، صارت البلاد للمسلمين ، وإن الطريق الصحيح هو أن تسعوا أولاً لكسر شوكة المسلمين ، بالتعاون مع بريطانيا ، وحينئذ لن تتمهل بريطانيا في الاعتراف لكم بالاستقلال ، وتسليم مقاليد الحكم في البلاد إليكم)

-ئەوەی غاندی لە گەڵ ئینگلیزەکان دەیکرد زیاتر نەبوو لە شانۆگەرییەك، کە تێیدا بریتانیا هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بوو غاندی وەکو سەرکردەیەکی ئاشتیخواز نیشان بدات و ئەو بکاتە ئامرازێك بۆ شکاندنی موسوڵمانان، غاندی بە بەهانەی ئاشتیخوازی داوای دواخستنی سەربەخۆیی هیندستان و بەرەنگاری نەکردنی داگیرکەری دەرکرد، کۆتایی ئەو شانۆگەرییەش لە ساڵی ١٩٤٨ بوو، کاتێك هندۆسەکان سەربەخۆیی خۆیان لە بریتانیا وەرگرت، پاڵەوانی ئەو شانۆگەرییەش غاندی بوو، کە تاکو ئێستاش زۆرێك لە موسوڵمانانی جیهانیش بە باشی نازانن غاندی چ ڕۆڵێکی لەوشانۆگەرییەدا بینیوە.

-لەبەر ئەوەی ئێمە لێرەدا لە میانەی ناساندنی کەسایەتی غاندی ن، پێویستە ئەوەش باس بکەین، کە ئەو کەسێکی هاوڕەگەزباز بووە ، ئەو کاتەی لە ئیفریقیا بووە پەیوەندی سێکسی لە گەڵ ئەندازیارێکی ئەڵمانی پیاو هەبووەو لە پێناویدا لە خێزانەکەشی جیا بووەتەوە و ، هەموو ئەو پەیامانەش کە بۆ ئەو مەعشوقە پیاوەی خۆی ناردووە بڵاوبووەتەوەو کە لە نامەیەکیدا پێی دەڵێت:

«**لقد استحوذت بالكامل على جسدي. هذه أقصى درجات العبودية**»!.واتە: تۆ بەتەواوی زاڵ بوویتە سەر جەستەمدا و ئەوەش بەرزترین پلەکانی پەرستراوێتییە! وردەکاری ئەم پرسەش هەمووی لە کتێبی «الروح العظيمة: المهاتما غاندي ونضاله مع الهند»دا هاتووە.

- هەروەها شایانی باسە غاندی بزنێکی بە ناوبانگی هەبووشیرەکەی دەخواردەوە و،ئەو کارەش سادەیی و خاکی بوونی ئەوی نیشان دەدا، بەڵام ئەو بزنە بەردەوام شیری مانگاو جۆرەها میوەی تازەی پێدەدرا ،هەموو هەفتەیەکیش دەبوو پزیشك ببینێ، تێچووی ڕۆژانەی ئەو بزنە دەگێڕنەوە بەشی دە خێزانی هیندی دەکرد بۆ ماوەی مانگێك.

هەروەها غاندی ئیشی زەبەلاحی بۆ دەکرا بۆ ئەوەی هەژار دەرکەوێت ، چونکە بەرنامەی کارو کارتێکردنی لە خەڵکی بەو شێوە ڕێی دەکرد، لە شەمەندەفەری پلە سێ سەردەکەوت وەکو نیشانەیەك لەسەر خاکی بوونی، بەڵام شەمەندەفەرەکە یان بەشێکی زۆری بۆ تەنها خۆی تایبەت دەکرا، بە هەژار دەرخستنی غاندی پێویستی بە خەرجییەکی یەکجار زۆر بوو.

ئەو جل و پۆشاکەی کە لەبەری دەکرد ڕاستە سادە بوو، بەڵام ئەوە پۆشاکی ئایینی بوو، بەو جل و بەرگەی ملیۆنەها خەڵکی بۆ خۆی ڕاکێشابوو، تەنانەت دکتۆر ئەحمەد شەلەبی لە کتێبی (أديان الهند الكبرى) لە غاندی دەگێڕێتەوە لە بواری فەلسەفەی پەرستنی مانگا، زۆر داکۆکی لە پەرستنی مانگا دەکرد و لە دایکی خۆی لە زۆر ڕووەوە بە چاکتری زانیوە، وەکو دەڵێت:

**(وأمي البقرة افضل من أمي الحقيقية من عدة وجوه ، فالأم الحقيقية ترضعنا مدة عام أو عامين وتتطلب منا خدمات طول العمر نظير هذا ، ولكن أمنا البقرة تمنحنا اللبن دائماً ، ولا تتطلب منا شيئاً مقابل ذلك سوى الطعام العادي . وعندما تمرض الأم الحقيقية تكلفنا نفقات باهظة ، ولكن امنا البقرة فلا نخسر لها شيئاً ذا بال ، وعندما تموت الأم الحقيقية تتكلف جنازتها مبالغ طائلة ، وعندما تموت أمنا البقرة تعود علينا بالنفع كما كانت تفعل وهي حية،لأننا ننتفع بكل جزء من جسمها حتى العظم والجلد والقرون.).**

واتە: دایکە مانگاکەم - لە چەندین ڕووەوە لە دایکی ڕاستەقینەم چاکترە، چونکە دیکی ڕاستەقینە بۆ یەك دوو ساڵێك شیرمان پێ دەدا و تا ماوین لە بەرانبەر ئەوەدا داوای پاداشتی ئەوەمان لێ دەکات، ڵام دایکە مانگاکەمان هەمیشە شیرمان پێ دەدات و لە بەرانبەر ئەوەشدا جگە لە خواردنیکی سادە داوای هیچمان لێ ناکات.

-لەو جەنگانەی کە هندۆسەکان لە دژی موسوڵمانان بەرپایان دەکرد و خوێنی موسوڵمانانی تێدا دەڕژا، غاندی بەیەك وشە دەیتوانی ئەو جەنگانە ڕاگرێت، بەڵام ئەو کارەی نەدەکرد، چونکە لەلایەکەوە خۆی دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام بوو، لەلایەکی تریشەوە لەبەر ئەوەی بەکرێگرتەی ئینگلیزەکان بوو و ڕێککەوتنەکانی لە گەڵیاندا لەوبارەوە جێبەجێ دەکرد.

-لە کتێبی "الدعوة إلى الله في أقطار مختلفة" ی (تقي الدين الهلالي) کە زانایەکی مەغریبی گەورەیە و خۆی لەسەردەمی غاندی چووەتە هیندستانو ئەوی بە دوژمنێکی گەورەی ئیسلام ناساندووە،

لەو کتێبەدا هاتووە: کە غاندی لە ڕۆژنامەی "هریجان" نووسیوێتی: **(أن الله أوحى إليه أن طهر المنبوذين وألحقهم بإخوانهم من الطبقات العليا. قال في صحيفته: "فإن سألتموني دليلا حسيا على أن الله أوحى إليَّ بذلك، أقول لكم: ما عندي دليلٌ، ولكني لا أشك في هذا الوحي.)**

واتە:من وەحیم بۆ هاتووە کە ڕسواکان - کە مەبەستی موسوڵمانانە - پاکتاویان بکەم و بەرەو چینە بەرزەکان بیانێرم. واتە: بیانکوژێت.

غاندی سەرەڕای ئەوەی بە کردار بەو شێوە بوو لە دژی موسوڵمانانی هیندستان، بەڵام هەمیشە لە گوتارەکانیدا باسی ئاشتی و پێکەوە ژیان و برایەتی دەکرد، هەر بۆیە لە ٣٠ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ لەو کاتەی بەرەو پەرەستگای نیودەلهی دەچوو، هندۆسییەکی توندڕەو بە ناوی (ناثورم جوتسی) بە سێ فیشەك غاندی لە تەمەنی حەفتا و هەشت ساڵیدا کوشت و کۆتایی بە ژیانی هێنا.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە زۆر سەرچاوەم بە کارهێناوە، لەوانە:

- رجال اختلف فيهم الرأي/أنور الجندي..
- اسطورة غاندي/دكتور خالد محمد الغيث..
- سایتی صید الفوائد وێکبیدیا و...سەرچاوەی تر.

# ( إبن سینا )



ناوی (الحسين بن عبد الله بن الحسن بن علي بن سينا) و بە ئەبو عەلی ناسراوە، فەیلەسوف و پزیشکێکی ناودارە، لە گوندێکی نزیك شاری بوخارا (ئۆزبەکستان) لە ٣٧٠ هـ (٩٨٠م) لە دایکبووە و، لە هەمەدانی ئێران لە ساڵی ٤٢٧ هـ (١٠٣٧م) وەفاتی کردووە، بە نازناوی الشیخ الرئیس ناسراوە و، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە لای ڕۆژئاواییەکان بە سەرگەورەی پزیشکان و بە باوکی زانستی پزیشك دەناسرا، زیاتر لە دوو سەد کتێبی نووسیوە، بە ناوبانگترینیان (القانون في الطب)ە ، کە تاکو ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەم لە زانکۆکانی ئەوروپا پشتی پێ دەبەسترا، هەندێ لە کتێبە پزیشکی و فەلسەفییەکانی بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراوە.

ابن سینا لە دە ساڵیدا قورئانی لەبەر بوو، فیقهو بیرکاری و زانستی تری وەرگرتبوو، هەروەها شاعیریش بووەو توانیویێتی هۆنراوە بۆ باسە زانسێی و فەلسەفییەکانی بە کاربهێنێ، بۆ نموونە دەربارەی نەفسی مرۆڤەکان دەڵێت:

**هبطت إليك من المحل الأرفع ورقاء ذات تعزز وتمنع،**

**محجوبة عن كل مقلة عارف، وهي التي سفرت ولم تتبرقع.**

**وصلت على كره إليك، وربما كرهت فر اقك، وهي ذات تفجع.**

**أنفت وما أنست، فلما واصلت ألفت مجاورة الخراب البلقع.**

ابن سینا فەیلەسوفێك و پزیشكێكی زۆر لێهاتوو بوو، تەنانەت پێش تەمەنی بیست ساڵی توانی چارەسەری نەخۆشییەكی سوڵتان (نوح بن منصور الساماني) بكات ، ئەمەش هۆكارێك بوو بۆ نزیكبوونەوەی لە كۆشكی سوڵتان و سوودمەند بوونی لە كتێبخاەكەی.

بە هۆی زیرەكی و ناوبانگی بەرفروانی و بەدەر لە بیروباوەڕە فیكری و ئاینییەكانی زۆر لایەن خۆیان بە خاوەنی كردووە، وەكو فارس و تورك و عەرەب . نەتەوە یەكگرتووەكانیش لە یادی تێپەڕبوونی هەزار ساڵ بەسەر لە دایكبوونیدا و وەكو دانپێدانانێك بە خزمەتەكانی ابن سینا، ئاهەنگێكیان لە یونسكۆ بۆ سازكرد و نوینەری وڵاتەكانی جیهانی تێدا بەشدار بوو. ابن سینا سەرەڕای ئەوناوبانگە گەورەی كە هەیەتی وزۆرێك لە نەخۆشخانەكانی جیهان بە ناوی ئەووەوە نراوە، بەڵام كەم كەس بیروباوەڕو عەقیدەی ئەو پیاوە دەزانێت چۆن بووە، بۆیە بە پێویستم زانی هەندێ ڕاستی باس نەكراو دەربارەی ئەو ناودارە بخەمە ڕوو:

-ابن سینا لەسەر عەقیدەی ئیسماعیلیەكان بووە كە فیرقەیەكی باتنی ڕۆچوو لە شیعەگەرایەتی.

-ابن (الحموي الشافعي) دەربارەی وتوویەتی: **(وقد اتفق العلماء على أن ابن سينا كان يقول بقدم العالم ونفي المعاد الجسماني ولا ينكر المعاد النفساني)** واتە: باوەڕی وابووە گەردوون دێرینەو سەرەتای نییە و مرۆڤەکان وەکو جەستە زیندوو نابنەوە لە قیامەتدا، بەڵکو وەکو حاڵەتێکی نەفسی و دەروونی زیندوو دەبنەوە.

-هاوشێوەی فەیلەسوفەکانی یۆنان و فارابی بۆچوونی وابووە خوای گەورە ئاگاداری شتە وردەکان نییە، بە ڵکو بە شێوەیەکی گشتی ئاگاداری شتەکانە، ئەمەش هۆکاری تەکفیرکردنی بوو لە لایەن زۆرێك لە زانایانەوە.

-باوەڕی وا بوو کە موعجیزەی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت بریتییە لە (قوى نفسانية) واتە: هێزگەلێکی دەروونی نەك ڕاستەقینە.

-باوەڕی وابوو هەموو ئەو قسەو باسانەی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت بۆ خەڵکی باسیان کردووە بە شێوەیەکی دەقاودەق و پڕاوپڕی وتەکانیان ڕاست نییە! بەڵکو بۆ تێگەیاندان ونزیككردنەوەی واتاکان بووە لە مێشکی خەڵکی و شێوازێك بووە لەگوتار کە لە عەقڵیانەوە نزیك بێت، بەمەش پێغەمبەرانی لە پەیامەکانیاندا بە درۆ خستووەتەوە.

-دەربارەی خوای گەورە وتوویەتی: **(( أنه وجود مطلق بشرط الإطلاق )).**

هەر خۆیشی لە جێگەی تر شەرحی ئەم قسەی خۆی دەکات و دەڵێت:

( المطلق بشرط الإطلاق لایکون موجوداً في الأعیان) واته: جۆرێکه له نکۆڵی کردن له بوونی خوای گەورە.زۆرێك لەم جۆرە قسەانەشی لە کتێبی (الشفا) دا هاتووە ، کە وانایان بە شەقا و بە دەرد و نەخۆشی ناوی کتێی شیفایان بردووە.

-بەهەشت و دۆزەخ وەکو ئەفسانەو دڵ خۆشکردنی بێ بنەما وێنا دەکات کە مەبەست لێی هاندانە بۆ چاککە کردن و دوور کەوتنەوە لە خراپە.ئەمجۆرە بیروباوەڕانەشی لە کتێبی المعاد و کتیبەکانی تری دەربارەی عەقیدە باس کردووە.

-قسەو سووکایەتی بە هاوەڵان دەکات و بە نەفامیانی زانیوە.ابن تیمیة لە مجموع الفتاوی هەندێ لەو بارەوە دەگێڕێتەوە

-أبو حامد الغزالي لە کتێبی (تهافت الفلاسفة) لە بیست مەسەلەدا بەرپەرچی ئیبنوسینای داوەتەوە، کە لە حەڤدە مەسەلەیاندا ئەوی بە موبتەدیع وەسف کردووە، لە سێ مەسەلەیشیاندا ئەوی تەکفیر کردووە، کە ئەوانەش بریتین لە:

١- کۆنی و دێرینی و نەبوونی سەرەتایەك بۆ گەردوون.

٢ -نکۆڵی کردنی لە زیندووبوونەوەی مرۆڤەکان بە جەسنەولاشەکانیان.

٣ -ئینکار کردنی ئاگادار بوون و زانستی خوا بە ڕوداوە بچووك و لاوەکییەکان، ئەمەش (ابن کثیر) لە ( البدایة والنهایة) [٤٣/١٢] باسی کردووە.

-ابن العماد الحنبلي لە (شذرات الذهب) [٢٣٧/٣] وتەیەکی (اليافعي) دەربارەی ابن سینا دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی : **(طالعت كتاب "الشفا" وما أجدره بقلب الفاء قافاً، لاشتماله على فلسفة لا ينشرح لها قلب متدين والله أعلم بخاتمته وصحة توبته).** واتە: کتێبی شیفای ئیبنوسینا م خوێندەوە حەق بوو ناوی شەقا بووایە، دڵی ئیماندار هەرگیز پێی ئاسوودە نابێت...

-(ابن الصلاح) ی شارەزووری بەهۆی ئەو بیروباوەڕانەی ئیبنو سینا دەربارەی خواو ڕۆژی دوایی فەرموویەتی:: **(لم يكن من علماء الإسلام بل كان شيطاناً من شياطين الإنس)** واتە: ئەو لە زانایانی ئیسلام نەبووە، بەڵکو شەیتانێکی نێو مرۆڤەکان بووە.

-(ابن تيمية) لە زۆر شوێنی کتێبەکانیدا بەرپەرچی ابن سینا ی بە توندی داوەتەوەو بە هەمان شێوەی زانایانی پێش خۆی ئەوی تەکفیر کردووە.

-(ابن القيم) لە کتێبی (اغاثة اللهفان) دا وتوویەتی: **( وكان ابن سينا كما أخبر عن نفسه قال: أنا و أبي من أهل دعوة الحاكم فكان من القرامطة الباطنية الذين لا يؤمنون بمبدأ ولا معاد ولا رب ولا رسول مبعوث جاء من عند الله تعالى)** ا.هـ من إغاثة اللهفان [١٩٥/٢]. (ابن العماد) لە شذرات الذهب دا دەڵێت: [٣٥٣/٢]:

(أكثر العلماء على كفره وزندقته حتى قال الإمام الغزالي في كتابه "المنقذ من الضلال" : لا شك في كفرهما أي الفارابي وابن سينا) ولە ئەشەوا (الغزالي) ش دەگێڕێتەوەکە وتوویەتی:

(مجموع ما غلط فيه هؤلاء الفلاسفة المنتسبون إلى الإسلام، ومنهم الفارابي وابن سينا يرجع إلى عشرين أصلاً يجب تكفيرهم في ثلاثة منها وتبديعهم في سبعة عشر. أما المسائل الثلاث فهي:

١ -قولهم إن الأجسام لا تحشر، وإن المثاب والمعاقب هي الروح.

٢ -وقولهم إن الله يعلم الكليات دون الجزئيات.

ئەمەشمان باس کرد.

-ابن سينا لە کتێبی( الاشارات ) دا پێی وابوو خوای گەورە تەنها خۆی باش دەناسێت و،زانستی تەواوی دەربارەی درووستکراوەکانی نییە. زانایانی ئیسلام لە کۆن و نوێدا، بە تایبەتی أبو حامد الغزالي لە "تهافت الفلاسفة" و "مقاصد الفلاسفة" و ابن تيمية لە (نقض المنطق) و زۆر جێگا لە (مجموع الفتاوى ) دا ، لە هاوچەخەکانیش سمير المالكى لە کتێبی: **(الرد على من عظم الفلاسفة الملاحدة،ابن سينا، الرازي، الفارابي وأشياعهم)** و بە پێی فەتوای زۆر لە زانایانی جیهانی ئیسلامی، کەسیکی نامۆ بووە بە بیروباوەڕی ئاینی ئیسلام و بیروباوەڕەکانی لە فەیلەسوفەکانی یۆنانەوە نزیك بوونە نەوەك ئیسلام، منیش لەو سەرچاوانەی ئاماژەم پێکرد سوودم بینییوە بۆ ئامادە کردنی ئەم بابەتە. ابن سينا تەمەنێکی زۆر درێژی نەکردو تەنها پەنجا و حەوت ساڵ ژیا ، لە کۆتایی ژیانیدا زۆر کات نەخۆش بوو ، دەرمانێکی زۆری بۆ چارەسەری نەخۆشییەکی دەخوارد، بەڵام بێ سوود بوو،

بۆیە دواجار لە چارەسەر بێ هیوا بوو و دەستی لە خۆی شۆردەوەو دەستی کرد بە قورئان خوێندن ولە کتێبی ( وفيات الأعيان و أنباء أبناء الزمان ) ی ابن خلكان دا٢١/ ١٥٧-١٦٢ هاتووە کە سێ ڕۆژ جارێك قورئانی خەتم دەکردو ، ماڵ و سامانیشی کرد بە خێر و صەدەقە. دەوترێتیش لە ماوەی نەخۆشییەکەیدا لە کۆتایی تەمەنیدا تەوبەی کردووە، بەڵام نەزانراوە کە لە بیروباوەڕەکانی پاشگەزبووبێتەوە و لێیان پەشیمان بووبێتەوە، بۆیە وا دەردەکەوێت تەوبەکەی بەو واتا گشتیە دێت کە کەسێك لە مردن نزیك بووەتەوەو عبادەتی زۆرئەنجام بدات و خۆی بۆ لیقای پەروەردگاری ئامادە دەکات.

**نەزانراوە کە لە بیروباوەڕەکانی پاشگەزبووبێتەوە و لێیان پەشیمان بووبێتەوە.**

# ( بشار بن برد )



ناوی (بشار بن برد بن يرجوخ العُقيلي) یە، لە کۆتایی سەدەی یەکەمی کۆچی بە نابینایی لە بەسرە لە ساڵی ٩٦ك لە دایکبووە، لە بنچینەدا خەڵکی خوراسانەو دەگێڕنەوە کە باپیرانی لە پادشایانی فارس بوونە، هەر خۆی لە چەندین هۆنراوەدا شانازی بەوە دەکات و دەڵێت:

من خراسان وبيتي في الذرى **** ولدى المسعاة فرعي قد بسق

بەشار کەسێکی چوار شانەی باڵا بەرزی و دەموچاو پانی زەبەلاح بوو، وەکو مێژوونووسان دەگێڕنەوە سیمایەکی جوانی نەبووە، قسەڕەق و ئاکار ناشیرین و لە ژیان بێزار بووە، دەمارگیری زۆری هەبوو بۆ فارسەکان و ڕقی لە عەرەب بوو، هەمیشە گاڵتەی پیدەکردن، لەو شاعیرانەیە کە (مخضرم) یان پێ دەوترێت، واتە: فریای هەردوو سەردەمی ئومەوییەکان و عەبباسییەکان کەوتووە، زوو توڕە دەبوو.

لە هۆنراوەکانیدا جنو فرۆش بوو ، کەس لە زمانی ڕزگاری نەدەبوو، زانایان و زمانناسانی وەکوالاصمعي وسیبویە والاخفش و تەنانەت خودی خەلیفەش،چونکە جارێکیان لە شیعرێکیدا مەهدی خەلیفەی داشۆڕی.

لە ڕووی توانای شیعر وتنەوە، هەندێك بەسەر گەورەی شاعیرانی چاخی عەبباسی یەکەم دایدەنێن، خاوەن زیاتر لە دوانزە هەزار بەیت شیعر بووە، ئەگەرچی زۆربەی ئەوانەمان پێنەگەشتووە، زۆر ژیر و زیرەك بوو، سەبارەت بەوەی بە نابینایی لە دایکبووە، دەڵێت:

عَميتُ جنيناً والذكاءُ من العَمَى **** فجئتُ عجيبَ الظنَ للعلم موئلا

بەشار گەشتی زۆری بە شارەکانی عێراقدا کرد و دواجار گەڕایەوە بەسرەو بۆ ماوەیەك ئامادەی وانەکانی علم الکلام وفەلسەفە بوو، دواتر زەندەقەو بێ باوەڕی خۆی بە هەموو شتێکی هەست پینەکراو بە ڕاشکاوی ڕاگەیاند، لەگەل ئەوەشدا کەسێکی بێ شەرم بوو، لەسەر دەمێکدا کە ئایین ڕەنگدانەوەی تەوای لە سەر کۆمەڵگا هەبوو، ئەو بە ڕاشکاوی سەرقاڵی مەی خواردن و داوێن پیسی بوو، هۆنراوەی زۆریشی بە کچاندا دەوت و ئەوەش بووە مایەی بێزاربوونی خەڵکی وبەرزکردنەوەی سکاڵا بۆ لای خەلیفەو ئەویش بۆ ماوەیەك زیندانی کرد.

بەشار ئەگەر چی وەکو زندیق و بێ باوەڕ بە خوا و ڕۆژی دوایی دەناسرا، بەڵام هەندێ جار خۆی وەکو خەواریجەکان نیشان دەدا وبەرگری لە بیروبۆچوونەکانیان دەکرد،

جارجارەش ڕووبەڕوی (واصل بن عطاء)ی سەرکردەی موعتەزیلەکان دەبوویەوەو لە وانەکانیدا کێشەی بۆ درووست دەکرد، بەڵام بە گشتی بە پێی شیعرەکانی لە نێوان زەندەقەو خەواریجەکاندا بوو.

هەروەها یەکێك لە بۆچوونەکانی پەسەند کردنی هەڵوێستی ئیبلیس بوو- بەلەعنەت بێت- لە دژی ئادەم سەلامی خوای لێبێت، وەکو خۆی دەڵێت:

**إبليسُ أفضلُ من أبيكم آدم *** فتبينوا يا معشر الفجار**

**النارُعنصره وآدم طينة *** والطين لا يسمو سمو النارِ**

واتە: ئبیلیسی لە ئادەم بە باشتر دەزانی لەبەر ئەوەی ئەو لە ئاگر دروستکراوەو گڵیش هەرگیز وەکو ئاگر بەرز نابێتەوە.

لە کتیبی (البيان والتبيين/الجاحظ/ دار صعب/بيروت/ص٢٤) هانووە کە واصل بن عطاء زۆر ڕقی لێ بوو، دەیوت: ئەگەر ڕەشەکوژی خەڵکی کارێکی ناشیرین نەبوایە کە مانەوییەکان ئەو کارە دەکەن، کەسێکم دەنارد لەماڵەکەی خۆیدا بیکوژێت.

بشار بن برد هاوەڵانی تەکفیر دەکرد وباسی ئەوەشی دەکرد کە مردووەکان پێش ڕۆژی قیامەت دەگەڕێنەوە دونیا و پشتگیری ئیبلیسی دەکرد لە خۆبەباشتر زانینی لە ئادەم عليه السلام وەکو (عبدالقاهر البغدادي) دەربارەی دەڵێت:

**(وحكى أصحاب المقالات عن بشار أنه ضمّ إلى ضلالته في تكفير الصحابة وتكفير عليّ معهم ضلالتين أخريين إحداهما قوله برجعة الأموات إلى الدنيا قبل يوم القيامة كما ذهب إليه أصحاب الرجعة من الرافضة. والثانية قوله بتصويب إبليس في تفضيل النار على الأرض)**(الفرق بين الفرق/البغدادي/دار الجيل/ص٣٩

ئەدۆنیس کە بەسەرگەورەی حەداسییەکان دادەنرێت لەم سەردەمە، لە کتێبی(الثابت والمتحول) بەرگری زۆری لە بشار بن برد کردووەو، هەروەها ئەو شاعیرە جێگای ڕێزو بایەخێکی زۆرە لە لای زۆرێك لە لیبرالی و حەداسییەکانی جیهان بە شێوەیەکی گشتی، (جیهان السادات) ی خێزانی أنور السادات یش نامەی دوکتۆراکەی لەسەر بشار بن برد بوو، کە بە ڕۆشنبیرێك لە دژی بیری کۆنەپەرستیدا ناساندوویەتی.

بشار بن برد بە یەکێك لەو شاعیرانە دەژمێردرێت کە شیعرەکەیان بووە هۆی کوژرانیان، ئەم شاعیرە بە شێوەیەکی گشتی و لەسەرەتای لاوێتییەوە شیعری داشۆرینی زۆر بوو، هەرچی بە دڵ نەبوایە یان حەزی لە کەسێك نەکردایە دایدەشۆری بە شیعرەکانی، کە شیعرەکانی لە ڕووی ڕواڵەت و هەنەرییەوە لە ئاستێکی بەرزدابوونە، چونکە وەکو الجاحظ دەڵێت لە (البيان والتبيين )دا بەششار شاعیرێك بووە (مطبوع) بووە، واتە:بە سروشت و سەلیقە هۆنراوەی وتووە ، بێ ئەوەی خۆی بۆ مانوو بکات،هاوکات شیعری (مجون) واتە: بێ ڕەوشتیشی زۆر بوو،

وەسفی پەیوەندییەکانی خۆی لە گەڵ کچاندا و ڕۆیشتنی بۆ مەیخانەکان دەکرد لەسەرووی ئەوانەشەوە بە ڕاشکاوی بیروباوەری خۆی دەربارەی خوا و ڕۆژی دوایی دەخستە ڕوو کە هەندێ جارنکۆڵی لێ دەکرد، جاریکیش بەمەبەستی وەرگرتنی پارە مەدح و ستایشی مەهدی خەلیفەی کرد بەڵام ئەو لە ڕانبەردا هیچی پێ نەدا ، بۆیە دوای ماوەیەك بە شیعریکی جنێوئامێز سووکایەتی بە خەلیفە کرد وپێی وت:

خَليفةٌ يَزْني بعمّاتِهِ **** يَلْعَبُ بالدّبُّوقِ والصَّولجَانْ

بۆیە دەگێڕنەوە خەلیفە خۆی بۆ بەسرە هات و فەرمانی کرد دەستگیر بکرێت، پاشان فەرمانی کرد بیرێت حەفتا قامچی لێ بدرێت بەڵام بەشار کە ئەو کاتە پیر بوو، پاش ماوەیەك لەو سزایە بەرگەی نەگرت و لە ساڵی ١٦٨ك گیانی لە دەستدا.

لەم بارەوە ابن سلام لە **"طبقات الشعراء" سەبارەت بە هۆکاری مردنەکەی وتوویەتی: "كان بشار يعد من الخطباء البلغاء الفصحاء وله قصائد وأشعار كثيرة، فوشى به بعض من يبغضه إلى المهدي بأنه يدين بدين الخوارج فقتله المهدي،وقيل: بل قيل للمهدي: إنه يهجوك، فقتله، والذي صح من الأخبار في قتل بشار أنه كان يمدح المهدي، والمهدي ينعم عليه، فرمي بالزندقة فقتله).**

# ( د.نوال السعداوي )



لە قاهیرە لە ساڵی ١٩٣١ز لە دایکبووە، پزیشکێکی میسرییە لە پسپۆڕییەکانی سنگ و نەخۆشیە دەروونییەکان، هەروەها نووسەرو ڕۆماننوسێکی بە ناوبانگە، بەوە ناسراوە کە داکۆکی لە مافەکانی ئافرەت دەکات،هەمیشە کۆششی کردووە بۆ رزگارکردنی ئافرەتان لە سنوورەکانی شەرع وهەروەها بۆ یەکسان کردنیان بە پیاوان لە هەموو شتێکدا.

خاوەنی کۆمەڵێك کنێبە ، لەوانە:سقوط الإمام ، الإله يقدم استقالته في اجتماع القمة ٢٠٠٦، توأم السلطة والجنس، المرأة والدين والأخلاق.

نوال السعداوي خاوەنی ناوبانگ وئەزموونێکی زۆرە لە دژایەتی بیرروباوەڕو بۆچوونی ئیسلامیدا، ئینجا ئەو بەتوندی و بە شێوەیەکی عاتیفی بیرەباوەڕەکانی ئیسلامی ڕەتدەکاتەوە ڕەخنەیان لێ دەگرێت، نکۆڵی لە زۆر بنەماو بنچینەی جێگیری ئیسلامی دەکات و،

لە کتێب و ڕۆمانەکانیدا گاڵتەو سووکایەتی بە پیرۆزییەکانی ئیسلام دەکات، ئافرەتیش بە شێوەیەکی گشتی بابەتی سەرەکی نووسینەکانیەتی.

شایانی باسە نوال السعداوي کاتێك خویندکاری کۆلێژی پزیشکی بووە، بۆ ماوەیەك وابەستە بووە بە شەرعی ئیسلامەوەو لە گەڵ کۆمەڵەی الإخوان المسلمین بۆ ماوەیەك پەیوەندی هەبووە، وەکو دکتور "محمود جامع" نووسەری کتێبی "عرفت السادات" بە ڕاشکاوی ئەوە باس دەکات، بەڵام زۆری نەبردووە کە بیروباوەڕی ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی ڕەتکردەوەتەوە.

ئەمانەی خوارەوەش کۆمەلێکە لە بیروباوەرەکانی کە لە کتیبەکانیدا وهەروەهالەچاوپێکەوتنەکانیدا بانگەشەیان بۆ دەکات.

١ -بانگەشە بۆ یەکسان کردنی پیاو و ژن دەکات لە میراتیدا وئایەتی: (للذكر مثل حظ الأنثيين) ڕەتدەکاتەوە.

٢ -داوا دەکات منالٚ بە ناوی دایکەوە بانگ بکرێت نەك بە ناوی باوکی، هەمیشە پێیشی خۆشە بە نوال زینب واتە بەناوی دایکییەوە بانگ بکرێت.

٣ -زەواج و هاوسەرگیری بە کۆیلایەتی دەزانێت و بە "عقود احتكار" ناوی بردووە بۆ ئافرەتان.

٤ -بانگەشەی دانپێدانانی بە منالێ ناشەرعی دەکات و باوەری بە خێزان نییە وەکو ڕێکخراویکی پیرۆز.

٥ -بە توندی بانگەشەی لە دژی خەتەنەی کچان دەکرد وبە هەمەجییەت و بەربەرییەت ناوی دەبرد.

٦ -داواى ڕاگرتن و كار پينه‌كردنى ئايه‌تى: {للذكرمثل حظ الأنثيين} الأنثيين ى كردووه، وه‌كو پێشتر ئاماژه‌مان پێكرد، له گه‌ل زۆر ئايه‌تى تر ، به‌ڕاسته‌خۆو و ڕاشكاوى، يان به شێوه‌يه‌كى ناڕاسته‌وخۆ.

٧ -دژايه‌تى سه‌رپۆش و بالآپۆشى ئافره‌تان يه‌كێكه له سه‌ره‌كيترين ئه‌و ئه‌ركانه‌ى هه‌وڵى بۆ داوه،ئه‌و ده‌ڵێت: ڕه‌وشت هيچ په‌يوه‌ندييه‌كى به سه‌رپۆشه‌وه نييه، زۆر ئافره‌ت له ئيفريقيا ڕووتن و ره‌وشتيان هه‌يه و، زۆر ئافره‌تى پۆشته‌ن له ميسر ره‌وشتيان نييه. جارێكيش له لێدوانێكيدا بۆگۆڤارێكى فه‌ره‌نسى وتى:"إن المرأة المحجبة والتي تغطي رأسها متخلفة، وإن عقلها مغلق".واته ئافره‌تى له‌چك به‌سه‌ر ئافره‌تێكى عه‌قڵ نوقسانه و عه‌قڵى داخراوه.هه‌روه‌ها ئه‌يوت ئافره‌تان سه‌رپۆش ده‌كه‌ن بۆچى پياوانيش نايكه‌ن!

٨ -دژايه‌تى فره‌ژنى ده‌كات و ده‌ڵێت:"أنا عاوزه أتجوز أربع رجاله ولا أدرى لماذا لا أتزوج أربعة"؟! واته: من ده‌مه‌ويت شوو به چوار پياو بكه‌م نازانم بۆچى ناتوانم.

هه‌روه‌ها ده‌يوت: (( يعني إيه تعدد الزوجات .. دي دعوة صريحة للانحلال وممارسة الرجل للزنا علنا .. لازم نحارب تعدد الزوجات بكل الوسائل اللازمة لأن التعدد فيها ضياع وتشرد للأسر والأبناء ))واته: يه‌عنى چى فره‌ژنى، فره‌ژنى بانگه‌شه‌يه‌كى ڕاشكاوانه‌يه بۆ بێ ره‌وشتى، ئێمه پێويسته به هه‌موورێگه‌يه‌ك دژايه‌تى فره‌ژنى بكه‌ين چونكه ده‌بيته مايه‌ى هه‌ڵوه‌شانه‌وه‌ى خێزان و و...

هه‌روه‌ها ده‌يوت: " إن تعدد الزوجات يخلق الكره بين الأطفال والزوجات كما يزيد من الحوادث، وأن تعدد الزوجات كذب وليس بالقرآن وبلاد عربية مثل تونس منعته"

٩ -باوەڕی بە حەج نییە، بەشێوەیەکی گشتی هەموو جۆرە عیبادەتێکیش ڕەتدەکاتەوە، دەڵێت: خوا خۆشەویستییە (**الله محبة**) خۆیشی بە ئیماندار دەزانێت بەخوا لەسەر ئەو تێگەیشتنەی خۆی،، دەربارەی فەریزەی حەج بە سووکایەتییەوە دەڵێت: (**الحج بجماعة عادة وثنية موروثه من عبدة الأصنام !** ).واتە: حەجکردن عادەتێکی بۆ ماوەیی بتپەرستەکانە.

١٠ -کاتێك خویندکار بوو جارێك پرسیاری لە مامۆستاکەی کرد:**"هل الله في اللغة مذكر أم مؤنث"** واتە: ئایا خوا لە زماندا نێرە یان مێیە!

١١ -بەرگری زۆر لە بێباوەڕان دەکات، بۆ نموونە: بەرگری لە سلمان رشدي دەکرد، هەروەها لە "فرج فودة" و"نصر حامد أبو زيد."

١٢ -نکۆڵی لە قوامة ی پیاو دەکات کە لە قورئانداهاتووە و، دەڵێت:**(( ليه الرجال قوامون على النساء ؟؟ معقوله واحد جاهل يبقى قوام على وحدة دكتورة مثلا ؟؟ وإذا كانت المرأة هي إللي بتنفق على الراجل يبقى إزاي الرجال قوامون ؟؟**

١٣ -ئادەم و حەوا بە ئەفسانە ئەزانیت،لە کتیبی (الوجه العاري )دا دەڵێت:**(لا تختلف أسطورة آدم وحواء كثيراً عن أسطورة أزيس وزيوس).**

واتە:ئەفسانەی ئادەم و حەوا جیاوازییەکی زۆری لە گەڵ ئەفسانەی ئەزیس و زیوس نییە.

١٤ -لە کتێب و ڕۆمانەکانیدا بە شێوەیەکی گشتی هانی ئافرەتان دەدات بۆ هەڵگەڕانەوە لەسەر دین و داب ونەریت و باوك وبرا.

١٥ -لە چاوپێکەوتنێکیدا لە کەناڵی جەزیرە پشتگیری خۆی بۆ هاوڕەگەزبازان نیشانداو وتی ئەوە مەسەلەیەکی کەسیتییە و ئارەزووی خۆیانە و ئازادن.

١٦ -لە ساڵی ٢٠١٥ لە دوای ڕوداوی حاجیانی ماڵی خوا ولە لێدوانێکیدا بۆ ڕۆژنامەی گاردیان وتی ئەو خەڵکە بۆ پال بە یەکترەوە ئەنێن..ئایا ڕەجمی شەیتان دەکەن..بۆچی پێویستیان بە ڕەجمی شەیتانە..بۆچی بەردە رەشەکە ماچ دەکەن..هەر لەو چاپێکەوتنەیدا زۆر سووکایەتی و گاڵتەی بەو شەعیرەیە کرد و داوای کرد ژمارەی حاجیان کەم بکرێتەوە.

١٦ -لە هەموو نووسینەکانیدا کە دەوری چل کتێبی هەیە، جەخت لەسەر ئازادی ئافرەت و داکۆکی کردن لەسەر مافەکانی دەکات، کە زیاتر لە دیدی ئەودا بریتین لە یەکسان کردنی بە پیاوان لە هەموو شتێکدا و، دەستەبەر کردنی ئازادی ڕەها بۆ ئافرەتان لە هەموو ڕوویەکەوە و لەدەرەوەی بازنەی ئایین، و نکۆڵی کردن لە زۆربەی بنەما سەرەکییەکانی ئیسلام، و گاڵتە پێکردنیان وەکو شەعیرەی حەج و سەرپۆشی ئافرەتان و زۆر پرسی ڕەوشتیی ،کە ئەو بە پێچەوانەی مافەکانی مرۆڤ دەیبینێ.

١٥ -لە بەر ئاراستە فیکرییەکانی وهەوڵەکانی لەو بازنەی ئاماژەمان پیکرد، ڕۆژئاوا هەر زوو گرنگی و بایەخی شیاوی بە (نوال السعداوي) دا و، کتێبەکانی بۆ زیاتر لە سی و پێنج زمانی جیهان وەرگێڕدراوە و، ساڵانێك لە زانکۆکانی ئەمریکا و ئەوروپا مامۆستا بووە و، دواتر گەڕایەوە بۆ میسر و ویستی خۆی بۆ سەرۆکایەتی میسر کاندید بکات بەڵام نەیتوانی.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە بۆ کۆمەڵێك بابەتی تایبەت بە ژیان و فیکری نوال السعداوي لە سایتەکانی صيد الفوائد و ملتقى أهل الحديث و ویکبیدیا گەڕاومەتەوە، هەروەها سوودم وەرگرتووە لە کتێبی (نظرات شرعية في فكر منحرف/٢) سليمان الخراشي.

**داوا دەکات منداڵ بە ناوی دایکەوە بانگ بکرێت نەك بە ناوی باوکی، هەمیشە پێیشی خۆشە بە نوال زینب واتە بەناوی دایکییەوە بانگ بکرێت.**

# ( عبدالرزاق السنهوري )




عبد الرزاق السنهوري (١٨٩٥ز - ١٩٧١ز) شارەزایەکی گەورەیە لە بواری یاسا لەسەر ئاستی هەموو عەرەب ناوبانگی هەیە، لە فەرەنسا دکتۆرای لە یاسا بەدەست هێناوە و لە ساڵی ١٩٢٦ گەڕاوەتەوە میسر وبووەتە مامۆستا لە کۆلێژی یاسا و دواتر لە ساڵی ١٩٣٦ز بووەتە ڕاگری ئەو کولێجە، چوار جاریش بووەتە وەزیری مەعاریف و لە دیمەنی سیاسی میسردا لە بەرزترین ئاستدا ڕۆڵی بووە.

خاوەنی ژمارەیەکی زۆرە لە کتێب و یاسا و دەستوری وڵاتە عەرەبییەکان، لەوانە:

١ -القانون المدني المصري ومذكرته الإيضاحية.. وشروحه (الوسيط) - والوجيز.

٢-القانون المدني العراقي ومذكرته الإيضاحية.

٣-القانون المدني السوري ومذكرته الإيضاحية.. وقانون البينات - بما فيه من قواعد الإثبات الموضوعية والإجرائية.

٤ -دستور دولة الكويت وقوانينها: التجاري والجنائي والإجراءات الجنائية والمرافعات وقانون الشركات وقوانين عقود المقاولة، والوكالة عن المسئولية التقصيرية وعن كل الفروع وهي التي جمعت -فيما بعد- في القانون المدني الكويتي.

٥ -القانون المدني الليبي ومذكرته الإيضاحية.

٦ -دستور دولة السودان.

٧ -دستور دولة الإمارات العربية المتحدة.

عبدالرزاق السنهوری نووسەرو داهێنەری یاسا دەستکردەکانە کە زۆرێکیان وەکو جێگرەوەی شەرعی ئیسلام کاریان پێ دەکرێت، ئەو هەموو هەولەکانی خستەگەر بۆ ئەوەی ئەو یاسایانە جوان بکاتەوەو ڕوکەشێکی ئیسلامیشی بەسەراکرد، بۆ ئەوەی بە تەواوەتی ڕەگ و ڕیشە داکوتێت و لە جیاتی حوکمەکانی ئیسلام لە قورئان و سوننەت و فیقهی ئیسلامی کاری پیبکرێت.

لە ڕاستیدا سەنهوری بەوەی کە تەمەنی هەمووی لە دانانی ئەو یاساوڕێسایانە خەرج کرد، بوو بە یەکەم کەس کە توانی یاساکانی ڕۆژئاوا هاوردە بکات بۆ وڵاتی موسوڵمانان و بەشێوەیەکی قۆناغ بە قۆناغ بیکاتە بەدیلی یاسای خوای گەورە.

موسوڵمانانیش سەرەڕای لاوازیان دەرکیان بە ترسناکی پەنابردن دەکرد بۆ یاساکانی فەرەنساو وڵاتانی تری ڕۆژئاوا کە ببێتە مایەی وەلاخستنی حوکمەکانی ئیسلام، بۆیە ئەوەیان بە هیچ شێوەیەك پێی ڕازی نەدەبوون و ئاواتیان ئەوە بوو ئەو دادگاو یاسایانە نەمێنن،

بۆیە سەرانی ڕۆژئاوا بیریان بۆ سەنهووری ڕۆیشت بۆ ئەوەی یاسایەکی وا ئامادە بکات کە ئاوێتەیەك بێت لە زۆرینەی یاساکانی ڕۆژئاوا، هاوکات لە گەڵ هەندێ لە حوکمەکانی ئیسلامیش لە باری کەسایەتی و هەندێ بواری تر تێکەڵ بکات بۆ ئەوەی خەڵکی قەبوڵی بکەن.

لە ڕاستیدا سەنهوری گونجاوترین کەس بوو بۆ هەڵسان بەو ئەرکە، چونکە ئەو ساڵانێك لە فەرەنسا بووەو جێگای ڕێزو متمانەی فەرەنسا بوو،کە توانی یاسا ناکۆکەکانی لە گەڵ ئیسلامدا بە تیکەڵکردنی لەگەڵ هەندێ لە حوکمەکانی ئیسلام بلاوکانەوەو بسەپینی، هەر بۆیە فەرەنسا ڕێزی لە عبدالرزاق السنهوری گرت بەوەی خەڵاتی (لیجیون دویز) ی پێ بەخشی.

سەنهوری توانی لە ئەرکەکەیدا زۆر سەرکەوتوو بێت و یاسایەکی دروستکرد کە بنچینەکەی عەلمانی بێت و هاوکات نکۆڵی بێت لە زۆرێك لە حوکمەکانی ئیسلام ، چاکسازییەکانی وەکو مجید خدوري دەڵێت سەرکەوت لەو : **(.. إدخال الإصلاح التشريعي وفق أسس علمانية)** واتە: چاکسازییەکی تەشریعی لەسەر بنەماو بنچینەیەکی عەلمانی.

بۆ کەسێکیش بیەوێت بزانێ تا چەند عبدالرزاق السنهوری ڕێخۆشکەر بوو بۆ زاڵکردنی یاساکانی ڕۆئاوا بەسەر یاساکانی ئیسلامدا، لە ڕاستیدا ئەو بۆ ئەو پرۆژە گەورەیە فەرەنسا و ڕۆژئاوا بوو بە گشتی، ڕەچاوی دوو خاڵی کرد:

١ -گونجاندنی شەریعەت لە گەڵ پێداویستیەکانی سەردەم بە هەر حاڵێك بووە، نەك بە پێچەوانەوە .

٢ -جیاوازی کردن لە نێوان دوو مەسەلەدا:

ا- العبادات: ئەمەیان بە ڕای سەنهوری بواری کۆشش و بیروچۆنی تێدا نییە.

ب- المعاملات: ئەمەیان بە ڕای سەنهوری بواری کۆشش و بیروڕای جیاوازی تێدایە.

ئەمەش هەندێکە لە لادانەکانی عبد الرزاق السنهوري:

١ -هاوردەکردنی یاساکانی ئەوروپا وتێکەڵکردنیان بە هەندێ لە حوکمە ئیسلامییەکان و چەسپاندانیا لە نیو وڵاتە عەرەبییەکاندا، بەمەش ئەو یاسایانەی لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا زاڵ کرد و حوکمی خوای گەورەی بە ڕێژەیەکی زۆر لە سەر زەمینەی واقیع هەڵگرت، خوای گەورە فەرموویەتی:**(ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أنزل إليك وما أنزل من قلبك يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أمروا أن يكفروا به ويريد الشيطان أن يضلهم ضلالاً بعيداً)**

٢ -هەندێ لە وڵاتە ئیسلامییەکان وەکو عێراق و چەندین وڵاتی تر، بە حوکمی خوای گەورەو شەریعەتی ئیسلام کاریان دەکرد، بەڵام عبدالرزاق السنهوري هات و یاسایەکی بۆ درووستکردن ئاویتەیەك بوو لە یاساکانی ڕۆژئاوا و، کەمێکیش لە حوکمی شەریعەتی ئیسلام ، وەکو دکتور عبد الباسط الجميعي دەڵێت:**(هو الذي وضع للعراق قانونها المدني الذي جمع فيه بين أحكام القوانين الوضعية العصرية وأحكام الشريعة الإسلامية)**

٣ -جیهان له دیدی سەنهوری یەوە بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دابەش دەبیت، نەك بۆ موسوڵمان و نا موسوڵمان، هەوڵیشی دەدا ڕۆژهەڵات ئاوێتەی ڕۆژئاوا بکات ، بەو واتایەی کە سنوورەکانی نیوان موسوڵمان و جولەکەو کریستیان هەڵگرێت لەسەر بنەمای دابەزینی موسوڵمان لەسەر بنچینەکانی بیروباوەری خۆی، دەڵێت:

**(يقول الشرق لأبنائه: إن نهضتي هي نهضة دين، وتقوم على سائر الأديان، في أني مقر الأديان الثلاثة، وكلها من عند الله)** واتە: ڕۆژهەڵات بە ڕۆڵەکانی دەڵێت: ڕاپەڕینی من ڕاپەڕینی ئایینەو لەسەر هەموو ئایینەکانی تر رادەوەستێت بەوەی کە باوەڕم بە هەرسێ ئایینەکان هەیە و هەمووی لە لایەن خواوە هاتووە.سەنهوری جیاوازی لە نێوان دینەکان نەدەکرد و هەمووی بە حەق دەزانی، وەکو خۆی دەڵێت: **(أحلم بعالم بشري موحد يقوم على سيادة العقل وعلى سيادة القانون)** واتە: خەونی ئەوە بوو جیهانێکی یەکگرتوو ببینێت کە لەسەر بنەمای سەروەری عەقڵ و باڵا دەستی یاسا دابمەزریت.

٤ -سەنهوری ڕۆڵێکی زۆر خراپی هەبوو لە تێکدانی ئەزهەر کە دوا جێگا بوو ڕێزی لە حوکمی شەریعەت دەگرت و لە ناو موسوڵماناندا دەیچەسپاند، کە توانی لە ڕێگەی پیگەی خۆی لە حکومەتی میسری و لە لای فەرەنسا ، توانی مەنهەجی وانەکان لەو قەڵا زانستیە مەزنە بگۆڕێت و مەنهەجی ئەوروپای تیکەڵ بکات، ئەمەشی بە تێروتەسەل لە کتیبی أوراق شخصية کە بریتییە لە یادەوەرییەکانی باسی کردووە.

٥ -دوای داواکردنی بۆ پەرەپێدانی شەرع بە تیکەڵکردنی لە گەل یاسا ناکۆکەکان لە گەل دینی خوا، ئینجا دەستی تێکدان و دژایەتی بۆ زمانی عەرەبی درێژ کرد، کە ئەو دەیزانی بابەتی سەرەکی ھ بڕبڕەی پشتی دینی خوایە بۆ تیگەیشتنی خەڵکی لە ئیسلام ، داوای دەکرد کە گۆڕانکاری لە ڕێزماندا ئەنجام بدرێت و،

بکرێتە زمانێك نزیك لە زمانی قسەکردنی خەڵکی لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا، ئەمەشی بە ڕاشکاری لە یادەوەرییەکانی خستووەتە روو.

٦ -لابردنی شێوازی نووسینەوەی یاساکان بە پیی نووسینەوەی شەرعزانە موسوڵمانەکان وگۆڕینی بۆ شێوازی نووسینەوەی ڕۆژئاواییەکان بۆ نووسینەوەی یاسا.

٧ -هەوڵی دا ناوەندێك درووست بكات بە ناوی:**(معهد الفقه الإسلامي المقارن)** کە ببێتە جیگرەوەی ئەزهەر و زیاتر ڕێگە خۆش بكات بۆ گۆڕینی شەریعەتی ئیسلام وزاڵ بوونی یاساکانی ڕۆژئاوا لە وڵاتی موسوڵمانانداا، ئەمەش وایکرد لە نیو ئەزهەرەوە دژایەتییەكی زۆر بکرێت و کەسێکی وەکو محمد عمارة پەیمانگاکەی سەنهوری بەوە ناو برد کە بۆ ئیلحاد و بێباوەری دامەزراوە.

٨ -سەنهوری هەوڵ و کۆششەکانی دوای لابردنی شەرعی خوا، ڕووی کردە پرسی ئازادکردنی ئافرەت و هاندانی بەرەو لاساییکردنەوەی ڕۆژئاوا، کە لەو سەردەمە ئەو بیرۆکەیە لە دۆخی درووست بووندا بوو،

خەڵکیش هێشتا شانازیان بە دینی خۆیانەوە دەکرد.لەو بارەشەوە بیرمەندی دڵسۆز بۆ ئیسلام محمد محمد حسین بەرپەرچی سەنهوری داوەتەوە لە کتێبی:

(حصوننا مهددة من داخلها) (ل١١١-١١٨)

هەندێك بیرمەند و کەسانی ئیسلامی پیشکەوتنخواز وەکو پیشەی هەمیشەییان ، بەرگری لە عبدالرزاق السنهوری دەکەن و دەڵێن: ئەو باوەڕی بە خوا بووە چونکە خۆی دەڵێت:**(أدرك أن هناك قوة غير منظورة تحيطني وأؤمن بها، و إني من صُنْع هذه القوة)** واتە: لەوە تێدەگەم هێزێکی نەبینراو هەیە دەورم دەدات و باوەرم پێیەتی، بە خۆیشم درووستکراوی ئەو هیزەم. لە کاتیکدا مەسەلەی باوەڕ بوون بە خوا خاڵێکی هاوبەشە لە نێوان زۆربەی دینە ئاسمانی و دەستکردەکانیشدا ، بە ڵام بە پێناسەی جیاواز، بەداخەوە کە محمد عمارة ش یەکێکە لەو کەسانەی کە بەرگرییان لە سەنهوری کردووە.

سەنهوری بە بێ خۆ حاڵی کردن لەوەی شەریعەتی ئیسلام لە درێژایی چەندین سەدە حوکمی خەڵکی کردووە، پیی وابووئەو شەریعەتە ناگونجێ بۆ ئەوەی حوکمی خەڵکی بکات و ئەگەریش ئەو توانایەی هەبێت، ئەوا پیویستە دوای لێکۆڵینەوەووردبوونەوەو گۆڕانکاری زۆر بێت، نموونەشی بەوە ئەهێنایەوە کە سزاکان لە شەریعەتی ئیسلامدا نا گونجین بۆ جێبەجێکردن لەم سەردەمەو پیویستە بگۆڕین بە سزای زیندانی و غەرامە کردن.

شایانی باسە ئەو ڕەخنانەی کە سەنهوری لە شەریعەتی ئیسلام گرتوویەتی، چەندین زانای بەڕێز بەرچەرچیان داوەتەوە، وەکو محمد محمد حسين لە کتێبی (حصوننا مهددة من داخلها)، هەروەها عباس حسني محمد لە کتیبی :

(هذا هو موقف السنهوري باشا من الشريعة) بە تێروتەسەل و بە بەڵگە، تۆمەتەکانی سەنهوری لە مەڕ تۆمەتبارکردنی شەریعەتی ئیسلام بە کەم و کورتی بەرپەرچ داوەتەوە.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە بۆ چەندین سەرچاوە گەڕاومەتەوە پێش ئەوەی دەست بە نووسین بکەم ، لە دیارترینیان: (نظرات شرعية في فكر منحرف)صالح الخراشي.

سەنهوری هەوڵ و کۆششەکانی دوای لابردنی شەرعی خوا، ڕووی کردە پرسی ئازادکردنی ئافرەت و هاندانی بەرەو لاساییکردنەوەی ڕۆژئاوا، کە لەو سەردەمە ئەو بیرۆکەیە لە دۆخی دروست بووندا بوو،

# ( البوصيري )



ناوی (محمد بن سعيد بن حماد الصنهاجي البوصيري)یە، لە ساڵی ٦٠٨ ك لە بوسیری سەر بە شاری بەنی سوێف لە میسر لە دایكبووە و لە ساڵی ٦٩٦ ك لە ئەسكەندەریيە لە تەمەنی هەشتاو حەوت ساڵیدا وەفاتی كردووە. بوسیری بەوە نە ناسرواوە كە لە ئەهلی عیلم بوو بێت، بەڵكو شاعیر بووە، زۆر كەسیش ئەم بوسيري یە لە گەڵ بوسيري یەكی تر تیكەڵ ئەكەن، كە ئەوی تر زانایە و فەرموودەناسەو دانەری كتیبی " زوائد ابن ماجه " يە ، ناوی (أحمد بن أبي بكر الكناني) یە و، لە قوتابییەكانی ابن حجر العسقلاني بووە .

بوسیری هەر لە مناڵییەوە قورئانی لەبەر كرد ولە لای مامۆستاكانی سەردەمی خۆی زانستەكانی زمانی عەرەبی و ئەدەب و هەندێ لە زانستەكانی تری وەرگرتووە، بوسیری شاعیرێكی زۆر بە ناوبانگە لە بواری مەدحی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و، كۆمەڵە هۆنراوەیەكی هەیە لەو بارەوە ، لەوانە، ئەو قەسیدەی كە دەست پێ دەكات بە:

كيف ترقَى رُقِيَّك الأَنبياءُ ***يا سماءً ما طاوَلَتْها سماءُ

هەروەها ئەو قەسیدەی کە دەست پیدەکات بە:

يا من خزائن ملكه مملوءة *** كرمًا وبابُ عطائه مفتوح

بەڵام لە هەموو قەسیدەکانی بەناوبانگتر بریتییە لە قەسیدەی "الكواكب الدرية في مدح خير البرية" کە ناوبانگی بە (البردة) دەرکردووە، بریتییە لە ١٦٠ بەیت و دەست پێ دەکات بە:

أَمِنْ تذكّر جيرانٍ بذي سلم *** مزجتَ دمعًا جرى من مقلة بدم

قەسیدەی بوردە لەوانەیە بەناوبانگترین هۆنراوە بێت لە ستایشی پێغەمبەر(ﷺ) و، زۆربەی موسوڵمانانی دونیا لە هەموو سەدەکاندا دوای بوسیری ئەگەر قەسیدەکەشیان نەخوێندبێتەوە، بەلایەنی کەم ئەم بەیتە مەشهورەیان لەبەرە:

مولاي صل وسلم دائما أبدا *** على حبيبك خير الخلق كلهم

وەکو هۆنراوە لە ڕووی عاتیفی و هونەری و مەرجەکانی تۆکمەیی شیعر، تا بڵێیت بە هێزو سەرنج ڕاکێش و خۆشە، شاعیرانیش دوای خۆی بەردەوام لاسییان کردووەتەوەو شوین پێیان هەڵگرتووە، بۆ نموونە ئەحمەد شەوقی لە قەسیدەی (نهج الردة) و هەروەها دەیان شاعیری تر لاساییان کردووەتە.

بەڵام البوصيري لە هۆنراوەی بوردە کەوتووەتە کۆمەڵێك هەڵەی گەورە لە زیادەڕووی لە وەسفی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و،

به ڕای زۆرێك له زانا متمانه پێكراوەكان كەوتووەتە سنووری شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان، هەر بۆیە هەندێك لە زانایان حوكمی توندیان هەیە دەربارەی بوردەو دانەرەكەی. زانایان لەو ١٦٠ بەیتە ١٦ بەیتیان وەكو ڕەخنەی توند ئاڕاستەی البوصيري كردووە، دیارترین ئەوانەش كە ڕەخنەیان لێ گرتووە:

١ .الإمام الشوكاني ،لە كتێبی: " الدرّ النضيد في إخلاص كلمة التوحيد . "

٢ -لێكدەرەوان و ڕاڤەكارانی كتێبی:" التوحيد " ی شێخ محمد بن عبد الوهاب ، وەكو(سليمان بن عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب) لە كتێبی: " تيسير العزيز الحميد " ، و(عبد الرحمن بن حسن بن محمد بن عبد الوهاب) لە كتێبی: " فتح المجيد " هەروەها ابن عثيمين لە " القول المفيد " ، و( صالح آل الشيخ) لە كتێبی: " التمهيد في شرح كتاب التوحيد " زۆری تریش.

٣) -عبد الله بن عبد الرحمن أبا بطين) لە ڕەددانەوەی بوردە كتێبێكی نووسیوە بە ناونیشانی: " الرد على البردة. "

٣) -محمود شكري الألوسي) لە كتێبی: " غاية الأماني في الرد على النبهاني. "

٤ -صالح الفوزان لە كتێبی " إعانة المستفيد بشرح كتاب التوحيد"

٥ .-عبد البديع صقر ،لە كتێبی" نقد البردة مع الرد والتصحيح. "

٧ .محمد جميل زينو ،لە كتێبی " معلومات مهمة عن الدين. "

٨ .دکتور عبد العزيز آل عبد اللطيف لە وتاریکیدا لە گۆڤاری " البیان " ژمارە( ١٣٩ ) بە ناونیشانی " قوادح عقدية في بردة البوصيري. "

٩ .عبد الرءوف محمد عثمان لە کتێبی " محبة الرسول بين الاتباع والابتداع. "

١٠ .سليمان بن عبد العزيز الفريجي لە وتارێکیدا لە گۆڤاری " البیان " ژمارە ١٣٩ ، بە ناونیشانی " مظاهر الغلو في قصائد المديح النبوي. "

١١ .علوي السقاف ، لە " قراءة في بردة البوصيري وشعره "

زۆرێکیش لە زانا هاوچەرخەکان بە تایبەتی ئەوانەی سعودییە لەبەر ئەو هەموو زیادەڕەوی و شیرکەی تێیدایە، چاپ کردن و فرۆشتنی ئەو قەسیدەیە بە حەرام ئەزانن، زانای تریش هەن تەنها ئەوانەیان بەلاوە جێگای ڕەددانەوەیە کە زیادەڕەوی تێدایە، چونکە قەسیدەکە واتای جوان و قسەی شەرعی زۆری تێدایە.

زیادەڕەوی زۆر دەربارى ئەم هۆنراوەیەی بوسیری لە لای هەندێك لەسۆفییەکان - نەك هەموویان - ئەنجام دەدرێت، لەوانە:

بۆ خوێندنەوەی هۆنراوەکە دەستنوێژ دەگرن و ڕوو لە قیبلە دەکەن و نابێت لە سەروبۆری وشەکان هەڵە بکرێت و پیویستە خوێنەر بیریشی لای بێت لە کاتی خوێندنەوەیداو لە سەر مردوو دەیخوێنن لە کاتی بەڕێخستنی بەرەو گۆڕستان دەڵێن هەر بەتێکی بۆ شتێك باشە و..زۆر شتی تریش.

ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لەو دێڕە شیعرانەی بوردە کە ڕەخنەیان ئاڕاستە کراوە:

١ -يا أكرم الخلق ما لي من ألوذ به *** سواك عند حلول الحادث العمم

واتە: ئەی بەخشندەترین کەسێك خوا درووستی کردبێت، کەسم نییە لە کاتی ڕووداوی ناخۆش پەنای پێ ببەم لە تۆ زیاتر.

ئەمەش هاوارکردنە بە غەیری خواو دەچێتە بابەتی هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان:{ ولا تدع من دون الله ما لا ينفعك ولا يضرك فإن فعلت فإنك إذا من الظالمين .

٢ -فإن من جودك الدنيا وضرتها *** ومن علومك علم اللوح والقلم

واتە: دونیا و قیامەتیش بەشێکە لە بەخشندەیی تۆ، زانستی لەوح و قەلەمیش بەشێکە لە زانستەکانت.

ئەمەش بە ڕای زانایان جۆرێکە لە بەدرۆ خستنەوەی قورئان کە تێیدا هاتووە:

(وإن لنا للآخرة والأولى) یان وەکو لە فەرموودەدا هاتووە:

{ لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم، فإنما أنا عبد، فقولوا عبد الله ورسوله } رواه البخاري.

٣ -ما سامني الدهر ضيماً واستجرت به *** إلا ونلت جواراً منه لم يُضَم

واتە: هەر کاتێك ڕۆژگار نەهامەتییەکی بەسەر هێنابیتم و هاوارم بە پێغەمبەر(ﷺ) کردبێت،بە هانامەوە هاتووە.بە زۆر ئایەت بەرپەرچدراوەتەوە، وەکو:

{ **وإن يمسسك الله بضر فلا كاشف له إلا هو**} [الأنعام: ١٧]. يان به فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ)

:{ **إذا سألت فأسأل الله وإذا استعنت فاستعن بالله** } رواه الترمذي وقال حسن صحيح.

**٤ -فإن لي منه ذمة بتسميتي محمداً * * * وهو أوفى الخلق بالذمم**

واتە: پەیمانێكم لای پێغەمبەر (ﷺ)هەیە لەبەر ئەوەی ناوم موحەممەدە كە بچمە بەهەشتەوە. بەرپەرچ دراوەتەوە بەوەی ئەو قسە ڕاست نییەو چەندین كەس لە بنچینەدا باوەڕیان بە خواو بە ئیسلام نییە و ناویشیان موحەممەدە.ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) بە فاتیمەی كچی ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی:{ **سليني من مالي ما شِئْتِ، لا أُغني عنك من الله شيئاً** } رواه البخاري.

**٥ -لعل رحمة ربي حين يقسمها * * * تأتي على حسب العصيان في القسم**

واتە:لەوانەیە ڕەحمەتی خوا كاتێك دابەشی دەكات، بە پێی ئەوە بێت تاچەند یای بوویتە و سویندەكانت بە جێهێناوە، ئەمەش پێچەوانەی فەرموودەی خوای گەورەیە:

{ **إن رحمت الله قريب من المحسنين** } [الأعراف:٥٦. ]

**٦ - وكيف تدعو إلى الدنيا ضرورة من * * * لولاه لم تخرج الدنيا من العدم**

واتە: چۆن پێغەمبەر(ﷺ) پێویستی بە دونیا ئەبێت، كە دونیا لە پێناو ئەو درووست بووە.

لەمەشدا بە چەندین ئایەت ڕەددراوەتەوە ، وەكو:

{ **وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون** } [الذاريات: ٥٦].

٧ -أقسمت بالقمر المنشق إن له *** من قلبه نسبة مبرورة القسم

لێرەشدا بووسیری سوێندی بە مانگ و بە پێغەمبەر(ﷺ) خواردووە.

لە کاتێکدا لە فەرمودەدا هاتووە:{ من حلف بغير الله فقد أشرك } حديث صحيح رواه أحمد.

٨ -لو ناسبتْ قدرَه آياتُه عِظَماً *** أحيا اسمه حين يُدعى دَارِسَ الرمَمِ

واتە: ئەگەر ئەو موعجیزانە شایستەی پلەو پایەی پێغەمبەر (ﷺ) بوونایە، ئەوا ئەوانەی کە چەند ساڵە مردوون بانگی بکردنایە هەلدەستانەوە. واتە: پێغەمبەر (ﷺ) موعجیزەی شایستەی خۆی وەرنەگرتووە.

زانایان فەرموویانە: ئەم وتەیەی بوسیری ڕاست نییە و بوختانە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) موعجیزەی شایستەی خۆی وەرگرتووە لە خوای پەروەردگارەوە.

٩ -فاق النبيين في خَلق وفي خُلُق *** ولم يدانوه في علم ولا كرم

وكلهم من رسول الله ملتمس *** غرفاً من البحر أو رشفاً من الديم

لەم دوو بەیتەشدا بە هەمان شیوە کەوتووەتە نێو زیادەرەوی کە دەڵێت: پێغەمبەرانی پێش پێغەمبەر (ﷺ) هەموویان داواو تکایان لە ئەوە..هەروەها ئەوە ڕێڕەوی سۆفییە زۆر تەندرەوەکانە وەکو حەللاج کە پیی وایە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوناکییەکی ئەزەلی هەیە لە پێش ئەوەی دونیا درووست بێت.

١٠ -دع ما ادعته النصارى في نبيهم *** واحكم بما شئت مدحاً فيه واحتكم

واته: واز لەو قسانەی گاورەکان بهێنە کە دەربارەی پێغەمبەرەکەیان کردوویانە، جگە لەوەش هەر چۆن ستایشی پیغەمبەر (ﷺ) ئەیکەیت بیکە، ئەم قسەش هەڵەیەکی گەورەیە چونکە جگە لەقسەی ئەوان شیرك و لادان زۆرە.

١١ -لا طيب يعدل ترباً ضم أعظمه *** طوبى لمنتشق منه وملتثم

لەم بەیتەدا بوسیری دەڵێت: هیچ بۆنێکی خۆش نییە بگاتە ئەو خۆڵەی کە ئێسکەکانی پێغەمبەری (ﷺ) لە خۆگرتووە، ئینجا دەڵێت: خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی بۆنی ئەو خاکە دەکات و ماچی دەکات.

ئەم زیادەڕەویشە لە شیرکەوە سەردەردەکات و ماچ کردنی گۆڕی پیغەمبەری خوا (ﷺ) و بۆنکردنی جائیز نییە.

١٢ -ولا التمست غنى الدارين من يده *** إلا استلمت الندى من خير مستلم

واته: هەرکاتێك داوای دەوڵەمەندییم لە هەردوو دونیا کردبیت لە پێغەمبەر (ﷺ) دەستم کەوتووە.خوای گەورەش فەرموویەتی:" وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ " [النحل : ٥٣] ، وقال - سبحانه - : " فَابْتَغُوا عِندَ اللَّهِ الرِّزْقَ واعْبُدُوهُ " [العنكبوت : ١٧]

ڕەخنە لە زۆر بەیتی تریش لە قەسیدەکە گیراوە، لەوانەی کە بە زەقی دیارەو ناتوانرێت بەرگری لێ بکرێت: -إن لم تكن في معادي آخذاً بيدي *** فضلاً وإلا فقل يا زلة القـدم

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەگەر تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا فریام نەکەویت و دەستم نەگریت ئیتر بڵێ پێم خلیسکاوەو تیاچوومە.

لەم بارەشەوە ڕەخنەی لێ گیراوە کە باسی خوای گەورەی نەکردووەو تەنها پێغەمبەری(ﷺ) بە فریاگوزار زانیوە.هەروەهازانایان فەرموویانە: بوسیری بانگەشەی ئەوە ئەکات گوایە نەخۆش بووەو لە خەویدا ئەم قەسیدەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وتووە و، ئەویش عەباکەی خۆی کردووەتە شانی و باش بووەتەوە، ئەی چۆن پێغەمبەر (ﷺ) بەو هەموو هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە ڕازی ئەبێت.

لەکۆتاییشدا، وەکو لەسەرەتای بابەتەکەش ئاماژەم پێدا، دەڵێم: قەسیدەی (البردة) ئەو چەند دێڕەی نەبێت کە بوسیری سنووری عەقیدەی تێیدا بەزاندووە ، هۆنراوەیەکی زۆر کاریگەرەو پڕە لە سۆزو وخۆشەویستی و دانایی و واتای باش، بەڵام مەخابن،

ئەو قسە و ستایشە باشانەی بەوسنوور بەزاندنە تێکداوەو، زۆر موسوڵمانیش کە شارەزای عەقیدەی ئیسلامی بێت، بە هۆی ئەو هەموو زیادەڕەوی و (غلو) وە کە بوسیری لە بوردە کردوویەتی، لە ترسی خراپەکانی ناتوانێت باشەکانیشی بخوێنێتەوە.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە بۆ ژمارەیەك سەرچاوە گەڕاومەتەوە، لەوانە:

- معلومات مهمة عن الدين/محمد جميل زينو.

- فەتوای محمد صالح المنجد لە سایتی الإسلام سؤال و جواب.. دەربارەی البوصيري.

-أقوال علماء السنة في قصيدة البردة، سایتی صيد الفوائد.

# ( أبو طالب )




أبو طالب نازناوە بۆ: (عبد مناف بن عبد المطلب بن هاشم بن عبد مناف بن قصي بن كلاب بن مرة بن كعب بن لؤي بن غالب بن فهر بن مالك بن النضر بن كنانة بن خزيمة بن مدركة بن إلياس بن مضر بن نزار بن معد بن عدنان.)، مامی پێغەمبەرە (ﷺ) و باوکی عەلی یە (ڕەزای خوای لێبێت) کە چوارەم خەلیفەی ڕاشیدین بووە. لە ساڵی ٥٤٠ز لە مەککە لە دایکبووەو، لە ساڵی ٦١٩ز وەفاتی کردووە.

لە نێو کوڕەکانی (عبد المطلب) دا کە یەکێك بوو لە سەران و ناودارانی قورەیش لەسەردەمی جاهیلی دا، (أبو طالب) تاکە برای (عبد الله)ی باوکی پێغەمبەر بووە (ﷺ) کە لەیەك دایك و باوك بوون، لە پاش مردنی عەبدوڵلای باوکی پێغەمبەر (ﷺ) ، عبد المطلب پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگرێتە خۆی وبە خێوی دەکات،

لە پاش مردنی ئەویش وەسیت بۆ بۆ ئەبو تالیبی کوڕی دەکات بیگرێتە خۆی و وەکو منداڵەکانی خۆی بە خێوی بکات.

(أبوطالب) باوکی ئەم کوڕو کچانە بوە: طالب بن أبي طالب، عقيل بن أبي طالب ، جعفر بن أبي طالب ، علي بن أبي طالب ، فاختة بنت أبي طالب (أم هاني) جمانة بنت أبي طالب. خێزانیشی ناوی (فاطمة بنت أسد بن هاشم) کە هەر لە سەرەتای ئیسلامەوە موسوڵمان بوو، کاتێکیش وەفاتی کرد پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر کرد.

(أبو طالب) نەك هەر جیاوازی نەدەکرد لە نێوان پێغەمبەری خوا (ﷺ) و کوڕەکانی خۆی ، بەڵکو سەرەڕای دەست کورتیشی فەزڵی دەداوە سەر منداڵەکانی خۆیدا و لەوان زیاتر بایەخ و گرنگی پي دەدا و زۆریشی خۆشدەویست.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئیسلامی ڕاگەیاند ، ئەبو تالیب لەسەر دینی بت پەرستی خۆی مایەوەو موسوڵمان نەبوو، بەڵام پشتی برازاکەی خۆی بەرنەداو بە هەموو توانایەکی دەیپاراست و داکۆکی لێ دەکرد و ڕێگەی نەدەدا دەستدرێژی بکرێتە سەر، سەرانی قورەیش هەوڵی زۆریان لە گەل ئەبو تالیب دا کە ڕێگر نەبێت لەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بکوژن، تەنانەت جارێکیان کوڕێکی گەنجی جوانیان بۆ هێنا، وتیان ئەم کوڕەت پێ دەدەین خزمەتت بکات وەکو کوڕی خۆت و تۆش (محمد) مان پێ بدە بیکوژین،

چونکە دوژمنی دینی هەردوولامانە، ئەویش وتی: (**بئس ما تسومونني، تعطوني ابنكم أربيه لكم وأعطيكم ابني تقتلونه**؟) واتە: نابەجێتان کرد، کوری خۆتانم پێ دەدەن بۆتان بەخێو بکەم و کوڕەکەی خۆمتان پێبدەم بیکوژن.

کاتێك بێباوەڕانی قورەیش بڕیاری دابڕانیاندا لە گەڵ موسوڵمانان و بۆ ماوەی سێ ساڵ ئابڵۆقەی ئابووریان خستەسەریان و کڕین و فرۆشتن و ژن و ژنخوازییان لەگەڵ ڕاگرتن و برسیان کردن، لە و جێگەی کە دواتر بە (شعب أبي طالب) ناسرا، ئەبو تالیب و خزمەکانی لە تیەی هاشم لە گەڵ موسوڵماناندا بوون لەو ناخۆشي وبرسێتییەی تێیدا بوون بەشدار بوون، تاکو دوای سێ ساڵ بەو شێوەی کە لە سیرەدا باسکراوە کۆتایی پێ هێنرا.

تەنانەت ئەگەر جێگیر بووبێت لە ڕووی سەنەدەوە (ابن اسحاق) دەگێڕێتەوە کاتێك کافرەکانی قوڕەیش داوایان لە ئەبو تالیب دەکرد پیغەمبەریان (ﷺ) تەسلیم بکات، دەیوت:

**والله لن يصلوا إليك بجمعهم *** حتى أوسد في التراب دفينا**

**فاصدع بأمرك ما عليك غضاضة *** و أبشر وقُر بذاك منك عيونا**

واتە: سوێند بە خوا ئەوان بە هەموو کۆمەڵ و توانایانەوە ناتوانن پێت بگەن و زیانت پي بگەیەنن ، مەگەر من مردبم و لە ژێر خاکدا شاردرابیتمەوە، بۆیە بڕۆ بە بێ هیچ ترس و شەرمێك دینی خۆت ڕابگەیەنە بە ئاسوودەیی.

هەروەها دەگێڕنەوە أبو طالب لە خۆشەویستی پێغەمبەردا (ﷺ) بە هۆنراوە وتوویەتی:

**و أبيض يُسْتَسْقَى الغمام بوجهه *** ثمال اليتامى عصمة للأرامل**

**يلوذ به الهُلاك من آل هاشم *** فهم عنده في نعمة وفواضل**

لەم هۆنراوەیەش خۆشەویستی زۆری أبو طالب بۆ موحەممەدی برازای (ﷺ) دەردەکەوێت، (ابن كثير ) لە البداية والنهاية( ٥٧/٣ ).ئەم شیعرەی لە شیعری (معلقات) یەلاوە تۆکمەو بە هێزتر بووە.

(أبو طالب) سەرەڕای داکۆکی کردنی لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، لە سەر دینی بت پەرستی مایەوەو موسوڵمان نەبوو، لەو ماوەی کە موسوڵمانان لە ژێر سزاو ئابڵۆقەی ئابوریدا بوون و بەهۆی نەخۆشکەوتنەوە ( أبو طالب) لەوێ وەفاتی کرد، مردنەکەشی ئازار و خەفەتی زۆری بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەیاند و، تەنانەت ئەو ساڵەی کە أبو طالب و خەدیجەی تێدا وەفاتیان کرد ڕەزای خوای لێبێت بە (عام الحزن) ناونرا. چونکە ئەو دوو کەسە دوو پشتیوانی گەورە بوون بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و بە نەمانی أبو طالب بێباوەڕان جۆرەها ئازاریان بە پێغەمبەر (ﷺ) دەگەیاندا و سووکایەتییان پێ دەکرد .

پێغەمبەر(ﷺ) چووە لای (أبو طالب) لە کاتی سەرەمەرگیدا و داوای لێکرد شایەتمان بهێنێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەبو جەهل و (عبد الله بن أبي أمية) لە لای سەری بوون لەو کاتەدا و هانیان دەدا واز لە دینی باوباپیرانی نەهێنێت،

ئەو - سەرەڕای هەوڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) - لەسەر دینی بت پەرستی مایەوەو ڕازی نەبوو شایەتمان بهێنێت، پاساویشی ئەوە بوو نەوەك بوترێت ئەبوو طالب لە ترسی مەرگدا موسوڵمان بووە، ئەگینا - وەکو لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە أبو طالب ئامادە بوو لەبەر دڵخۆشی برازاکەی موسوڵمان بیت - بەڵام سەرەڕای ئەوەش پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : دەبێت هەر داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم مەگەر خوای گەورە ئەو کارەم لێ قەدەغە بکات، ئیتر ئەوە بوو ئەو ئایەتە دابەزی: {**مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُوْلِي قُرْبَى مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ**} هەروەها ئایەتی: {**إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ**.

ئەهلی سوننەت یەکدەنگن لەسەر ئەوەی (أبو طالب) بە بێباوەڕی مردووەو لە دۆزەخدایە، زۆر بەڵگەش لەو بارەوە دەهێننەوە ، لەوانە ئەو فەرموودەی لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە، کاتێك (العباس بن عبد المطلب )بە پێغەمبەری خوای وت چیت بۆ مامت کرد ئەو ئەوەندە بەرگری لێدەکردی: ئەویش فەرمووی: ئەو لە گۆماوێکی ئاگری بچوکدایە، ئەگەر منیش نەبوایەم لە چینی خوارەی دۆزەخدا دەبوو .

**(قلت للنبي (ﷺ) ما أغنيت عن عمك، فإنه كان يحوطك ويغضب لك قال: هو في ضحضاح من نار، ولولا أنا لكان في الدرك الأسفل من النار)**

کەسانێك کە ناکۆکی یان گومانیان لە بێباوەڕی وموشریکی (أبو طالب) هەبێت، هەندێکن لە سۆفی و ئەشعەرییەکان، بێگومان شیعەکانیش لەبەر عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) ئەبو تالیب بە گەورەترین ئیمانداری دەزانن و دەڵێن ئەهلی سوننەت لەبەر خراپی هەڵوێستیان لە عەلی باوکیشیان کافر کردووە!

(أحمد بن زینی دەحلان) کە دیاترین کەسایەتی بوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی بانگەوازی شێخ (محمد بن عبدالوهاب) کە سۆفییەکی ناسراوەو لەسەردەمی خۆیدا لەو دەمەی موفتی مەککە بووە، کتێبێکی نووسیوە بە ناونیشانی: (أسمى المطالب في نجاة ابي طالب) کە تێیدا موخالەفەی ئیجماعی ئوممەت و هەموو ئەو فەرموودە سەحیحانە دەکات کە باس لەوە دەکەن (ابو طالب) لە سەر بیروباوەری بتپەرستی مردووە. کۆمەڵێك زانای تر کتێبی لەو شێوەیان نووسیوە کە هەموویان یان سۆفی یان شیعەن، لەوانە: کتێبی ( بغية الطالب لإيمان أبي طالب وحسن خاتمته) کە لە لایەن (محمد بن رسول البرزنجي) نووسراوە. لە هاوچەرخەکانیش (حسن بن علي السقاف) کە بەشێکی زۆری لە ژیانی بۆ دژایەتی محمد ناصر الدين الألبانی تەرخان کردووە، لەسەر ئەو بابەتە داکۆکی زۆی کردووە.

شیعەکان و سۆفییەکان زۆر بەڵگەیان باسکردووە کە ڕێگرە لەوەی (ابو طالب) کافر بکرێت،

لە دیارترینیان ئەوەیە چۆن (ابو طالب) کافر بووەو بەرگریشی لە پێغەمبەری ئیسلام کردووە؟

چۆن کافر بووەو ساڵی مردنی بە ساڵی غەم پەژرە دانراوە؟ و هەندێ پرسارو گومتنی تری لەو شێوە.

ئەهلی سوننەش بە تێرو تەسەل بەرپەرچی ئەو گومانانەیان داوەتەوە،

بە کورتیش ئەوەیان خستووەتە ڕوو کە بەرگریکردنی ئەبو تالیب لە پێغەمبەر (ﷺ) بە پاڵنەری خزمایەتی و عەشرەتایەتی بووە نەك بەرگری لە دینی خوا کردبێت،

ئینجا ئەبو تالیب تەنها کەس نەبووە بەرگری لە کەسایەتی پێغەمبەر (ﷺ) کردبێت ، بەڵکو کەسانی تریش لە بێباوەڕان بە پالنەری جیا جیا ئەو کارەیان کردووە، وەکو:

" المطعم بن عدي " و " هشام بن عمر " و " زهير بن أبي أمية المخزومي " و "أبو البختري بن هشام"، تەنانەت نەجاشی پاشای حەبەشە پێش موسوڵمان بوونی هەمان ئەو کارەی کردووەو،

لە ڕوانگەی بەرگری کردن لە ئەو کەسانەی کە هانایان بۆ هێناوە.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە بۆ چەند سەرچاوەیەکی سیرە وەکو سيرة ابن هشام و کتێبی تر گەڕاومەتەوە.

هەر وەها لە چەند سایتێکیش سوودم بینیوە.

# ( ریتشارد دوكینز )



**ریتشارد دوكینز** (Richard Dawkins) زانایەكە لە بواری بیولوجیا وإیثولوجیا، لە نەیروبی / كینیا لە ساڵی ١٩٤١ لە دایكبووە، دیارترین كارە زانستییەكانی جەختكردنەوەیەتی لەسەر ڕۆڵی سەرەكی جینات وەكو هێزێكی پاڵنەر بۆ گەشەكردن.

دوكینز بە یەكێك لە ناودارترین مولحیدە هاوچەرخەكان دەژمێردرێت، خۆی پێناسەی خۆی كردووە بە: (ملحد، إنساني-علماني، شكوكي، وعقلاني علمي) ، بەڵام سەرەڕای ئەوەش لە نووسینێكیدا لە بیبیسی وتوویەتی كە ئەو خاوەنی ڕۆشنبیرییەكی مەسیحییە.

-ناوبانگی هەیە وەكو ئەوەی خاوەن كۆمەڵێك بیروبۆچوونی خۆیەتی لە بواری ئیلحاد و بیردۆزەی (تطور) و هەروەها نكۆڵی كردن لەوەی كە مرۆڤ بە پێی دیزاینێكی ژیرانە درووست بوویێت، كە لەم مەسەلەدا (عدنان إبراهیم) یش لەسەر هەمان ڕێڕەوە و

پێی وایە لاشەی مرۆڤەکان عەیب و نوقسانی زۆری تێدایە و ئەوەی پێی دەوترێت: (التصميم الذكي) ڕەتیدەکاتەوە، نموونەش بە هەڵەکانی چاوو کەناڵی ئەسهەر وپرۆستات ئەهێنێتەوە.

-ڕیچارد کتێب و چاوپێکەوتنی زۆری هەیە، لە ناودارترینیان کتێبی (وهم الإله)ە، کە تێیدا نکۆڵی لە بیرۆکەی ئیمان دەکات، لە هەمان ساڵی نووسینی ئەم کتیبەی لە ٢٠٠٦ هەڵسا بە دامەزراندنی "مؤسسة ريتشارد دوكينز للمنطق والعلوم" کە بریتییە لە دامەزراوەیەکی نێودەوڵەتی بۆ پشتگیریکردنی ئیلحاد و مولحیدەکانی دونیا.

-گومانەکانی ڕیچارد لەسەر بنەمای ئەوەیە ئەگەر داهێنەرێك بۆ گەردوون هەبێت، کێ ئەو داهینەرەی درووست کردووە، لەبەرانبەریشدا وەڵامێکی زانستی پێ نییە بۆ ئەو پرسیارەی زۆر جار ڕاگەیندنکارەکان ڕووبەڕووی دەکەنەوە کە کێ ئاسمانەکان و زەوی وگەردوونی درووست کردووە، هەمیشە ئەڵێت من نازانم وبە شێوەیەکی گستی نکۆڵییان لێ دەکات.

- سەیریش ئەوەیە ریچارد وەکو زانایەکی مولحید نەیتوانیوە متمانەی زانا مولحیدەکانی هاوبیری خۆی بە دەست بهێنێت و هەندێکیان بە توندی وەڵامی بە ناوبانگترین کتێبی ئەویان داوەتەوە کە بریتییە لە (وهم الاله) ، بۆ نموونە بروفیسور بایۆلۆجیای مولحید

آلين أور H. Allen Orr لە کتێبی A Mission to Convert دەڵێت:

**"بالرغم من إعجابي السابق بنشاط داوكينز، لكنني أخشى أنني من أولئك العلماء المضطرين لمفارقته هنا. بالتأكيد يبدو لي كتاب وهم الإله معيبًا بشدة،، فأنا مجبر بعد قراءة كتابه الجديد لاستنتاج أنه في الحقيقة مجرد هاو "**

واتە: کتێبەکەی ریچارد زۆر بە عەیبدار ئەزانێت و تێیدا وەکو کەسێکی ناشی و سەرەتا تەماشای دەکات.

- بەڵکو خودی مولحیدەکان بەرانبەر ئەو کتێبەی ڕیچارد هەست بەشەرمەزاری دەکەن و وەکو کارێکی مناڵانەی لاواز وەسفی دەکەن، بۆ نموونە: مولحیدی ناودار مایکل روس Michael Ruse کە خاوەن وەرگێڕانی کتیبەکانی داروین ە، دەربارەی بەناوبانگترین کتێبی ڕیچارد (وهم الاله) دەڵێت: " **كتاب وهم الإله جعلني أشعر بالخجل من كوني ملحدا، داوكينز وجماعة الملحدين الجُدد يزدرون حتى من يحاول أن يفهم الدين، إنه كطالب في السنة الجامعية الأولى يدور بفرح ويصرخ بصوت عال: " مَن خلق الخالق؟ " وكأنه اكتشف مسألة فلسفية خطيرة "**

واتە: ئەو کتیبە وای لێکردووە وەکو مولحیدێك شەرم لە خۆی بکات، وەکو خوێندکارێکی ساڵی یەکەمی زانکۆ وێنای کردووە کە تەنها ئەوەندە بزانێت بڵێت ئەگەر خوا خولقێنەرە ئەی کێ خۆی درووست کردووە! وەکو ئەوەی بابەتێکی فەلسەفی زۆر ترسناکی دۆزیبێتەوە!

-ئینجا مولحیدەکان وکو داوکینز و هۆکینگ کاتێك باسی تەقینەوەی گەورە ئەکەن و پرسیارن لێ دەکرێت، پێش ئەو تەقینەوە گەورە (الانفجار الكبير) چی بووە؟

ئەو پرسیارەیان بە پرسیارێكی بێ مەعنا وەسف كردووە! جا تەماشا بكە جیاوازی ئەو قسەی ئەوان لە گەڵ ئیمانداران كە پرسیاری كێخوای درووست كردووە چییە.

هەندێ لەو مولحیدانەی بە بابەتی وەسف دەكرێن و ژمارەیەك لە زانا كریستیانەكان، بە پێی بیردۆزەیەك كە پێی دەوترێت:

(منع التسلسل في المؤثرات ) واتایەك نابینن بۆ ئەو پرسیارەی كە دەڵێت:

كێ خوای درووست كردووە، بۆنموونە تۆ ئەڵێی ئەم چێشتە كێ لێی ناوە دەوترێت فڵانە كەس .

ئینجا بڵێیت: ئەی كێ چێشت لێنەرەكەی لێناوە!

یان وەكو توێژەرێك دەڵێت: سەربازێك بیەوێت فیشەكێك بتەقێنێت( فیشەكەكە جیهانە) پێی بوترێت مەیتەقێنە تاكو هاوڕێكەت ئەیتەقێنێت، بە هەموو سەربازەكان وا بوترێت، بەم شێوەش ئەو فیشەكە هەرگیز نتەقێنرێت،

بەلام ئەگەر فیشەكە لە ڕاستیدا تەقێنرا ( وەكو ئەوەی جیهان بوونی هەیە) كەواتە سەربازێك بێ ئەوەی چاوەڕوانی فەرمان لەكەسەوە بكات فیشەكەكەی تەقاندووە.

-تەنانەت هۆكینگ كاتێك ویستی هۆكاری درووست بوونی گەردوون بە بوونی (الجاذبیة) بسەلمێنێت، بەرپەرچ درایەوە بەوەی كە هێزی كێشان بەشێكە لە شوێن و كات ، ئەی شوێن و كات كێ درووستی كردووە.

یان ئەوانەی کە پەنایان بردە بەر یاسای ( میکانیکا الکم) گوایە شتێکە و لە هیچەوە هاتووە وەکو تەفسیرێك بۆ درووست بوونی گەردوون لە خۆیەوە! بەرپەرچ درانەوە کە ئەو هیچەی باسی دەکەن لە فیزیادا شتە، بەڵام دیاری ناکرێت لەبەر ئەوەی زۆر زۆر زۆر بچووکە، بەوەش دەرکەوت کە یاسای (میکانیکا الکم) ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە ئاسای سەبەبیەتەوە، نکۆڵی کردنیش لەو یاسایە جۆرێکە لە خۆکوژی ئەقڵی و لە ڕاستیدا هەموو شتێك پەیوەستە بە یاسای السببية.

-بەڵکو لە کتێبی The Dawkins Delusion, p.٥١ هاتووە کە زۆرێك لە مولحیدە ئەکادیمییەکان پۆزشیان هێناوەتەوەو داوایان کردووە ڕیچارد لەسەر ئەوان نەژمێردرێت وزۆربەی زانا مولحیدەکان - نەخوازەڵا ئیماندارەکان - بە توندی بەرپەرچیان داوەتەوەو وەکو مناڵێك وێنایان کردووە قسە دەربارەی فەلسەفە و ئایین بکات.

-لە ڕاستیدا ڕیچارد بەرانبەر ئەو هەموو بەڵگانەی لە گەردووندا هەیە دەربارەی هەبوونی پەردوەردگار دەستەوسانەو، زۆر جار بە رانبەر پرسیاری ڕاگەیاندنکارەکان دەوەستێت و پەنا بۆ نازانم ئەبات وخۆی لە بەڵگەی فیترەتیش گێل دەکات، کە مرۆڤەکان لە ناخیاندا هەستی پێ دەکەن دەربارەی وجودی خوای گەورە، لەوەش گرنگترئەوەیە هیچ مرۆڤێك وەکو فیترەت هەست بەوە ناکات ئەو پەروەردگارە پێویستی بە کەسێکی تر بێت ئەوی درووست کردبێت، چونکە ئەو خوایەی گەشەی نەکردووە وەکو مرۆڤەکان تاکو بگاتە ئاستی پەروەردگارێتی ونە ئەوەیە کە لە دوای تەقینەوەی گەورە درووست بووبێت تاکو پرسیاری ئەوە بکرێت کێ درووستی کردووە، هەر بۆیە تەنانەت مولحیدەکانیش لەو قسەی ئەوە هەست بەشەرمەزاری دەکەن.

-جێگای تێرامان و سەرسوڕمانە، هەندێ یاسای فیزیایی لە گەردووندا کە ڕیچارد دۆکینز بۆ سەلماندنی ئیلحاد پەنای بۆ بردووە، هەندێ توێژەری موسوڵمان بەهەمان ئەو یاسایانە لە ڕووی زانستییەوە بوونی پەروەردگاریان سەلماندووە!

-ڕیچارد لەسەر بنەمایەکی فیکری ڕوون ئیلحادەکەی بونیات نەناوە، بەڵکو تەنها ویستێکی سوفوستایی و دڵگەرمییەکی دۆگماییە بۆ کوفر کردن بە داهێنەری گەردوون، چونکە ئەو - وەکو هەندێك لە توێژەران دەڵێن - نە ئەوەیە پشتی بە بیردۆزەی ڕێکەوت (نظرية المصادفة) بەستبێت کە هزر و ئەقڵ ڕەتیدەکەنەوە، نە ئەوەشە پشتی بە حەتمیەتی مادی(نظرية الحتمية المادية) بەستبێت کە زۆرێك لە زانا و فەیلەسوفە تەنانەت مولحیدەکانیش وەکو برتراند ڕاسڵ نکۆڵییان لێ کردووە، هەر بۆیە جاری وا هەیە هەندێ ڕاگەیاندنکارە ئەمریکییەکان گاڵتەیان بە قسەکانی دێت و پێی پێ دەکەنن.

- ڕیچارد داوکیز و هەموو مولحیدەکان بەلای کەمەوە هەشت پرسیار و گرفتی گەورە و گرێ کوێرەیان لەبەردەمدایە کەسیان نەیان توانیوە وڵامی زانستی بدەنەوە، لەوانە: چۆنێتی درووستبوونی گەردوون، هۆکاری دروستبوونی گەردوون، ڕێکخستنی وردو سەرسوڕهێنەری گەردوون، سەرچاوەی ژیان، سەرەتاو بنچینەی زمانەکان، هۆش و هزری مرۆڤ، بیروباوەڕی خوایەتی، دیزاینی ژیرانە، شایانی باسیشە بێژەرەکەی کەناڵی جەزیرەی ئینگلیزی هەندێك لەو پرسیارانەی ڕووبەڕووی ڕیچارد داوکینز کردەوە ئەویش خۆی لێ لادا و بە ڕاشکاوی دەستەوسانی خۆی لە وەڵامدانەوەی نیشاندا.

-بەڵکو زیادەڕەوی تێدا نییە بە دەستەوسان بونی داوکینز و هاوبیرەکانی بەرانبەر ئەو پرسیارانەو سەدان پرسیاری تر بە شێوەیەکی زانستی ئەگەر بوترێت:ئەو بووەتە هۆی بە هێزبوونی ئیمانی خەڵکانێکی زۆر لە جیهاندا کە لە قسەکانی ئەو وەکو مولحیدێکی جیهانی وردبوونەتەوە.

- زۆر جار لە چاوپێکەوتنەکانیدا باسی ناڕوونی ئەو یاسایانە دەکات کە گەردوون لەسەر بنەمای درووست بووە، بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە ئەو یاسایانە بەو گەورەو گرنگییە کێ دایهێناون و عەدەم چۆن توانای ئەوەی هەیە یاساگەلێکی وا درووست بکات گەردوون لە سەر بناغەی درووست بوو بێت.

**له كۆتاییدا دەڵێم:** من لێرەدا تەنها ویستوومە ئەم ناودارە مولحیدە بناسێنم نەك بەرپەرچی بۆچوونەکانی بدەمەوە، ئەگەر چی هەندێ ئاماژەی خێرام لەو بارەوە کردووە، خوێنەر لەو بارەوە دەتوانێت کتێبی (نسف أساسات الإلحاد ..الرد على "وهم الإله" لريتشارد دوكينز) بخوێنێتەوە کە دوو بەرگە لە نووسینی: أبو الفداء بن مسعود ،

یان بابەتی: (نظرة في الصراع بين الإلحاد والنصرانية في الغرب).

گرنگیشە بەلامەوە بڵێم: ڕیچارد داوکینز وەکو ئەوەی بە گەورەی مولحیدەکان لەم سەردەمەدا وەسف دەکرێت، ئەوەندەی لە سەر ڕێڕەوی نازانم و لا ئەدرییەتە،

بە هەمان ڕێژە لەسەر ڕێڕەوێکی ئیلحادی پەتی نییە، تەنانەت لە هەڵمەتی ساڵی ٢٠٠٩یدا بۆ بڵاوکردنەوەی ئیلحاد لە یەکێك لە پۆستەرەکانیدا نووسیبووی:

**(على الأرجح ليس هناك إله، فتوقف القلق واستمتع بحياتك)** واتە: گومانی زۆر ئەوەیە کە خوایەك نەبێت، بۆیە پێویست بە دڵەڕاوکێ ناکات و چێژ لە ژیانت وەرگرە)، من پێم وایە ئەگەر کەسێك بیەوێت توێژینەوەیەك لەسەر ئەو پرسیارانەی کە ڕووبەڕووی بووەتەوەووتوویەتی نازانم ئەنجام بدات ، بە دەرەنجامی سەرسوڕهێنەر دەگات کە لائەدریەتی ڕیچارد دۆکینز ئەسەلمێنێت نەك ئیلحاد وبێ باوەڕی ڕەها، بەڵکو هەندێك لە توێژەرەکان ئەڵێن نزیکە یان هیچ نەبێت مەحاڵ نییە هەر کاتێك ئیمانی خۆی ڕابگەیەنێت، ئەو لە چاوپێکەوتنەکەی کەناڵی الجزيرة ئەڵێت: من وەکو زانایەك ملکەچی بەڵگەم هەر کاتێك دەستم کەوێت، هەروەها دەڵێت: من ئەو خوای لە قورئاندا باس کراوە باش نایناسم و بێگومان کەمترین زانیاری دەربارەی ئیسلام هەیە بە شێوەیەکی گشتی وزۆریش باس لە کردەوە خۆکوژییەکان ئەکات ورەخنەیان لێ ئەگرێت.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە کۆمەڵێك بابەتی پەیوەندیدارم خوێندووەتەوە،

لەوانە: بابەتێك لە سایتی الباحثون المسلمون، هل دوكينز ملحد حقا، منتدى التوحيد.

- نظرات في الحالة الالحادية من الناحية النفسية/أحمد حسن/ نظرة في الصراع بين الإلحاد والنصرانية في الغرب، أبي جعفر الخليفي .
- چاوپێکەوتنی داوکینز لە کەناڵی جەزیرەی ئینگلیزی.
- سایتی وێکیپیدیاو سەرچاوەی تر.

# ( فرناندو ماجلان )



لە بورتگال لە ساڵی ١٤٨٠م لە خێزانێکی ئورستوقراتی لە دایکبووە، لە پاش مردنی دایك و باوکی و لە تەمەنی دە ساڵیدا لە کۆشکی شاهانەی شاژن ئەلینۆرا کاریکردووە، لە تەمەنی ٢٥ ساڵییەوە ئیتر بەشداری زۆر جەنگ و گەشتی دەریایی کردووە، سەرکردەی یەکەمین گەشتە کە بە دەوری زەویدا خولاوەتەوە، پیاوێکی زیرەك و ئازاو پشکنەرو توێژەرێکی زانستی بووە، هاوکات کەسێکی دیندار بووە بەو واتای کە مەسیحییەکی توندڕەوو دەمارگیر بووە بۆ ئایینی خۆی و لەو پێناوەدا کاری کردووە.

لە ساڵی ١٥٠٦م وەکو جەنگاوەرێك بەشداری کردووە لە گەشتە بەناوبانگەکەی فاسکۆ دیگاما بۆ هندستان، لەوێش بەشداری ئەو جەنگانەی کردووە لە دژی موسوڵمانان و توانیان هەندێك لە دوورگەکانی موسوڵمانان داگیر بکەن و بیکەن بە موستەعمەرە بۆ بورتگال.

لە دوای بەشداریکردنی کارای ماجەلان لەو جەنگانەی لە مەغریب و لە جێگەکانی تر لە دژی موسوڵمانان ئەنجام دەدرا لە پلەی سەربازەوە بۆ پلەی کەشتیوانی سەربازی وسەرکردەی دەریاوان بەرزکرایەوە.

ماجەلان باوەڕی بەوە هەبوو کە زەوی خڕە، بۆیە دەیەویست گەشتێکی دەریایی بە دەوری زەویدا بکات ، واتە: بەرەو ئەوپەڕی ڕۆژئاوا بڕوات بۆ ئەوەی لە ڕۆژهەلاتەوە دەربچێت، ئەم بیرۆکەی بۆ پاشای بورتگال پێشنیار کرد بەڵام ئەو پێی ڕازی نەبوو، دواتر کۆچی بۆ ئیسپانیا کرد وبیرۆکەکی بۆ پاشای ئیسپانیا پێشنیار کرد و ئەو بە شێوەیەکی مەرجدار ڕازی بوو، مەرجەکەشی بریتی بوو لەوەی نەوەد و پێنج لە سەد دەستکەوتی گەشتەکە بۆ پاشای ئیسپانیا بێت و پێنجەکەی بۆ ماجەلان بێت، هاوکات ببێتە فەرمانڕەوای ئەو دوورگانە کە داگیر دەکرێن و وەکو موستەعمەرەی ئیسپانیا ئەو بە ناوی شانشینی ئیسپانیا حوکمیان بکات، واتە ئامانجی ئەو گەشتەی ماجەلانچەند ساڵ خولیای بوو ئامانجێکی تەنها زانستی نەبوو، بەڵکو ئامانجی داگیرکاری و ئیستیعماریشی لە پشتەوە بووە.

لە ڕاستیدا ئەو بەرهەم و دەستکەوتە زانستیانەیی بۆ ماجەلان باس دەکرێت ڕاستن و ئەو خزمەتی مرۆڤایەتی کردووە بەو کارانەی بەتایبەتی سەلماندنی خڕێتی زەوی، بەڵام ئەوەی کە باس نەکراوەو شاراوەتەوە ئەوەیە ماجەلان ئەو دەستکەوتانەی لە ڕێگەی کوشتنی هەزاران کەسەوە بووە بە تایبەتی لە موسوڵمانانی ئەو دورگانەی کە لە ڕێگەی گەشتەکەیدا داگیری ئەکردن و ماڵ و سەروەتی بە تاڵان دەبردن و دەستدرێژی دەکردە سەر ئافرەتەکانیاندا.

گەشتەکەی ماجەلان بە پێنج کەشتی و ٢٧٠ کەس لە ڕەگەزنامەی جیاواز لە گەڵیدا ئامادەکرا و لە ساڵی ١٥١٩ز بەڕێکەوتن، سەرەتا ڕویشتنە بەڕازیل و لە ماوەی شەش مانگدا لە ئەمریکای باشووردا هەڵسا بە کوشتنی هەرکەسێك کە لەڕووی گەشتەکەیدا ڕاوەستا،هاوکات بە هۆی کەمی ئازووقەوە یەکێك لە سەرکردەی پێننج کەشتییەکان هەڵگەڕایەوە سەر ماجەلاندا ، بەڵام ئەو بە توندی و زەبرو زەنگی خۆی ئەوی کوشت و ئیتر هەڵگەڕانەوەکە دامرکا و لە گەشتەکەیاندا بەردەوام بوون، بەڵام دواتر سەرکردەی کەشتیەکی تر هەڵهات و گەڕایەوە بۆ ئیسپانیا.

لە پاش ئەمریکای باشور لە بەردەوامی گەشتەکەیدا زەریاکەی بینی شەپۆلی نییە بۆیە ناوی نا زەریای ئارام، لە ساڵی ١٥٢١ کەشتیەکانی ماجەلان گەیشتنە فلپین و ڕووبەڕووی دانیشتوانەکانی ئەو دوورگانەی بوونەوە. کە موسوڵمان بوون و شەڕ لە نێوانیاندا دەستی پێکرد، بەڵام ماجەلان لەبەر ئەوەی چەکی تازەو بە هێزی پێ بوو توانی سەرکەوێتە سەریان و لە ناویان بدات، ئیسلام چەند سەدەیەك بوو لە ڕێگەی بازرگان و بانگخوازە موسوڵمانەکانەوە گەیشتبووە دورگەکانی فلپین، پاش سەرکەوتنی ماجەلان لە یەکەم جەنگیدا لە دژی موسوڵمانەکان دابەزییە سەر وشکانی و نیشانەی خاچی لەوێ جێگیر کرد، هەروەها لەگەڵ (سیبۆ) کە سەرۆکی یەکێك لەو دورگانە بوو ڕێککەوت لەسەر ئەوەی دواتر بیکات بە فەرمانڕەوای دورگەکانی تر بە مەرجێك یارمەتی بدات بۆ بە مەسیحی کردنی موسوڵمانان. ئینجا دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی و قەتڵ و عامی گەورەی لە نێو موسوڵمانانی فلپین لەو پێناوەدا ئەنجام دا.

بەڵام لە ڕووبەڕووبوونەوەی دووەمی ماجەلاندا لە گەڵ موسوڵمانانی فلپین لە دوورگەی (ماكتان) كە سەرۆكەكەی پیاوێكی موسوڵمان بوو بە ناوی (لابۆلابۆ) كە توانی سەربازو هێزی زۆر لە دوورگەكانی دەوروبەری ماكتان كۆ بكاتەوە و خۆیان بۆ جەنگی ئەو هێزەی ئیسپانیا ئامادە بكەن، سەرەتا ماجەلان داوای كرد لە لابۆلابۆ خۆی بە دەستەوە بدات و پێی وت:

بە ناوی مەسیحەوە داوات لێ ئەكەم خۆت بە دەستەوە بدەیت چونكە ئێمە ڕەگەزی سپین و لە ئێوە لە پێشترین حوكمی ئەم وڵاتە بكەین، بەڵام لابۆلابۆ لە وەڵامدا پیی وت: ئایین ئاینی خوایەو ئەو خوای كە ئێمە ئەیپەرستین خوای هەموو مرۆڤەكانە بە بێ جیاوازی ڕەنگ و نەژاد.

هێزەكەی ماجەلان لە دوورگەكەی لابۆلابۆ كە سەركردەیەكی لاوی بە هێز بوو نزیكبوونەوە و شەڕ دەستی پێكرد، پاش ئەوەی موسوڵمانان داگیركەرانیان تیرباران كرد و ئەوانیش بە قەڵغان و خوودەكانیان توانیان خۆیانی لێ بپارێزن، پێكدادانێكی دەستەویەخە لە نێوان هەردوو سەركردە ماجەلان و لابۆ لابۆ دەستی پێكرد، لە ئەنجامدا لابۆ لابۆ توانی لە دوو گورزی كوشندەی توندی ماجەلان خۆی بپارێزیت و توانیشی ماجەلان بە لیدانێكی بە هێز بە شمشێرە كورتەكەی بكوژێت و هاوار لە نێو ڕاوچییەكاندا بەرز بوویەوە دەیانوت: لابۆ لابۆ، هاوكات هێزەكەی ماجەلانیش ڕاستەوخۆ ورەیان ڕووخا و پاشەكشەیان كرد، موسوڵمانان لەو جەنگەدا توانیان دەست بگرنە سەر دوو كەشتی لە كۆی ئەو سێ كەشتییەی هێزە ئیسپانییەكە، یەك كەشتیش توانی دەرباز بێت و بەرەو هند و (رأس الرجاء الصالح) بكەوێتە ڕێ و توانیان بەو سی وسێ كەسەی كە لە كۆی دوو سەدو حەفتا كەسەكە كە گەشتەكەی لێ پێكهاتبوون لەسەرەتا بگەنەوە ئیسپانیاو

گەشتەکە پاش سێ ساڵ لە بەڕێکەوتنی تەواو بکەن و بەو شێوەش خولانەوەی دەوری زەویشیان بە سەرکردایەتی ئیلکانۆ بە ئەنجام گەیاند.

شایانی باسە کە گۆڕی ماجەلان تاکو ئێستاش لە فلپینەو لابۆ لابۆ یش بە پاڵەوانێکی نەتەوەیی دانرا کە توانی لە دژی داگیرکەرە ئیسپانیانییەکان ڕاوەستێت و سەرکردەکەشیان کە ماجەلان بوو بکوژێت. جێگای داخە کە زۆرێك لە موسوڵمانان ماجەلان وەکو زاناو توێژەرێك دەناسن و ئەم ڕاستیانە دەربارەی نازانن چونکە تەنها ئەوە فێر کراون کە ماجەلان خرێتی زەوی سەلماندووەو سەرکردەی یەکەمین گەشت بووە کە بەدەوری زەویدا خولابێتەوە وهەرگیز باس لەوە ناکەن کە هەزارانی لە موسوڵمانان کوشتووەو هەزارانی بە زۆر و بە زەبری هێز کردووەتە مەسیحی، هاوکات کەمیشن ئەوانەی ئەو پاڵەوانە موسوڵمانە: لابۆ لابۆ ئەناسن.هەندێ لە ناسیونالیزمەکانی قلیپین پێشنیازی گۆڕینی ناوی فلپینیان کردبوو(کە لە ناوی قیلیپ ی پاشای ئیسپانیا وەرگیراوە) بۆ کۆماری لابۆ لابۆ بەڵام پێشنیارەکەیان سەری نەگرت.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لە چەند سەرچاوەیەك وەرگرتووە، لەوانە:

-بابەتێك لە تۆڕی (الالوكة ) بە ناونیشانی: لابو لابو قتل ماجلان.

-وانەیەکی (نادر بن وثیر) دەربارەی ژیانامەی ماجەلان و گەشتەکەی لە یوتیوب.سایتی ویکیبیدیا بابەتی ماجلان کە زانیارییەکانیان لە کۆمەڵێك سەرچاوەی ئینگلیزی و عەرەبی وەرگرتووە.

# ( ميشيل عفلق )



بیرمەندێکی ناسیۆنالیزمی بە ناوبانگی عەرەبە، لە ساڵی ١٩١٠ لە دیمەشق لە بنەماڵەیەکی مەسیحی لە دایکبووە، خوێندنی لە قوتابخانە فەرەنسیەکانی سوریا تەواو کردووە، دواتر لە گەل صلاح الدين البيطار ی هاوڕێی چووە بۆ پاریس و لەوێ بۆ درێژەپێدانی خوێندن چووەتە زانکۆی سۆربۆن و برەوی بە پێگەیاندنی خۆی داوەو لەوێ پەیوەندی بە زۆر کۆمەڵەی خەباتگێڕەوە کردووە کە کاریان بۆ سەربەخۆیی فەلەستین بواری تر دەکرد.

میشیل عەفلەق پاش ئەوەی کەسایەتی سیاسی خۆی لە ڕێگەی پەیوەندی بە هزرو کەسایەتی وکۆمەڵە سیاسییەکانەوە لە فەرەنسا پێکەوەنا، لە ساڵی ١٩٣٣ لە گەڵ صلاح الدين البيطار ی هاوڕێی گەڕانەوە بۆ سوریا وبۆ ماوەیەك مامۆستا بوون، یەکیك لە خوێندکارەکانی لەو سەردەمە، عبدالرحمن ألباني بووە کە هەندێ یادەوەری سەرنج ڕاکێش دەربارەی عەفلەق دەگێڕێتەوە بەڵکو لە هەلێکی گونجاودا بە جیا بیخەمە ڕوو.

له سوريا ڕوو بەڕووی كۆمەڵێك كاریگەری ئایینی و سیاسی و فیكری بوونەوە، بۆیە هەر زوو مێشێل عەفلەق خۆی بۆ هزری ماركسی یەكلا كردەوەو وتی ماركسیەت پوختەی بیرۆكەو فەلسەفەی مرۆڤەكانە وئایینێكی نوێشە بۆداهاتووی مرۆڤایەتی، هەر بۆیە ئەوان بە تەواوی بڕیاریاندا بە پێی فەلسەفەی ئیشتراكی سۆشیالیزمی ماركسی خەبات بكەن.

له ساڵی ١٩٤١ یەكەم كۆمەڵەی لە ژێر ناونیشانی (الإحياء العربي) دامەزراند، هەر لەو ساڵەشدا وەكو بەرجەستەكردن بۆ بیری ناسیۆنالیزمی خۆی پشتگیری ڕاپەڕینەكەی رشيد عالي الكيلاني لە دژی داگیركەری بریتانی لە عیراق دەربڕی ..لە ١٩٤٧ یەكەمین كۆنگرەیان لە دیمەشق بەست و مێشێل عەفلەق وەكو ڕاگری پارتەكە دەستنیشان كرا ودواتر لە ١٩٥٢ (حزب البعث العربي) لە گەل (الحزب الاشتراكي) بە سەركردایەتی أكرم الحوراني یەكیان گرت و بوونە (الحزب البعث العربي الاشتراكي.

له ساڵی ١٩٤٩ بۆ ماوەیەكی كەم كرا بە وەزیری فێركردن لە سوریا، بەڵام زۆری پێنەچوو لە گەل أكرم الحوراني و صلاح الدين البيطار لەسەردەمی حوكمڕانی ئەدیب شەیشەكلی بەرەو بەیرووت هەڵهاتن و پاش چەند ساڵێكی تر گەڕایەوە بۆ دیمەشق و ڕۆڵی دیاری هەبوو لەیەككگرتنی سوریاو میسر وجارێكی تر گەرایەوە بۆ بەیروت وپاش هەڵگیرسانی شەری ناوخۆیی لە لوبنان لە ساڵی ١٩٧٥ ڕوویكردە عیراق و لەوێ مایەوە، لە ساڵی ١٩٨٥ سەرپەرشتی كۆمەڵێك چالاكی و كاری سیاسی كرد بە مەبەستی درووستكردنی كارێكی سیاسی گەورە بۆ داهاتووی عەرەب و چەندین دانیشتنیان لە بەغدا و لە پاریس لەو بارەوە گرێدا.

مێشێل عەفلەق دامەزرێنەرو باوکی ڕوحی حیزبی بەعس و، پیاوی ماسۆنیەتی جیهاتی وەکو زۆر سەرچاوە ئاماژەیان کردووە، بەردەوام لە ترس و دڵەڕاوکێدا بوو، هەمیشە ترسی لە دەزگاکانی هەواڵگری بوو تیرۆری بکەن، بۆیە لە گەشتەکانیدا بۆ بەیروت و بەرازیل و شوێنەکانی تر ، هەمیشە هاوڕێکانی جێگای نیشتەجێبوونیان بە ناوی خوازراوە بۆ دابین دەکرد و زوو زوو جێگەی دەگۆڕی.لە نامەیەکیدا کە بۆ دکتۆرە أمل بشور ی هاوسەری نووسیوێتی تێیدا ئەوپەڕی سۆزو ترس لە ئایندەی هاوسەرەکەی نیشان ئەدات لە حاڵێکدا بمرێت.

مێشێل عەفلەق وەکو مونەزیری یەکەم حیزبی بەعس لە لایەن نەیارەکانییەوە بەوە تۆماتبار کراوە کە کەسێکی تیۆری بووەو دروشمەکانی تەنها بە ڕواڵەت سەرنج ڕاکێش بوونە وەکو: (**وحدة ، حرية ، اشتراكية** ) و حیزبی بەعس هەر زوو یەکەم دروشمی شکاند کاتێك خۆی دوو باڵی گەورەی لێ جیابوویەو بوونە هۆکاری پەرتەوازە بوون وناکۆکی گەورەی چەندین میللەتی عەرەب کە موژدەی یەکگرتن و ئازادی و سۆشیالیزمییان بۆ هێنابوون.بە هەمان شێوە دروشمی ئازادی کە ئەوان بوونە گەورەترین دوژمنی ئازادی ودروشمەکانی تریشیان وە کو:( **أمة عربية واحدة ذات رسالة خالدة)** هەمووی بریتی بوو لە ڕوپۆشێکی درۆینە بۆ ئەو دوکتاتۆریەتەی لێدوانی لە ڕاستی ئامانج و ڕێبازی ئەوان دە کرد. عەفلەق بە ڕواڵەت و ئەوەندەی پشتگیری ڕێبازی قەومی و مارکسی خۆی پێ بکات، هەمیشە وایدەردەخست کە وەکو سەرکردەیەکی عەرەب شانازی بە پێغەمبەری ئیسلامەوە دەکات و دەیوت:

**(كان محمد كل العرب فليكن كل العرب اليوم محمدا)** واتە: موحوممەد هەموو عەرەب بوو، دەی با هەموو عەرەبیش موحوممد بن، ئەوەش لە عەفلەقەوە سوود وەرگتنێك بوو دوور لە بنەما ئاكارییەكان لە سۆزی خەڵكی بۆ ئیسلام و ڕاكێشانی زۆرترین ڕێژەی خەڵكی بە ناو ئیسلامەوە بۆ حیزبەكەی، بۆیە ئەوان تەنانەت لە جەختكردنەوشیاندا لە سەر بنەماكانی عەلمانیەت مەبەستیان بوو عەلمانیەتی ئیلحادی و عەلمانیەتی نا ئیلحادی لە یەكترتر جیا بكەنەوە و، نەك هەر گومانی بێ باوەڕی وئیلحاد لە خۆیان دووربخەنەوە، بەڵكو سوور بوون لەسەر ئەوەی ئیسلام وەكو كەلەپورێكی عەرەبی وێنا بكەن و شانازیشی پێوە بكەن، كە ئەمەش شێواندنێك بوو بۆ بنەما سەرەكییەكانی ئیسلام لە بیروباوەڕدا، تەنانەت خودی مێشیل عەفلق لەوە بەدەر نەبوو وەكو لە وتارەكانیدا لە كتێبی (في سبيل البعث ) دەردەكەوێت.

عەفلەق وەكو نەتەوە پەرستێك و هێمایەك بۆ بیری چەپ، پێی وابوو پەیوەندییەكی تۆكمە لە نێوان ئیسلام و هزری ناسیۆنالیزمیدا هەیە، لە لایەكی تریشەوە پەیوەندییەكی بە هێزی لە نێوان عەلمانییەت و بیری ناسیۆنالیزمی عەرەبیدا دەبینی و ئەمەش لە نووسینەكانیدا بە ئاسانی تێبینی دەكرێت كە عەفلەق دەیەویست ئیسلام وەكو ئامرازێك بۆ خزمەتكردنی بیری نەتەوایەتی بە كاربهێنیت.

عەفلەق لەسەرەتای خەباتیدا لە پێناو فیكری ناسیۆنالیزمی ماركسیەتی بە چاكترین ڕێگەچارە دەستنیشان كرد، بەڵام لە دوای ساڵانێك لەو بیرۆكە پاشگەز بوویەوەو وتی ماركسیەت دوژمنی بیری نەتەوایەتییەو دەیرووخێنیت.

مێشێل عەفلەق خاوەن کتێب و نووسینی زۆرە، لە دیارترینیان (في سبيل البعث) کە کۆکراوەی وتارەکانی ئەوە لە قۆناغەکانی تەمەنی حیزبیدا، لە دوو بەرگدا کۆکراوەتەوەو لە دوای مردنیشی نووسینەکانی تریشی بۆ زیاد کراو لە پێنج بەرگدا چاپ کران.

عەفلەق ئەگەرچی هاوشێوەی دیکتاتۆرەکانی جیهان وەکو ستالین و هیتلەر و موسولینی و چاوچیسکۆ قەتڵ وعامی بە دەستی خۆی نەکردووە، بەڵام مامۆستا ومونەزیرو دامەزرێنەری دوو بەرجەستەکردن بوو بۆ حیزبێکی خوێنرێژ کە (حزب البعث العربي الاشتراكي) بووە، کە مێژوویەکی درێژیان بووە لە کوشتاردا، یەکەمیان حیزبی بەعسی عێراقی کە لەڕێگەی سەرانی ئەو حیزبەوە بەتایبەتی صدام حسین و دارودەستەکەی توانیان لە گەڵ ڕوباری دیجلەو فوراتدا ڕوبارێکی ترلە خوێنی عێراقییەکان بخەنە ڕێ، ئەوی تریشیان ڕژێمی ئەسەدی باوك وکوڕبوو کە سەرەڕای ناکۆکی فیکریان لە هەندێ مەسەلەدا لە گەل عەفلەق، بەڵام لە کۆتاییدا ئەو هەر باوکی ڕوحی حیزبی بەعس بوو بە شێوەیەکی گشتی وئەوانیش مێژوویەکی ڕەشیان بۆ دونیا تۆمار کردووە لە کوشتی میللەتی خۆیان..جگە لە بەعسیەکانی یەمەنیش کە بە هەمان شێوە شانازیان بە عەفلەقەوە کردووە

.

جگە لەوەش عەفلەق وەکو ناودارێك کە بە بیرمەند و فەیلەسوف وەسف کراوە، هەموو هەوڵێکی خۆی بەگەر خستبوو بۆ ناشیرینکردنی مێژووی ئیسلامی و وێناکردنی ئیسلام وەکو بزوتنەوەیەکی عەرەبی کە خەباتی لە پێناو ناسۆنالیزم و سۆشیالیزم و بیری چەپدا کردووە

تەنانەت هەڵگرانی ئەو دینەش لە هزری بەعسدا هەموویان بریتین لە پاڵەوانی عەرەب کە لەپێناو عەرەبدا کۆششیان کردووە.

هەروەها لەتاوانە گەورەکانی تری ئەوەبوو لە ڕێگەی دەسەڵاتی لەسەر حیزبی بەعس توانی مەناهیجی خوێندن بە ڕەنگی ئایدۆلۆجیای بەعس ونەتەوەپەرستی ڕەنگ بکات و، مێژووی ئیسلام لە لای نەوەی تازە پێگەیشتوو و خوێندکارانی زانکۆ بە شێوێندراوی و دوور لە حەقیقەتی خۆی هکو بەرنامەیەکی خوایی و سیستمێکی بەڕێوەبردن بۆ ژیان نیشان بدات.

بەعس بەو مێژووە ڕەشەی کە هەیانبووە، تاك بە تاکی ئەو حیزبە لە ئەندامان و سەرکردەکان ، مێشێل عەفلەق یان بە مامۆستا و ئیلهام بەخشی خۆیان زانیوە، بۆیە ئەو بە لێپرسراو دادەنرێت بەرانبەر هەموو دڵۆپە خوێنێك کە تاك و سەرکردەیەکی بەعسی ڕژاندبێتیان لە عێراق و سوریا ویەمەن و هەر جیگەیەکی تر.

عەفلەق تەماشای ئیسلامی وەکو بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە دەکرد و کەسایەتی پێغەمبەریشی (ﷺ) لەو سیاقەدا بەکاردەهێنا، بۆیە بەو فیکرە ناسیۆنالیزمە کە داکۆکی لێ دەکرد، هەوڵی دەدا ئیسلام وەکو ئامرازێك بەکاربهێنێت و بە دینێکی عەقائدی وا وێنای بکات کە پێغەمبەرێکی عەرەب دینێکی بۆ عەرەبەکان هێناوە وشۆڕشی لە دژی غەیری عەرەبەکان کردووە وئیسلامی لە ڕێگەی کۆمەڵە ڕەهەندێکی مارکسی و سۆشیالیزمی دەناساند بۆ شوێنکەوتوانی، ئەو بە ئاشکرا ڕزگاری مرۆڤایەتی لە سۆشیالیزمدا دەبینی.

یەکێکی تریش لە گەورەترین تاوانەکانی عەفلەق ئەوەبوو بیری ناسیۆنالیزمی وەکو جێگرەوەو ئەلتەرناتیف بۆ ئایین نیشان دەدا لە نووسینەکانیدا وەکو سیستمێکی تەواو بۆ ژیان وێنای دەکرد، کە پێویستی بە ئیسلام نییە مەگەر وەکو ئامرازێك کە تەنها خاڵی گرنگی ڕەهەندە عەرەبییەکەی بێت.

مێشیل عەفلەق لە ساڵی ١٩٨٩ لە نەخۆشخانەیەك لە پاریس وەفاتی کرد و بە مەبەستی ناشتنی تەرمەکەیان بۆ بەغدا گەڕاندەوە ، حکومەتی عێراق لە ڕێورەسمێکی گەورەو شکۆداردا لە مزگەوتی ئەبو حەنیفە نوێژی لەسەر کرا وتەرمەکەیان بەخاك سپارد و صدام حسين و عزة الدوري وهەندێکی تر لە سەرکردەکانی بەعس تابوتەکەیان لەسەر شان هەڵگرتبوو، قەبرێکی نەخشێنراوی گەورەیان بۆ ئامادە کرد کە گومەزێکی شینی لەسەر درووست کرابوو لە باخچەی بارەگای نەتەوەیی حیزبی بەعس لە بەغدا.

ئەوەی جێگای بایەخ و سەرنجی جیهان بوو ئەوەبوو کە صدام حسين پاش مردنی عەفلەق موسوڵمان بوونی ئەوی ڕاگەیاند و، کوڕێکی میشیل عفلق یش بە هەمان شێوە هەواڵەکەی پشت ڕاست کردەوەو،وتی باوکم نامەیەکی لە ناو قورئانێکدا بەجێهێشتووە کە تێیدا شایەتمانی هێناوەو موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندووە، ئەو وتبووی گوایە لە ساڵی هەشتا کاتێك لە گەشتێکدا عەفلەق لە پاریسەوە بەرەو بەغدا دەگەڕێتەوە ، فرۆکەکەیان لە کەوتن نزیك بووەتەوەو ئیتر ئەویش ئەو نامەی نووسیوە، بەڵام دواتر فرۆکەکە توانیویێتی بە سەلامەتی لە فرۆکەخانەی بەغدا بنیشێتەوە، صدام حسین: خۆیشی پاش دەستگیرکردنی لە لایەن هێزەکانی ئەمریکا ئەوەی لە لای پارێزەرەکەی دووپات کردەوە کە خۆی دەستی بووە لە موسوڵمان بوونی میشیل عفلق دا.

من وەکو خۆم باوەڕم بەو هەواڵە نییە و بەشانۆگەرییەکی سەددامی ئەزانم بۆ ئەوەی حیزبەکەی لە ئایینی مەسیحی دووربخاتەوەو وەکو سەرکەوتنێکی نەتەوەیی ئەو سەروەرییەی درووستکردووە کە دامەزرێنەرو باوکی ڕوحی حیزبی بەعس موسوڵمان بووە، ئینجا ئەگەر ڕاستیش بێت، ئەو موسوڵمان بوونە چی کاریگەرییەکی هەیە کە خاوەنەکەی ڕاینەگەیەنت و لەو هەموو کارەساتانەی کە هەیبووە تەوبە نەکات وپاشگەزنەبێتەوە.

بەڵام هاوکات لە کاتێکدا زۆر کەس و لایەن لەوە بە گومانن کە میشیل عفلق موسوڵمان بووبێت، هۆکارەکەشیان بۆ ئەوە گەڕاندووەتەوە کە صدام بەو هەواڵە ویستوویەتی حیزبی بەعس لە مەسیحییەتەوە دوور بخاتەوە، بەڵام کەسانێکی تریش هەن باوەڕیان بە موسوڵمان بوونی مێشێل عەفلەق هەیە وبەڵگەکان دەخەنە ڕوو و،

یەکێك لەوانەش کە داکۆکیان لەسەر ڕاستی موسوڵمان بوونی عەفلەق کردووە بیرمەندی میسری محمد عمارة بووە.

لە ٢٠٠٣ لە دوای بڕیاری بنەبڕ کردنی بەعس (اجتثاث البعث)هێزەکانی ئەمریکا هەڵسان بە تەقاندنەوەی گۆڕەکەی مێشێل عەفلەق وئەمەش ناڕەزایی لای زۆرێك لەعەرەبەکان بەتایبەتی قەومییەکان لێ کەوتەوە.

هەڵساوم بە بینینی چەندین بابەتی دەکویمەنتاری و خویندنەوەی پەیوەندیدار بەم باسە پێش ئەوەی دەست بە نووسین بکەم.

سەبارەت بە زانیارییە گشتییەکانی ئەم بابەتەش لە کۆمەڵێك سەرچاوە وەرمگرتووە کە هەندێکیان لە ویکیبیدیا ئاماژەیان بۆ کراوە، لەگەڵ زیادکردنی هەندێ بۆچوون و هەڵێنجان لە کلتی خوێندنەوەی خۆم بۆ ژیاننامەی مێشیل عەفلەق.

**ئەو موسوڵمان بوونە چی کاریگەرییەکی هەیە کە خاوەنەکەی ڕاینەگەیەنت و لەو هەموو کارەساتانەی کە هەیبووە تەوبە نەکات وپاشگەزنەبێتەوە.**

# ( گیڤارا )



إرنستو "تشي" جيفارا، له ئەرجەنتین له ساڵی ١٩٢٨ له بنەماڵەیەکی بۆرجوازی له دایکبووه، له تەمەنی دوو ساڵییەوه تاکو مردنی نەخۆشی هەناسەسواری (ربو) لەگەڵ بوو، له سەرەتای گەنجییەوه خوینەری مارکس و لێنین و ئێنجلز بووه، شۆڕشگێڕێکی مارکسی کوبییه، پزیشك و نووسەر وسەرکردەی جەنگی چەتەگەری بووه، دواتریش بووەته پیاوی دەوڵەت و کەسایەتییەکی دیار له شۆڕشی کوبا ولەسەر ئاستی جیهان.

له ساڵی ١٩٥٣ له بۆینس ئایرس کاتێك له ساڵی کۆتایی کۆلێژی پزیشکی بوو ، له گەڵ هاوڕێیەکی به ماتۆڕ گەشتێکیان به ئەمریکای لاتینیدا کرد و، ئەو گەشته کەسایەتی ئەوو هەستنکردنی به یەکێتی ئەمریکای باشوری له لا درووست کرد،هەروەها ستەمی ئیمپریالیەکان له وەرزێره هەژارەکان هەستی وروژاند وسەرنجی ڕاکێشا.گیڤارا له ئەنجامی ئەو گەشتەیدا گەیشته ئەوەی چارەسەر تەنها له شۆڕشێکی جیهانیدایه.

لە ساڵی ١٩٥٣ ڕۆیشت بۆ مەکسیك کە پەناگەی شۆڕشگێڕانی ئەمریکای لاتینی بوو، لەوێ بە کەسایەتی ڤیدیل کاسترۆ سەرسام بوو و ئاواتی ئەوە بوو چاوی پێ بکەوێت، کاسترۆ ئەو دەمە لە زیندان بوو، پاش ئازادبوونی لە ١٩٥٥ گیڤارا بە دیداری گەیشت و لەوە دڵنیا بوو کە ئەو کەسایەتییەی بە داودا دەگەڕێت دەستی کەوت، پەیوەندێکی بەهێز لە نێوانیاندا درووست بوو، پێکەوەش پلانی ڕزگارکردنی کوبایان لە دەسەڵاتی (باتیستا) داڕشت، لە پاش چەند شەڕو ڕووبەڕوو بوونەوەیەك توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن و دەسەڵاتی (باتیستا) یان ڕوخاند سەرکەوتنی شۆڕشیان ڕاگەیاند و گیڤارا بوو بە وەزیری شۆڕش وسەردانی زۆر وڵاتی کرد و چاوی بە (جمال عبد الناصر) و(نهرو) و(تیتو) و(سوکارلو) کەوت و دواتر بوو وەزیری پیشەسازی و لە ڕاستیدا ئەو لە دوای کاسترۆ کەسی دووە بوو لە وڵاتدا.

لە دیدوتێڕوانینی بۆ چەمکەکانی شۆڕش لە گەڵ کاسترۆ ناکۆکی کەوتە نێوانیان و گیڤارا دەستی لە هەموو ئیش و کاری دەوڵەت هەڵگرت و تەنانەت خێزانەکەشی بە جێهێشت و بە مەبەستی درووست کردنی سوپای شۆڕشگێڕ ڕووی کردە کۆنگۆ لە ئیفریقیا، بەڵام خەڵکی ئەو وڵاتە لەوێ هاوکاریان نەکرد و وەکو کەسێکی نامۆ تەماشایان کرد و قەناعەتیان بە ئامانجەکانی نەکرد.

بۆیە پاش ئەو ئەزموونە تاڵەی ڕووی کردە پۆلیڤیا و لەوێ توانی لە کرێکارو وەرزێرەکان چەندین کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی چەکدار درووست بکات وشۆڕش ڕابگەیەنن، بەڵام سوپای پۆلیڤیا سوپایەکی بەهێز بووجیاواز بوو لە سوپای پێشووی کوبا، ئەمریکاش هاوکاری ئەکردن بۆیە گیڤارا شکستی

هێنا، بەڵام هەرچۆنێك بوو تا ساڵی ١٩٦٧ هەر بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی دەستگیر کرا و کوژرا لەوێ.

گیڤارا بە ئەوپەڕی باوەڕو قەناعەتەوە متمانەی بە بنەماکانی مارکس و لینین و ئێنجلز بوو، بۆیە:

-هەوڵ و کۆششی بۆ ئەوە بوو موڵکییەتی تایبەتی کەس نەمێنیت و هەموان بەشدار بن پێکەوە لە بەکارهێنانی هۆکارەکانی بەرهەم هێنان و بەشێوەیەکی گشتی باوەری بە "اشتراكية الخيرات" هەبوو، واتە گەل ومیللەت پێکەوە لە بەروبووم و داهاتەکاندا بەشدار بن، لەم بارەشەوە بەرەوای ئەزانی ماڵ و سەروەتی خەڵکی بۆ ئەو مەبەستە زەوت بکات.

-باوەڕی بە سیستمی هاوسەرگیری و چوار چێوەی خێزان نەبوو، بەڵکو وەکو ئینجلز باوەری وابوو ئەو پرسە پەیوەندییەکە لە نێوان کوڕ و کچدا چۆن بیانەویت بەو شێوە ڕێکی ئەخەن و ،ئافرەت تەواوی سەربەخۆیی هەیە لە بڕیاردا و پێویستە مناڵیش بە هەمان شێوە سەربەخۆ بن و بڕیار لەلای خۆیان بێت نەك لای دایك و باوك.

-گیڤارا وەکو قوتابییەکی سەرسەختی قوتابخانەی مارکسییەت، باوەڕی وابوو ئایین گەشەکردنێکە بۆ قۆناغەکانی مێژوو، شیوعییەتیش ئەو پێشکەوتنەیە کە ئایینەکان دەکاتە بابەتێکی ڕواڵەتی ودەبێتە هۆکارێك بۆ پوکانەوەو نەمانی.

-گیڤارا سەر بەو تەوژمە فیکرییە بوو و تاسەر ئێسقان بەرگری لێ دەکرد، کە ملیۆنەها خەڵکیان لە جیهاندا کوشت. خودی گیڤارا مرۆڤ کوژێکی زۆر ترسناك بوو، مرۆڤ کوشتن - وەکو "لوسیانو میدینا"ی پەیامنێر لەسەردەمی کاسترۆ دەڵێت بۆ گیڤارا وەکو ئەوە بوو پەرداخێك ئاو بخواتەوە.

-گیڤارا لە دیدی "أوجستین سوبریرون" کە وەکو پەیامنێرێك لە گەڵ ئەوو کاسترۆ کاری کردووە، پێی وابوو ئەو دەستەوسان بوو لەوەی خۆشەویستی کوبییەکان بۆ خۆی رابکێشێت ، بۆیە بە "غامض"، و"متحفظ"، و"متعجرف"، و"غیر صریح".. وەسفی کردووە، واتە: لێڵ ونادیار زبروتوندو ناڕاشکاو.

-گیڤارا کە ڕقی لە ستەم و ستەمکاران بوو، بە دەستی خۆی، یان بەفەرمانی ڕاستو خۆی خۆی، سەدان زیندانی بەرەو سێدارە دەنارد بێ ئەوەی گوێ لە بەرگریکردنیان بگرێت، بەڵکو باوەری وابوو تەنها بە گومان کەسەکان بکوژێت،

تەنانەت جارێکیان گومانی لە سەربازێکی خۆی کرد، یەکسەر کوشتی وسعاتەکەی دەستی لێکردەوەو دواتر بە شانازییەوە لە یادەوەرییکانیدا باسی ئەوەی کردووە. لەو ماوەش کە دەسەڵاتی بوو لەسەردەمی شۆڕشی کوبا، بە گەورەترین قەسابی مرۆڤ کوژ دەژمێردرا، جگە لە رائول ی برای کاسترۆنەبێت، کەس لە مرۆڤ کوشتندا کێبڕکێی ئەوی پێ نەدکرا.

-دواتریش لە پۆلیڤیا خەڵکانێکی زۆری بە دەستی خۆی یان بە فەرمانی خۆی کوژران، بە پاساوی بەکرێگرتەی سەرمایەداری خەڵکانێکی زۆری دەکوشت و ئەشکەنجە دەدا.

بۆ جێبەجێکردنی لە سیدارەدان گیڤارا هەرگیز باوەری بە دادگاییکردن نەبوو، ئەیوت ئەوە هەندي وردەکاری بۆرجوازی کۆنە وکاتی بەسەر چووە، ئەمە شۆڕشەو شۆڕشگێڕان پێویستە ببنە ئامرازێکی سارد بۆ خەڵك کوشتن.

-لە نامەیەکیدا بۆ دایکی لە ١٥ تموز ١٩٥٦ دەڵێت: من مەسیحی نیم و دژ بە هەموو چاکەیەکم، من لە جیاتی ئەوەی بە خاچەوە هەڵواسرێم ، بە هەموو چەکێك لە بەردەستمدا بێت خەریکی کوشتن ئەبم.کاتێکیش هەواڵی لە دیکبوونی ئەلیدای کچی دوومیان پێدا، بە هاوسەرەکەی وت: ئەگەر کۆرپەکە کچە ، لە سەربانەوە فڕەی بدەنە خوارەوە.

-نووسەری یادەوەرییەکانی گیڤارا (هـ.أ.روس ك.ب.فولف) بە هەموو شێوەیەك هەوڵی داوە گیڤارا وەکو پاڵەوانیك دەربخات وباس لە هەندێ هەڵوێستی جوامێرانەی ئەو دەکات پێش کوژرانی، کە بووەتە مایەی ڕەخنەو، بە درۆ و قسە هەڵبەستن تۆمەتبارکراوە، چونکە گیڤارا کاتێك لە پۆلیڤیا دەستگیر کرا ئەو قسە بە ناوبانگەی کرد کە وتی: من گیڤارا م ، تەقەم لێ مەکەن، بە زیندوویی بۆ ئێوە باشترم تا بە مردوویی! لە ڕاستیدا ڕاگەیاندنی جیهانی و لایەنەکانی سەر بە مارکسیەت، یەك لایەنی ئەم سەرکردەیان بە جیهان نیشان داوەو دیوەکەی تریان بە تەواوی شاردووەتەوە، بۆ نموونە :

*ئەوەیان باس نەکردووە لە نێوان ١٩٥٧ بۆ ١٩٥٩ زیاد لە ١٨٠ هەشتا دۆسیی وەکو تاوانی جەنگ و کۆمەڵکوژی لەسەرە کە هەمووی بە ناوو بەروار و بە وینە پارێزراوە.

*باسی ئازایەتی ئەویان کردووە لە کوشتنی زندانییەکانی قەڵای کوبا بەدەستی خۆی ، بەڵام باسی ئەوەیان نەکردووە چی ترس وبیمێك ڕووی تێدەکات کاتێك لە پۆلیڤیا دەستگیر دەکرێت و لەسەر هەمان شێوازی خۆی بە بێ دادگاییکردن دەیکوژن.

*هەروەها باسی ئەوەشیان نەکردووە ، گیڤارا چەند لایەنگرو خۆشەویستی هەیە لە جیهاندا دە ئەوەندە دوژمن و ناحەزی هەیە کە سەدان بەڵگەیان لەسەری تۆماکردووە وەکو ئەنجامی تاوانی جینۆسايد و گوێنەدانی بە هیچ لە بنەماکانی ڕەوشت و ئایین ودادگەرێتی و داب و نەریت.لە ڕاستیدا دەکرێت گیڤارا لە ڕوانگەی مارکسیەکانەوە پاڵەوانێك بێت، بەڵکو دەکرێت لە ڕوانگەی زۆرێك لە عەلمانی و لیبرالییەکانی دونیاوە کەسێك بێت جێگای شانازی بێت، دەشێت ببێتە ئەستێرەی سینەماکانی هۆلیوود، چونکە ژیانی لە پێناو بەجێهێنانی بنەماکانی ئەو ئایدولۆژیا فیکرییەی مارکس و لینین و ئێنجلز بەسەربرد وهەوڵیدا بەشێوەیەکی پراکتیکی بەرجەستەی بکات.بەڵام هەرگیز لە ڕوانگەی موسوڵمانێکەوە کە کەمترین شارەزاییی لە ئایینی خۆی هەبێت، نابێت و نادرووستە بە گیڤارا کاریگەر بێت، چونکە ئەو وێڕای هەموو ئەوەی باس دەکرێت لە خەبات و بەرخودانی لە پێناو میللەتی کوبا و میللەتانی تر، ئەو بێگومان تاوانبارێکی خوینمژ بووە و لەسەر بنەمای بیروباوەری مارکسیەت کوشتارگەی ناخ هەژێنی زۆری بۆ مرۆڤایەتي درووست کردووە، خەباتی ئەو لە پێناو فیکرو بیروباوەڕی مارکسیدا بووە کە لەگەل ئیسلام وهەموو ئایینێکدا دژ بە یەکترن،

بۆیە بە هیچ شێوەیەك درووست نییە موسوڵمان بە کەسێکی بێ دینی مرۆڤ کوژی وەکو گیڤارا سەرسام بێت یان خۆشی بوێت.

-جێگای تێبینی وسەرنجیشە، کە عدنان إبراهيم هاوشێوەی ستایشکردنی بۆ داروین و جلال الدين الرومي وبوطي وياسر الحبيب، لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیدا ستایشیکی زۆری گیڤارا دەکات و وەکو خەباتگێڕو کەسایەتییەکی گرنگی جیهان ستایشی دەکات، بەڵکو ئەڵێت ئیمانداریش بووە لە ڕاستیدا هەرچەند بەڕواڵەت بێ دین بووە!

-گیڤارا لە ساڵی ١٩٦٧ لە پۆلیڤیا لە لایەن سوپای ئەو وڵاتەو بە یارمەتی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا دەستگیر کرا وسەرۆکی پۆلیڤیا فەرمانی کوشتنی دەرکرد و نۆ فیشەکی لە لایەن سەربازێکی نیوە سەرخۆشەوە پێوەنرا کە بەر دەست و قاچی و شان و سنگ وقوڕگی کەوت، دوای ئەوەش پزیشکێك هات و هەردوو دەستی بڕی و ناردیان بۆ بوینس ئایرس بۆ ئەوەی شوین پەنجەکانی بەراورد بکرێت لەگەل ئەو شوێن پەنجانەی لە دۆسیەکی ئەودا لە پۆلیسی ئەرجەنتین پارێزرابوو. لاشەکەشیان بۆ شوێنێکی نادیار برد و نەزانرا ئایا نێژراوە یان سوتێنراوە، بەڵام دوای ساڵانێك وترا گوایە تەرمێکیان دۆزیوەتەوە وا دەرئەکەویت تەرمی گیڤارا بووەو لە گۆڕێکی تایبەتدا لە کۆبا نێژرا.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە خوێندنەوەی زۆرم ئەنجامدا، لەوانە:

- تشي جيفارا مناضل للحق أم كان مناضلا للظلم ؟/أبوحسين الاشبيلي المعافري.

- هەندێ وتاری پەیوەندیدار لە ڕۆژنامەی المصري اليوم و القدس.

-ژیاننامەی گیڤارا لە سایتی وێکی پیدیا، کە ئەویش لە چەندین سەرچاوە وەریگرتووە.

# ( راشد الغنوشي )



کەسایەتییەکی ئیسلامی تونسییە لەسەر ئاستی جیهان ناوبانگی هەیە، لە تونس لە ساڵی ١٩٤١ لە دایکبووە، بنەماکانی ئاینی لە جامعة الزيتونة خویندووەو دواتر لە ساڵی ١٩٦٤ چووەتە میسر بۆ خوێندنی کشت وکاڵ لەوێیش بە هۆی تێکچوونی پەیوەندی نێوان میسر و تونس نەیتوانیوە بەردەوام بێت و لە دوای ساڵ و نیوێك چووتە دیمەشق ولەوێ لە ساڵی ١٩٦٨ بەکالۆریۆسی لە فەلسەفە بەدەست هێناوە و، دواتر چووەتە فەرەنسا بەمەبەستی درێژەدان بە خوێندنی باڵا لە سۆربۆن و فێری زمانی فەرەنسی بووە، لە فەرەنسا سەرەتاکانی کاری ئیسلامی دەست پیکردووە و پەیوەندی بە کۆمەڵەی التبليغ کردووە، بەڵام دوای ساڵێك لەبەر هەندێ هۆکاری خێزانی گەڕاوەتەوە تونس و بووەتە مامۆستای بابەتی فەلسەفە.

لە کۆتایی شەستەکاندا غەننوشی بزوتنەوەی نەهزەی ئیسلامی درووست کردووە و، چالاکییەکانی خۆی لە نێو قوتابیاندا لە تونس دەست پێکردووە.

راشد الغنوشي چەندین جار بەهۆی کاری ئیسلامی لە تونس بە زیندانی حوکم دراوە، لە ساڵی ١٩٨١ یانزە ساڵ حوکم دراوە ودوای چەند ساڵێك لە لێبوردنێکی گشتیدا ئازاد کراوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٧ حوکم دراوە بە زیندانی هەتا هەتایی وبەهۆی کودەتای بن عەلی لە ١٩٨٨ ئازادکراوە، دوای ئەوە ڕووی کردووەتە جزائیر و ئینجا سودان ولەوێیشەوە چووەتە بریتانیا ولە ١٩٩٣ مافی پەنابەرێتی سیاسی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٩١ و ١٩٩٩ لە تونس دووجاری تر حوکمی زیندانی هەتا هەتایی دراوە بە شێوەیەکی غیابی.

غەننوشی وەکو فیکر بە یەکێك لە سەرکردەکانی ئیخوان دەژمێردرێت و ئەو هەمیشە بەوە شانازی کردووە ئەگەر چی بەرنامەی ئیش و کاری ئەو لە نەهزە بە شێوەیەکی پەتی ئیخوانی نەبووە، بەڵام سەرەتاکانیان لە کاری ئیسلامیدا لە تونس بە (سيد قطب و مودودي و حسن البنا) کاریگەر بوونە و خۆی ئەڵێت من بۆ زانستی ئیسلامی نەدەگەڕام چونکە ئەوە زۆر بوو، بەڵکو بەدوای ڕەمزو سونبولێکدا دەگەڕام، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا لێیان کەوتە ڕەخنەگرتن و لە هەندێك لێدواندا سەرکردەکانی ئیخوانی بە شپرز وبێ بەرنامە وەسف کرد، هەروەها بە پەلەکردن و هەڵە و نەزانین لە بەڕێوەبردنی وەڵاتدا وەسفی کردن و لە لێدوانێکیدا بۆ کەناڵی العربية.

وتی ئەوان هیچ پرسێکیان بە ئێمە نەکردووەو لەسەر پرسی لادانی مورسی وتی: (إخوان مصر فقدوا الحكم بطريقة صبيانية) واتە: ئیخوانەکانی میسر بە شێوەیەکی منالانە حوکمیان لە دەستی خۆیان دەرکرد، پێشتریش بە جۆرێك لە جۆرەکان هەر ڕەخنەی لە ئیخوان گرتووە.

راشد الغنوشی گومانی تێدا نییە کە یەکێکە لەو سەرکردە ئیسلامیانەی ڕۆڵیان هەبووە لە زیندووکردنەوەی ئیسلام لە تونس و لە لاتانی دەوروبەریش کاریگەری بووە،بەتایبەتی لەو سالانەی کە ئەو ولاتە لەژێر دەسەلاتی بورقیبە بوو، کە جەنگێکی لە دژی ئیسلام ڕاگەیاندبوو، ئیسلام بە قۆناغێکی سەختدا لە نامۆیی لە تونس تێپەڕ دەبوو.

غەننوشی لە گەڵ ڕۆژگاریشدا پاش پتەو کردنی پەیوەندییەکانی لەگەل حسن الترابي و هەندێکی تر لەو کەسایەتییانەی لە ئیخوان هەڵگەرابوونەوە، لە ئیخوان دوورکەوتەوەو لە قۆناغەکانی بیرکردنەوەیدا بە کۆمەڵێك وێستگەی جیا جیا و نوێ تێپەڕ بووە، ئینجا بە هۆی پۆلێن کردنی لەسەر قوتابخانەی عەقلانییەکان، ڕێژەی لادانەکانی غەنووشی لە کیتاب و سوننەت و مەنهەجی بیروباوەری ئیسلامی زیادی کرد وهیچ ڕەخنەیەکیشی قبوڵ نەدەکرد لەو بارەوە، بەڵکو هەمان ئەو لادانانەی پێی تۆمەتبار دەکرا ئەو بە چاکەو فەزیلەی دەزانی بۆ بزوتنەوەکەی، ئێستاش گەیشتووەتە چڵە پۆپەی ئەو گۆڕانکارییە فیکرییانەی کە پێشبینی ئەکرا و تەنانەت ئەوانەش کە پێش بینی نەدەکرا لە لادانندا

لە ڕاستیدا غەننوشی بە چەندین قۆناغ لە ژیانیدا تێپەڕیووە، بۆ ئەوەی بیناسی - وەکو توێژەرێك ئەڵێت - پێویستە کتێبەکەی دوکتۆر صلاح الجورشي؛ئیسلامییە پێشکەوتنخوازەکان

( الإسلاميون التقدميون ) بخوێنیتەوە، کە ئەوانە بریتی بوون لە کۆمەڵێك لە ئیخوانەکانی تونس جیابوونەوە لە ئیخوانی گەورە ودواتر بزوتنەوەی نەهزە و سەرۆکەکەشی کەوتە ژێر کاریگەری ئەوانەوە.

هۆکارێکی تریش بۆ ئەو گۆڕانکاریانەی هات بەسەر غەننوشیدا سەرسام بوونی بوو بە کەسایەتی و فیکری حسن الترابي، چونکە ئەویش لە ئیخوان جیابووبوویەوەو هێڵێکی نوێی لە کاری ئیسلامی بۆ خۆی دامەزراندبوو، ئەمەش هانی غەنووشی دا هەمان ئەو ئەزموونەی تورابی لە تونس دووبارە بکاتەوە پاش ئەوەی لە کۆتایی حەفتاکانەوە پەیوەندی نێوانیان توند و تۆڵ بوویەوە و غەننوشی تەوجیهات و ڕێنمایی لەو وەردەگر.

بە بڕوای غەننووشی وەکو لە پەراوێزێکیدا لەسەر کتێبی:

( الإسلام الاجتماعي في تونس ) د. محمد الهرماسي دەڵێت: دیاردەی ئیسلامەتی لە تونس خۆی لە سێ تەوەردا دەبینێتەوە:

١ -دینداری کلاسیکی تونسی کە ئاوێتەیەکە لە مەزهەبی مالیکی و بیروباوەڕی ئەشعەرییەکان و ڕێبازی سۆفییەکان.

٢ -دینداری سەلەفی ئیخوانی کە لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتووە و ئەویش لەلای خۆیەوە بریتیە لە ڕەتکردنەوەی مەزهەبە فیقهییەکان وهەروەها فیکری سیاسی ئیخوانیش لە خۆ ئەگرێت کە جەخت لەسەر گشتگیری دەکاتەوە.هەروەها مەنهەجێکی پەروەردەیی و ڕەوشتی و بیروباوەڕیشە.

٣ -دینداری عەقلانی کە بێ ئەوەی خۆی و بزوتنەوەکەی لەسەری پۆلێن بکات بە فەرمی ، وا دیارە دوا جار بە تەواوی خۆیان لەو جۆرە دینداریەدا بینیەتەوە، کە یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی ئەو شێوازە لە دینداردا بریتی بوو لە:

-گێڕانەوەی متمانەیە بۆ ڕێڕەوی موعتەزیلەکان و مامەڵە کردن لەگەڵ ئیسلام بە پێی شێوازی مامەڵەی ئەوان.

-هەروەها بایەخدان بە ڕێڕەوی خەواریج و شیعە وەکو دوو نموونەی موعارەزەی سیاسی.

-هەروەرها لە پێویستییەکانی ئەم شێوازە عەقلانییە لە دینداری ئەوەیە ڕەخنەی توند لە ڕێڕەوی کلاسیکی ئیخوان و هاوشێوەکانیان بگیردرێت وئەوان بە بەشێك لەسەلەفییەت لەلایەن غەننوشیەوە ناو براون بەو واتایەی کە توندڕەون لە تێگەیشتنی ئیسلامدا.

-گێرانەوەی بایەخ و گرنگی شاییتستە بۆ ئەو بیرمەندانەی کە ئیخوان وەکو پێویست بایەخیان پي نەدان وەکو: (محمد عبده ، الكواكبي ،الأفغاني ، الطهطاوي ،قاسم أمين).

-گرنگدان بە (الفهم المقاصدي للإسلام) لە جیاتی گرنگدان بە دەقەکان.

-بایەخدان و سوود وەرگرتن لە ڕۆژئاوا بە پێچەوانەی بیری سەلەفیزم و ئیخوانیزم کە ئەوان تەنها وەکو شارستانیەتێکی مادی هەڵوەشاوە تەماشا ئەکەن، بەڵکو پێویستە سوود لە ڕێکخستن و ڕۆشنبیری وزانستە مرۆڤایەتییەکانیان بکرێت.

-ئینجا ڕەتکردنەوەی ئەو شێوازە دابەشکردنە کە پێشتر سەلەفی و ئیخوان کاریان لەسەری کردووە بە دابەشکردنی خەڵکی بۆ موسوڵمان و کافر، چونکە ئەوە پراوێزخستنە بۆ ململانێ ڕاستەقینەکە، بەڵکو پیویستە خەڵکی پۆلێن بکرێن لەسەر بنەمای: نیشتمان پەروەر وخائین ، شۆڕشگێڕو دواکەوتوو ، فەلاح و دەرەبەگ.

-گێڕانەوەی متمانە بۆ قوتابخانەی چاکسازی تونسی ( خير الدين ، الحداد )

لادانی مەنهەجی راشد الغنوشی خۆی لە پێنج تەوەردا دەبینیتەوە،

بە پوختەیی دەیخەینە ڕوو:

یەکەم: هەڵوێستی لە عەقیدە وبیروباوەری ئیسلامی :

هەڵوێستی غەننوشی لەو بارەوە دیار نییە وراڕایە، لە هەندێ نووسینیدا خۆی وەکو سەلەفی نیشان ئەدات، بۆ نموونە لە کتێبی الحركة الإسلامية والتحديث (ل: ٢١) دەڵێت: : " **استمداد الإسلام من أصوله دون تعصب لما وجد في تاريخ الإسلام من نظريات واجتهادات ، فالأصل ما ورد في الكتاب والسنة وعصر الخلفاء**"

هەروەها لە کتێبی (حقوق المواطنة ) وا دەردەکەویت باوەڕی بە توحيد الألوهية هەیە و بگرە کتێبێکی خۆیشی پێشکەش کردووە بە شێخ محمد بن عبد الوهاب.

بەڵام هاوکات لە گەڵ باسکردنی هەندێ بابەتی عەقیدە لە کتیبەکانیدا،

وا دەرئەکەوێت لە بنچینەوە شارەزای عەقیدەی سەلەف نییەو تەنانەت لە کتێبی حقوق المواطنة (ل: ٤٤) باوەڕی موعتەزیلە لە جیاتی باوەری ئەهلی سوننەو جەماعەو باس ئەکات وپێی نازانێت.لە گەڵ زۆر نموونەی تر کە بێ ئاگایی ئەو نیشان ئەدات لە بیروباوەری سەلەف و جێگیربوونی لەسەر پێچەوانەکەی کە بەشێوەیەکی گشتی سەرسام بووەو قەناعەتی بە فیکری موعتەزیلەکان هەیە.

دووەم: هەڵوێستی غەننوشی لە بێباوەڕان:

کتێبی حقوق المواطنة هەموو هەڵوێستەکانی ئەو پیاوەی بە ڕوونی لە خۆگرتووە، کە ئەمەی خوارەوە هەندیکیانە:

-لە لاپەڕە ٥٠ تاکو ٥٧ باس لەوە دەکات بۆ ڕازیکردنی خاچ پەرستان ئاساییە وشەی (أهل الذمة) لا ببرێت.

-لە لاپەڕە ٦٦ ، ٧٢ باس لەوە دەکات موسوڵمانان و بێ باوەڕان یەکسانن وجیاوازیان نییە ، (لهم ما لنا وعليهم ما علينا)

-لە کتێبی ( الحريات العامة: ل: ٢٩٣) هاتووە کە بێباوەڕان لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا بۆیان هەیە خەڵکی بانگ بکەن بۆ دینی خۆیان، واتە ئەتوانن موسوڵمانان بۆ ئایینی گاور و جولەکە و بت پەرستەکان بانگ بکەن.

-هەروەها لە دوو توێ ئەو کتیبەدا هاتووە کە بێ باوەڕان دەتوانن لە ناودەوڵەتی ئیسلامیدا پەرستگای خۆیان درووست بکەن و لە ماڵی زەکات بەشیان بدرێت و جیزیەیان لەسەر لابدرێت و

موسوڵمان بە کوشتنی کافر بکوژرێتەوە و دەتوانن پلەو پایەی بەرز وەکو وەزارەت وەربگرن و حیزب و کۆمەڵە دابمەزرێنن.

سێیەم: هەڵوێستی غەننوشی لە شیعە:

-لە کتێبی ( الحركة الإسلامية والتحديث ) باوەڕی وایە بزوتنەوەی ئیسلامی سونی تەنها ڕێگەچارەی ئەوەیە پەیڕەوی هەمان ڕێڕەوی شۆڕشی ئیسلامی ئێران بکات.

-لە هەمان کتێبدا ئەڵێت تەوژمی ئیسلامی لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا لێدوانی لە خۆی کردووە لە سەرزاری گرنگترین (مجدد) کانی ئەم سەردەمە وەکو: (الأفغاني وإقبال ومصطفى صبري والسوسي وابن باديس) شێوازی کۆتایی تەواویشی لەسەر دەستی(حسن البنا والمودودي وسيد قطب والخميني) وەرگرتووە.

-لە جێگەیەکی تری هەمان کتێبدا وتوویەتی: ( واليوم يبدأ الإسلام مع نجاح الثورة في إيران وباكستان دورة حضارية جديدة.(

-کتێبی الحريات العامة ی خۆی پێشکەش بە خومەینی و صدر و شەریعەتی کردووە و دەڵێت: (قائد الثورة الإسلامية المعاصرة الإمام الخميني ، والشهيد ! العلامة الصدر ، والشهيد علي شريعتي ..).زۆر جاریش کە ناو زاناکانیان دەبات بە عەللامە ناویان دەبات.

چوارەم: هەڵوێستی غەننوشی لە ئافرەت:

-لە کتێبی المرأة المسلمة في تونس (ل: ٧ – ١٧) بە پێچەوانەی ئایەتی:(وخلق منها زوجها) وزۆر فەرموودەی صحیح و وتەی موفەسیرەکان دەڵێت: حەوا لە پەراسووی ئادەم دروست نەکراوە، لەو بارەشەوە زۆر بەڵگە لەقسەی محمد عبده( کە پێی وابوو ئادەم باوکی مرۆڤایەتی نییەو دەیان قسەی نامۆی تر) ومحمد حسين الطباطبائي ئەهێنیتەوە .

-لە کتێبی (المرأه المسلمة ل:٣٨ و دواوە) باس لەوە دەکات کە درووستە پێغەمبەر لە ئافرەتان بێت، ئەم قسەش لە کاتێکدایە کە دەرگای پێغەمبەرایەتی داخراوە وجارێکی تر پێغەمبەرێك ڕەوانە ناکرێت تا ڕۆژی قیامەت، لە ڕابوردوویشدا نەزانراوە کە پێغەمبەرێك ڕەوانە کرابێت لە ڕەگەزی ئافرەتان.

-هەر لە هەمان کتێب و لاپەڕەدا، تێکەڵ بوونی پیاوان و ژنان بە درووست ئەزانێت و، مەرجێکی بۆ داناوە کە قابیلی جێبەجي کردن نییە کە وتوویەتی: **(في جو جاد بعيد عن الإثارة ، ومفعم بروح الفطرة العفوية)** واتە: لە کەش و هەواویەکی دوور لە وروژاندن ، پڕ لە گیانی فیترەت و لە خۆیەوە بەبێ بەرنامە درووست بێت !

پاشان زۆر هانی ئافرەتان دەدات لە ماڵەوە دادنەنیشن و دەڵێت: **( ليس في الإسلام ما يوجب على المرأة القيام برعاية لبيت الزوجية والأطفال )**

واتە: هیچ بەڵگەیەك نییە لە ئیسلامدا ئافرەت وابەستەی ئەوە بکات لە ماڵەوە خەریکی ماڵ و مناڵ بێت ! ئینجا بە پێچەوانەی زمانی عەرەبی و قسەی لێکدەرەوانی قورئانی پیرۆز ئەڵێت:(وقرن في بيوتكن) لە ویقارەوە هاتووەو مەعنای ئەوە نییە لەماڵەکانی خۆتان بمێننەوە.

-بە پێچەوانەی یەکدەنگی زانایانی ئیسلام دەڵێت: ئاساییە و درووستە ئافرەت بەرپرسیارەتی گەورەی وەکو خەلیفەو سەرۆکی وڵات و بەرپرسیارێتی گەورەی لەو شێوە وەربگرێت (ئەمانەشی زۆربەی لە حسن الترابي مامۆستای وەرگرتووە.

پێنجەم: هەڵوێستە سیاسیەکانی راشد الغنوشي:

غەننوشی یەکێکە لە دیارترین ئەو کەسانەی بانگەشە بۆ دیموکراسیەتی ڕۆژئاوا دەکەن، زۆرێکی لە کتێبی ( الحريات العامة ) ی بۆ ئەو پرسە تەرخان کردووە.هەمیشە باس لەوە دەکات دیموکراسییەت لە دیکتاتۆرییەت باشترە وئەوانەش لە ئیسلامییەکان دیموکراسیەت ڕەتدەکەنەوە، سبەی دەبنە خزمەتکاری دیکتاتۆرییەت .

هەروەها دەڵێت: ئێمە هەرگیز بە دەوڵەتی دادگەری - کە مەبەستی ئیسلامە - ناگەین بە بێ تێپەڕبوون بە دەوڵەتی عەقڵ - کە مەبەستی دیموکراسیەتە.. -

بێگومان تێکگیرانی دیموکراسیەت لەگەل بنەما سەرەکییەکانی ئیسلام مەسەلەیەك نییە شاراوە بێت ووەکو ڕۆژی ڕوناك ئاشکراو بەڵگە نەویستە، خوێنەریش دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەم سێ سەرچاوە بۆ زانینی حەقیقەتی ئەو سیستمە دژ بە ئیسلامە:

"الديمقراطية في الميزان " سعيد عبد العظيم ، و " خمسون مفسدة جلية من مفاسد الديمقراطية " لعبد المجيد الريمي ، و "حقيقة الديمقراطية " لمحمد شاكر الشريف .

*غەننوشی لە مەسەلەی دیموکراسی و مەسەلەکانی تر لە دینی خوا بە شێوەیەکی گشتی زۆر زۆر (متساهل) ە و هەموو شتێکی بە شل گرتووە!

*سەرانی حیزبی نەهزە بە تایبەتی جێگری سەرۆك پارتەکە عبدالفتاح مۆرۆ بۆ ئەوەی پێیان بوترێت کراوەو ڕەزامەندی شەقام بە دەست بهێنن، هەموو دابەزینێك لە دینی خوا ئەنجام ئەدەن، لەبەرنامەی زۆر سوك لە کەناڵە ئاسمانییەکان بەشداری ئەکات کە ڕەنگە هەندێ لە عەلمانییەکانیش لەبەر پاراستنی کەسایەتی خۆیان بەشداری نەکەن، بەڵام مۆرۆ بە بێ هیچ شەرمێك بەشداری ئەکات و خۆی دەکات بە گاڵتەجاڕی هەندێ ئافرەت و پیاوی سووك کە ئەو بەرنامە بێ ئابڕووانە ئەبەنە ڕێوە و پێشکەشی ئەکەن.

*لە زۆرێك لە هەڵوێستە سیاسیەکانیدا ئەگەر کەسێك نەیناسێت گومان لەوە ناکات کە غەننوشی خاوەن بیرێکی لیبرالییە یان هەر بیرێکی تری نا ئیسلامی، ئەوەندە هەڵوێستەکانی لە ئیسلامەوە دوورن، تەنها بۆ نموونە:

*بە ڕاشکاوی لە ئایباك ڕایگەیاندووە پاش سەرکەوتنیان لە تونس کە ئەوان هیچ کێشەیان لەگەل ئیسرائیل نییە.

*عەلمانیەتی تونس ڕەنگە پیسترین جۆری عەلمانیەت بێت لەسەر زەویدا، تا سەر ئێسقان دوژمنی ئیسلامن، کاتێك غەننوشی لە هەندەران گەڕایەوە تونس - وەکو وجدي غنيم دەیگێڕێتەوە - ئافرەتەکانیان بەڕووتی چوون بۆ فرۆکەخانەو وتیان تۆمان ناوێت بگەڕێرەوە. لەگەل ئەوەشدا لە هەموو بۆنەو سەرکەوتنێکی سیاسییاندا غەننوشی پیرۆزباییان لێ دەکات و بەبراو خۆشەویستی خۆیانی دەزانێت.

*بە هیچ شێوەیەك هەوڵیان نەداوە جیگای بەدرەوەشتی و مەی خواردن و هەرشتیك لەگەل ئیسلامدا ناکۆك بیت دایبخەن یان سنووی بۆ دابنەن.

*لە چاوپێکەوتنیکی ڕاشکاوانەدا لە گەل گۆڤاری (دير شبيغل الألمانية)

لەبەرواری ١٧ _١ _ ٢٠١١

وتی: **( إننا لا نريد فرض الشريعة في تونس، إن ما تحتاجه تونس هو الحرية والديمقراطية الحقيقية)** ئێمە نامانەوێت شەریعەت بسەپێنین یان جێبەجێبکەین لە تونس، ئەوەی تونس پێویستی پێیەتی ئازادی و دیموکراسیەتی ڕاستەقینەیە.

*لە ئوردون بەرگرییەکی زۆری لە حیزبی شیوعی ئەو وڵاتە کرد و داوای لە حکومەتی ئوردون کرد ئەو حیزبە سەخلەت نەکەن.

*بەناو بۆچوونی سیاسیەوە بە ئارەزووی خۆی نەك هەر ڕخنە لە گەورە هاوەڵان دەگرێت ، بەڵکو تانەشیان لێ ئەدات و ئەوەندەی ڕەچاوی ئەدەب وڕێز لە گەل ئەو سەرۆکە بێ دینەی تونس ئەکات،

بەرانبەر عومەری کوری خەتتاب ڕەزای خوای لێبێت نایکات کە لە کتێبی (من تجربة الحركة الإسلامية في تونس )بە دیکتاتۆر وەسفی دەکات.یان کاتێك لە کتێبی (الحريات العامة في الدولة الاسلامية) بە ناشیرینترین وشە ودەربڕین بێ ڕێزی بەرانبەر موعاویەی کور ئەبو سوفیان ئەکات ڕەزای خوای لێبێت و زۆر لە هاوەڵانی تریش.

*لە چاوپێکەوتنێکی لە کەناڵی (الحوار) کە لە یوتیوب یش بڵاوبووتەوە ڕەخنەی زۆر لە فیکری سید قطب ئەگرێت ڕەحمەتی خوای لێبێت ، هاوکات هەر لەو چاوپێکەوتنەیدا ستایشی زۆری فیکری خومەینی و شۆرشی ئیسلامی ئێران دەکات.

*سەرۆکی وڵات ماوەیەك پێش ئێستا چەند بڕیارێکی دژ بە دینی خوا دەرکرد کە ڕاستەوخۆ لە گەل قورئاندا تێك دەگیران، حیزبی نەهزە بە پەلەو بێ دواکەوتن پشتگیری خۆیان بۆ هەردوو بڕیارەکەی الباجي قائد السبسي سەرۆکی تونس نیشان دا ، کە یەکێکیان بریتی بوو لە یەکسانی ئافرەتان و پیاوان لە میراتی و لەهەموو شتێکدا و ، ئەوی تریشیان بریتی بوو ئازادی شووکردنی ئافرەتی موسولمان بە غەیری موسوڵمان کە ڕاستەوخۆ لە گەل قورئان و فەرموودەو ئیجماعی ئەممەت تیکدەگیرێت، بەڵام نەهزەکەی غوننوشی و لەسەر زاری عبدالفتاح مۆرۆ پشتگیری تەواوی خۆیان بۆ هەردوو بڕیارەکە نیشاندا.

تەنانەت طه جابر العلواني کە هاوبیر و هاوڕێی راشد الغنوشی خۆیەتی لە سەرەتای کتێبی (حقوق المواطنة) ڕەخنە لە غەننوشی دەگرێت لەسەر ئەو هەموو تەنازولاتە کە بۆ عەلمانیەکان دەیکات و

پێی ئەڵێت ئەوان بە هیچ جۆرە بەرنامەیەکی سیاسی ئیسلامی ڕازی نابن، با هەرچەند دەستکاری حوکمەکانی ئیسلامی تیدا کرابێت ، تەنانەت لە قسەیەکی زۆر سەیری عەلوانی دا هاتووە: عەلمانییەکان دەزانن ئەو ئیسلامەی ئیسلامییە پێشکەوتن خوازەکان باسی ئەکەن ئیسلامێکی جیاوازە بەڵام هەر پێی ڕازی نابن!

*غەننوشی وەکو سیاسیەك و هاوشێوەی زۆربەی هاوبیرەکانی - بەداخەوە کەسێکی بێ بارو- متلون - دەرئەکەوێت، تا بەرژەوەندی لەگەڵ وڵاتی سعودیە هەبێت مەدح و ستایشیان ئەکات، کە نەیبوو بە توندترین شێوە دژایەتیان دەکات، لێرەدا تەنها مەبەستم لە هەلوێتسەکانێتی بەدەر لەوەی ستایشی کێ ئەکات یان نایکات. هۆکاریشی ئەوەیە لە ڕوانگەی بەرژەوەندی حیزب وسیاسەتی بزوتنەوەکەی تەماشای پرسەکان دەکات نەك لە ڕوانگەی حوکمی شەرع.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:

-تدرجات راشد الغنوشي وأهم انحرافاته/سليمان بن صالح الخراشي.

-القول الواضح والجلي في فساد عقيدة راشد الغنّوشيّ.

-چەندین چاوپێکەوتنی راشد غنوشي و هەندي کەسایەتی تر کە ڕەخنەیان ێ گرتووە یان ستایشیان کردووە.

- چەندین بابەتی جیاجیا لە سایتەکانی صيد الفوائد سایتی تر دەربارەی ژیاننامەی غەننوشی.

# ( علي الجفري )



**ناوی** **(الحبيب علي زين العابدين الجفري)** ، بانگخوازێكی ناوداری یەمەنییە، لە ساڵی ١٩٧١ لە جەددە لە سعودیە لە دایكبووە، دوو هاوسەری هەیە و باوكی دوو كوڕو سێ كچە، خۆی ئەڵێت مەزهەبم شافیعیەو عەقیدەم ئەشعەرییەو سۆفیم، دامەزرێنەرو بەڕێوەبەری دامەزراوەی (طابة) یە كە بنكەی سەرەكی لە ئیماراتەو هەندێك لەسەرانی سۆفییەكان لە جیهاندا لە خۆ ئەگرێت و هەڵوێستی سیاسی وقابیل بە لێكدانەوەی جیاواز لە خۆ دەگرێت.

هۆی دەركەوتنی زۆری لە ڕاگەیاندنەكان و شێوازی تایبەتی خۆی لە قسەكرندا، هەروەها بە هۆی بەشداریكردنی كارای لە زۆر كۆنگرەی نیودەوڵەتی و ڕاگەیاندنی چەند كەمپینێك بۆ بەرگری كردن لە پێغەمبەر (ﷺ) ، لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی ئەناسرێت و، كەسایەتییەكی جیاوازی خۆی هەیە وشوێنكەوتوویشی لە نێو سۆفییەكان و جەماوەری گشتیدا زۆرە.

یەکێکی تر لە هۆکارەکانی مەشهور بوونی ئەو ئەوە بوو، ئەکتەری سینەمایی میسری "وجدي العربي" ئەوی بە زۆریك لە ئەکتەرە میسرییەکان ناساند، هەروەها محممود الجندي پاش وازهێنانی لە ئیلحاد بە نیاز بوو واز لە نواندن و سینەما بهێنیت بەڵأم جەفری قایلی کرد لەو ناوەندە بمێنیتەوە.

هەورەها دەرکرانیشی لە میسر، کە دوای ئەوە ئیتر کەناڵەکان پێشبڕکێیان بۆ چاوپێکەوتنی ئەکرد وسەرەتای دەرکەوتنەکانیشی لە کەنالی المحور بوو، لە دوای ئەوەش بەشداریکردن و پێشکەش کردنی بۆ ژمارەیەکی زۆر لەبەرنامەی جیا جیا لە کەناڵە ئاسمانییەکانی وەکو: الرسالة و دريم ١ ودريم ٢ و المحور و تەلەفزیۆنە فەرمییەکانی ئیمارات و قەتەر و هەندێ وڵاتی تر، هەمووی هۆکار بوون بۆ ناوبانگ دەرکردنی ولەو بەرنامەو چاوپێکتنانەی کەناڵ وسایت ڕۆژنامەو گۆڤارانەش لە هەمووی بوارێکی سیاسی و هونەری و ئاییی سەرنج ڕاکێش قسەی کردووە و، چەندین مونازەرەشی لەگەل خەڵکی دژ بە ئیسلام وەکو اسلام بحيرى و هەندێ قەشەکان کردووە.

جەفری هەڵگری هیچ بڕوانامەیەکی زانکۆیی نییە، بەڵام خۆی لە هەندێ لە چاوپێکەوتنەکانیدا ئەڵێت لەلای سێ سەد شێخ و مامۆستا خوێندوویەتی وزانستی وەرگرتووە، هەندیکیان خەڵکی باشن و هەندیکیشیان بە بڵاوکردنەوەی بیدعەو شیرکیات ناسراون، هەروەها کۆمەڵێك کتێبیشی نووسیوە، وەکو:

**" معالم السلوك للمرأة المسلمة،ومحبة الرسول، ومولد ووفاة الرسول، ولا تحزن لا تغضب فلن يخزيك الله، التوبة النصوح."**

علي الجفري بە یەکێك لە بانگخوازە نوێکان یان مۆدێرنەکان (الدعاة الجدد) دەژمێردرێت و لە لایەن ڕۆژئاواوە پشتگیری دەکرێت، بەتایبەتی لە پاش ڕوداوەکانی یانزەی سێپتەمبەر و دەرکەوتنی شێوازی بانگەوازکردنی بۆ ئیسلام، لە لایەن ئەوروپا و ئەمریکاوە پشتگیری ئەکرێت و بە یەکێك دادەنرێت لەوانەی ئیسلامی ڕاستەقینە دەخەنە ڕوو، بۆیە سەرەڕای کەمی تەمەنی تاکو ئێستا بۆ کۆڕو بەشداری لە کۆنگرە و ئاهەنگ و موحازەرە وتنەوە سەردانی زۆرێك لە وڵاتانی جیهانی کردووە، وەکو بريطانيا وألمانيا وفرنسا وايرلندا وهولندا وبلجيكا والولايات المتحدة الأمريكية، وإندونيسيا وعمان والإمارات وقطر والبحرين والأردن وسوريا ولبنان وسريلانكا، و كينيا وتنزانيا وجزر القمر..

پەیوەندی وسۆزێکی پتەو دەیبەستێتەوە بە شیعەکانەوە ، هەمیشە لە وانەکانیدا باسی ئالوبەیت ئەکات وباسی هەلوێستی ئومەوییەکان لە عەباسییەکان ئەکات و ڕەخنەیان لێ ئەگرێت و قسەیان پێ دەکات، قاودانیشی لە میسر بە هۆی کارکردنی بوو لە گەڵ (جمعية آل البيت) کە کۆمەڵێك ڕەهەندی سیاسی لە کارەکانیاندا هەبوو ، بەتابەتی لە دژی سعودیە، جارێکیش (وكالة أنباء فارس) ڕایگەیاند کە علي الجفري سۆفی ناوداری یەمەن بڕیاری داوە بچیتە سەر ڕێڕەوی شیعە، بەڵام دوای ماوەیەك جەفری ڕوونکردنەوەیەکی ڕاگەیاند کە ئەو هەر سوننیەو نەبووەتە شیعە.

علي الجفري هەمیشە لەبەرنامەکانیدا دەم بەخەندەیە وهەوڵ ئەدات ئەدەب و ئاکاری جوان نیشان بدات وکۆتایی وانەو چاویکەوتنەکانیشی بە گریان و دوعا تەواو ئەبێت.

خاوەن فیکرێکی سۆفییەو زۆربەی بیروباوەڕەکانی سۆفییەکانی لە خۆیدا بەرجەستە کردووە و بانگەوازی بۆ دەکات ، بە هۆی ئوسلوبی تایبەتی لە باسکرنی تەسووفدا، زۆرێك لە سۆفییەکانی دونیا ئەو بە کەسێکی بە توانا وشایستە ئەزانن لێدوانیان لە جیاتی بدات، هاوکات بەو هۆیەیشەوە جفري ڕووبەڕووی هێرشێکی توند و فراوانیش بووەتەوە و، نەیارەکانی هەوڵیان داوە لە وانەوچاوپێکەوتنەکانی لە ڕاگەیاندنەکاندا، سەرپێچییەکانی ئەو لە بواری عەقیدەو مەنهەجی ئیسلامیدا بخەنە ڕوو، منیش لێرە دیارترین ئەو ڕەخنانەی کە لە مەنهەجی ئەو کەسایەتییە گیراوە دەیخەمە ڕوو:

-دەربارەی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت: ئەو دەتوانێت بە گیانی (بە ڕوحی ) فریای هەر کەسێك بکەوێت کە پێویستی پێی بێت و، لەوانەیە بە جەستەشی ئەو کارە بکات، هەروەها بیروباوەڕی جەفری لە ئەولیاو و پیاوچاکاندا بەتەواوی لە گەڵ عەقیدەی ئیسلامیدا ناکۆکە، چونکە باوەڕی وایە کە ئەولیاکان پاش مردنیان لەم گەردوونەدا ڕۆڵیان هەیە ولەم دونیا زۆر شتیان پێ ئەکرێت و لە دوا ڕۆژیشدا بە هەمان شێوە دەسەڵاتیان هەیە.

-تەنانەت لە گرتەیەکی ڤیدیۆییدا دەڵێت ئەولیاکان دەتوانن بە خوای گەورە بڵێن فڵانەکەس بخەرە بەهەشتەوە ، یان بیخەرە دۆزەخەوە ئەویش بە قسەیان دەکات، لە هەموویشی سەیر تر ئەوەیە لەسەر ئەم قسە نامۆیانە بەڵگەی قورئانی زۆر دوور ئەهێنێتەوە.

-هەروەها باوەڕی وایە وەلی لەوانەیە ئاگەداری غەیب و(لوح المحفوظ) بێت و، بەڵگەش بۆ ئەو مەسەلە لە قەسیدەی بوردەی بوسیری ئەهێنیتەوە.

-بیرو باوەڕی وایە شیرك لەم ئوممەتە وجودی نییە و، دوای هاتنی ئیسلام شتیك نەماوە بە ناوی شیرکەوە.( لە گرتەیەکی ڤیدیۆدا بەڕاشکاوی ئەم قسە ئەکات.(

-لە موحازەرەیەکیدا ئەڵێت: أبو (الحسن الشاذلي) قسەی لەگەل خوا کردووەو هەندي پرسیاری لە خوا کردووەو خوای گەورەش وەڵامی داوەتەوە.

-هاوار بە مردووەکان دەکات و داوای ڕزق و ڕۆزیيان لێ دەکات.

-ئەڵێت قەبری پێغەمبەر (ﷺ) لە عەرشی خوا باشترو بەڕێزترە.

-باسی وەلییەك ئەكات بە ناوی (أحمد بن إدريس) ئەڵێت لە سەردەمانی زوو شەش سەد تەفسیری خوێندووەتەوە، کە پرسیاریشی لێ دەکرێت چۆن ئەو هەموو تەفسیرەی خوێندووەتەوە، لە وەڵامدا ئەڵێت: لە ڕێگەی باپیرەیەوە لە خوای گەورە وەریگرتووە!

-ئەڵێت سەرگەورەمان شەعرانی فەرموويەتی: وەلی دەتوانێت پێغەمبەر (ﷺ) ببینێت ڕوو بەڕوو نەك لە خەودا، بەڵام لە پاش بڕینی ١٤٩ هەزار مەقام لە ویلایەتدا، بەم قسەش ڕازییەو پیی سەرسامە.

-سەرانی (وحدة الوجود ) وەکو ابن الفارض و ئەوانی تر بە سەرگەورەی خۆی وئەولیای گەورەی خوای گەورە ئەناسێنیت.

-هاوار بە مردووەکان دەکات و داوایان لێ دەکات و قسەیان لەگەڵ دەکات وەکو ئەوەی لەگەڵ زیدنووەکاندا قسە بکات و بە هەندي وەسف و ستایشی لەڕادەبەدەر هەڵیان دەنێت، وەکو:

**ألا يا قاسمين الخير*** وَفُّوا قِسمنا يا قاسمين.**

-لە ڤیدیۆیەکیدا دەڵێت دەستی پێغەمبەر (ﷺ) لە قەبرەکەی دەرچووە بۆ ئەوەی ئەحمەدی رفاعی ماچی بکات.

-لە وانەیەکیدا ئەڵێت لە تەوحید گرنگتر ئەوەیە ئایا عیبادەتەکانمان تەواوە یان نا.

-زۆر جار قسەی بێ بنەما ئەکات، بۆ نموونە وەهسفی (أحمد البدوي) دەکات بەوەی کە سەرگەورەی فەرموودەناسان ( إمام الطبقة ) بووە لە فەرموودەدا، لە کاتێکدا بەدەوی ناوی لە هیچ کتێبێکی فەرموودەناسیدا نەهاتووەو کەس لە دوورو نزیکەوە ئەوی بە فەرموودەناس نەزانیوە نەخوازەڵا بە سەرگەورەی فەرمودەناسانیش.

-لە وانەکانیدا زۆر بەسەرهات ئەگێڕێتەوە یان بنەمایان نییە، یان موضوع و هەڵبەستراون.

-لە بواری فەرموودەدا هەلەیەکی زۆر ئەکات، فەرموودەی لاوازو موضوع و بێ بنەما دەگێڕێتەوە، فەرموودە لە صحيح مسلم تضعيف ئەکات، فەرموودە ئەداتە پاڵ بوخاری نەك لە بوخاری نییە لە الكتب الستة ش نییە، هەڵەی لەم جۆرە لە وانەو کۆڕوکۆبوونەوەکانیدا زۆرن.

-لە جێگەیەکدا ئەڵێت نەوەوی وتوویەتی ئەهلی فەترە پێش ئیسلام دەبنە سێ بەشەوە، هەموویان لە بەهەشتدان جگە لەوانە نەبێت کە یەکخوا پەرستیان بەلاڕێدا بردووە،

بەڵام کە ئەگەڕێیتەوە بۆ صحيح مسلم شتی وای تیا نییە، قسەی لەم شێوەشی هەیە بەدەم بوخاری و مسلم و ابن خزيمة و الحاكم و زانای تر.

-گاڵتە بەوانە دەکات کە سەردانی میسر ئەکەن و سەردانی السيدة زينب ناکەن و دەڵێت: **((.. هي ما تريدك ... هي لا تريدك ... لو أرادتك لهيأ الله لك زيارتها))** . ئەویش ئێوەی ناوێت سەردانی بکەن..ئەگەر ئێوەی بویستایە خوای گەورە سەردانەکەی بۆ ئاسان دەکردن!

-ئەڵێت **((البعض من الجهلة في صورة العلم يروق لهم أن يكرروا (( عبس وتولى أن جاءه الأعمى))**

واتە: هەندي نەفام هەیە ئەوەیان زۆر بەلاوە خۆشە ئەم ئایەتە دووبارە بکەنەوە! مەبەستی ئەوەیە ئەو ئایەتە گلەیی خوای تیایە لەسەر پێغەمبەرەکەی جوان نییە دووبارەی بکەینەوە.

-لە کۆڕێکی بۆ خەڵکی قسە ئەکات و ئەڵێت: کە گوێم لە گۆرانی ( أمل حياتي) ام كلثوم بوو، خۆم پێ نەگیراوەو دەستم بە گریان کرد و، دواتریش کە نووسەری گۆرانییەکە (أحمد شفيق كامل) ی لە کۆڕێکی خۆیدا بینیوە چووە بۆ لای و ئەویش پێی وتووە هەردوو گۆرانی (أمل حياتي) و (انت عمري) م لە لای گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) نووسیوە لەسەر خۆی.

ئەمانەی سەرەوە تەنها بۆ نموونە باسم کرد و شتی لەو جۆرەی زۆرە ، هەموویشی لە سایتی المجهر بە دەنگ ورەنگی خۆی تۆمارکراوە.

بەکورتی لادانی لە بواری عەقیدە هەیە بەوەی هاوار بە غەیری خوا ئەکات و، دەربارەی ئەولیاکان زێدە ڕەوی زۆری هەیە و باوەڕی وایە ئەوان دوای مردنیان لە گەردووندا دەسەڵاتیان هەیە و لەڕۆژی قیامەتیشدا هەر دەسەڵاتیان زۆرە، کێشەیەکی تریشی ئەوەیە هەڵەی مەنهەجی زۆرەو لە فەرموودەشدا بە زۆری پشت بە فەموودەی موضوع و ضعیف ئەبەستیت و بەوانە سەرنجی خەڵکی ڕادەکێشێت.

هەموو ئەمانەش باسکران دەکرێت لە خانەی سۆفی بوونی جەفری پۆلێن بکرێت و نیشانەی پرسیارێکی زۆر گەورە نەبێت لەسەری، نەك بەو واتای کە ئەو سەرپێچی و هەڵانە ئاسایی بن، نەخێر، ئەوانە هەمووی کارەساتی گەورەن لە دینداریدا، بەڵام بەو واتایەی سۆفییەکان هەندێ بیروباوەڕی خۆیان هەیە و لە فەرموودەشدا ناو بانگی ئەوەیان هەیە کە کار بە فەرموودەی لاواز و موضوع یش ئەکەن و لە کۆتاییدا ئەوان گروپێکی گەورەن لە ناو ئوممەتی ئیسلام و واقیعیکن بەدەر لە دوو رو نزیکیان لە مەنهەجەوە ، بەڵام کێشەی گەورە جەفری ئەوەیە لە بازنەیەکی نێو دەوڵەتیدا و لە چوارچیوەی پلانێکی بەرنامە بۆدارێژراودا لەلایەن ئەوروپا و ئەمریکا کار دەکات و بانگەواز بۆ جۆرە ئیسلامێکی نوێ دەکات کە نەك تەنها بانگەشەی لابردنی سنورەکانی نێوان سونە و شیعە ئەکات ، بەڵکو جەخت لەسەر لێبوردەیی ئیسلام دەکات لەگەڵ هەموو ئایینەکاندا و کار لەسەر کاڵ کردنەوەی سنورەکانی نێوان موسوڵمانان و ئایینەکانی تر ئەکات،

ئەمەیش هۆکاری سەرەکی ئەوەیە کە کەسایەتییەکی ویستراوە لە ڕۆژئاوا و بەردەوام بۆ کۆنگرەو بۆ لای جالییەکان بانگهێشت دەکرێت و، هەرکێ لە زانا گەورەکان ڤیزەی پی نەدرێت بۆ ئەو وڵاتانەی ڕۆژئا، جەفری ڤیزەی بە خێرایی پێ ئەدرێت.

هەندێك لە زانایان بە توندترین شێوە بەرپەرچی بیروبۆچوونەکانیان داوەتەوە وئەویان بە موبتەدیع و قبوری وخورافی وەسف کردووەو موسوڵمانایان لێ وریا کردووەتەوە ، وەکو: صالح الفوزان ، كريم راجح ، سليم المالكي ، الراجحي ، عبيد الجابري ، عبد الله الغنيمان ، وجدي غنيم ، حامدعبد لله العلي ، أحمد النقيب ، محمد المعراوي و ۆری تریش.

*بۆ نووسینی ئەم بابەتە گەڕاومەتەوە بۆ زۆرێك لە چاوپێکەوتنەکانی جەفری لەو کەناڵانەی باسم کردووەو هەروەها چاوپێکەوتنەکانی لە سایتەکانی العربية و الجزيرة و روژنامەکانی الوطن و اليوم السابع، هەروەها بۆ هەندێ نووسین دەربارەی ژیانی وەکو ستایش کردن یان شکاندنەوەو ڕەخنە لێگرتن ، بۆ نموونە: صوفية بنكهة العصر، لە سایتی صيد الفوائد ، بابەتێك دەربارەی هەڵەکانی جەفری لە سایتی ملتقى اهل الحديث و، سایتی السحاب ، ژیاننامەکەی لە سایتی وێکیبیدیا ،هەووەها سایتی المجهر کە سایتێکی تایبەتە بە هەڵەکانی علي الجفري بە نووسین و بە گرتەی ڤیدیۆیی.

# ( أحمد بدر الدين حسون )



لە دایکیووی ساڵی ١٩٤٩ لە سوریا، دەرچووی (الثانوية الشرعية الخسروية) دواتر خاوەنی بڕوانامەی دوکتۆرا لە (الفقه الشافعي) لە زانکۆی ( الدراسات الإسلامية ) لە پاکستان، بەڵام نازانرێت ماستەرەکەی لە کوێ هێناوەو لە چی بوارێکدا بووە. پرسیار لە شێخ محمد رواسي القلعجي کرا: کێ ئوتروحەی دوکتۆراکەی بۆ حسون نووسی؟ ئەویش پێکەنی و وەڵامی نەدایەوە.

لە پاش وەفاتی أحمد کفتارو کە موفتی سوریا بوو، ماوەیەکی زۆر ئەو مەنسەبە ئایینیە کەسی بۆ دانەنرا، دوای ئەوە بشار الاسد هەڵسا بە دانانی أحمد حسون وەکو موفتی ئەو وڵاتە، حەسسون لەوانەیە تاکە مفتي بێت لە جیهاندا بە نازناوێکی نامۆ وەکو(مفتي الأسد) و (مفتي البراميل) بناسریت.

ئەحمەد حەسون لە سەرەتای گەنجی لە نێو هاوڕێکانی بە کەسێکی سەرەڕۆ و بێ ئابڕوو ئەناسرا، لە ڕووی ڕەوشتیشەوە جێگای گومان بوو، نویژو واجبە ئایینیەکانیشی بە لاوازی و پچڕ پچڕ ئەکرد، جگە لەوەش بە پەیوەندییەکانی دەناسرا لەگەل دەزگاکانی موخابەرات،

نەك هەر خەڵكی بەڵكو هاوڕێكانی خۆیشی بە گرت دەدا، تەنانەت ئەو مەسەلە ئەوەندە زانراو بوو لەلای خەڵكی، جارێكیان لە سەر مینبەرەوە لە شاری حەلەب ناچار بوو سوێند بە تەڵاق بخوات كە پەیوەندی بە هیچ دەزگایەكی هەواڵگرییەوە نییە، لە كاتێكدا ئامادەبوان دڵنیابوون لەوەی درۆ ئەكات.

حەسسون بۆ ماوەیەكی زۆر موفتی شاری حەلەب بووە، هەروەها بۆ دوو خول ئەندامی (مجلس الشعب) ی سوریا بووە، بەڵام هەرگیز جێگای ڕێزو بایەخی خەڵكی نەبووە، لە پاش چاوپیكەوتنیكی بەناوبانگ و سەرنج ڕاكێشی لە گەل گۆڤارێكی ئێرانیدا و بە كاریگەری ئێران، بەشار ئەسەد فەرمانی بۆ دەركرد ببێتە موفتی هەموو سوریا.

چاوپێكەوتنەكەی أحمد حسون لە گەڵ گۆڤاری (المنبر) ڕێخۆشكەر بوو بۆ ئەوەی ببێتە موفتی ، چونكە بە ڕاشكاوی پشتگیری لە هەموو بیروباوەڕەكانی شیعە كرد و بەراستی زانی، ئەوەش بێگومان پەیامێك بوو بۆ ئێرانی دەست ڕۆیشتوو لە سوریا و،هەروەها بۆ بشارحافظ الاسد كە ماوەیەك بوو لە دوای مردنی أحمد كفتارۆ بە دوای كەسێكی گونجاو دەگەڕا بیكات بە موفتی.

بۆ نموونە: پەیامنێری گۆڤارەكە لە سەرەتای چاوپێكەوتنەكە پێی ئەڵێت شام ناوەندی حوكمڕانی موعاوییەو باوكی بووە لەعنەتی خوا لە هەردوكیان ، حسون ڕازییەو بي دەنگە، یان ئەڵێت سوریا بووەتە دوو بەشەوە سەربازگەی شەیتان و سەربازگەی ڕەحمان مەبەستی لە سوننەو شیعەكانە ئەو هەر بێ دەنگە و دەیان قسەی وای تیایە چاوپێكەوتنە درێژەكەیان كە لە كۆتاییدا دەڵێت:

سوننه وشیعه ۹۸% یەکبۆچوونن وبەلای زۆرەوە ۳ یان ٤% ناکۆکن ، بەڵام شافیعی و حەنەفییەکان ۱۰% زیاتر ناکۆکی لە نێوانیاندا هەیە.

ئەو ئەگەر چی وەکو سوننیەك موفتی سوریایە، بەڵام نەیارەکانی بەڵگەی زۆر دەخەنە ڕوو کە ئەو بووەتە شیعە، لەوانە، جگە لەوەی بە کاریگەری ئێران بووەتە موفتی لە لایەن بەشارەوە کە خۆی شیعەیەکی نوسەیرییە، چەندین جار لێی بیستراوە کە هێرشی کردووەتە سەر دایکمان عائیشە و موعاویە ڕەزای خوایان لێبێت، هەروەها داوای لە خەڵکی کردووە بەشداری شیعەکان بکەن لە شیوەنی عاشورادا، ئینجا بە بەردەوامی ئامادەی ئاهەنگ و کۆڕوکۆبوونەوەی شیعەکان دەبێت و پەیوەندییەکی پتەو دەیبەستیتەوە بە حسین فضل الله و وانەیەکی هەفتانەی لە مزگەوتی السیدة زینب هەیە، جگە لەوەش سەردانی تاران دەکات و لەوێ بە ڕاشکاوی ستایشی خومەینی کردووە.هەروەها لەبەر ئەوەی سوکایەتی زۆری بە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کردووە، یەکێك لە زانایانی حەلەب بە ناوی محمود الحوت هەڵساوە بە ڕەددانەوەی و بەرپەرچدانەوەی بیروباوەڕەکانی دژ بە هاوەڵان.

أحمد حسون لەو ڕۆژەوە کە لە سوریا ناوبانگی پەیدا کردووە بە کەسێکی بي شەرم ناسراوە، بەرانبەر هەموو خزمەتیکی گوماناوی پارە وەرئەگرێت ، بۆ ڕژێمی سوریا و بۆ ئێران و ئەمریکا و ئیسرائیل ، خۆی بە سونی ئەناسێنیت و بەردەوام لەسەر مینبەر و لە ڕاگەیاندنەکانەوە ڕەخنەیان لێ دەگرێت و بە ناحەزو دوژمنایەتی ئالوبەیت تۆمەتباریان ئەکات، دوکتۆر منیر الغضبان لە وتارێکیدا داوای لە خەڵکی سوریا کرد بە یەك دەنگ بەرانبەری بوەستن و

لە مەنسەبی موفتی وەدەری بنێن، چونکە ئەو لە دژی بیروباوەڕی جێگیری یەك ملیار کەس قسە ئەکات وتۆمەت هەڵەبەسێت، بۆ نموونە دەڵێت:

*خەلیفەو دەسەڵاتدارەکانی ئیسلام بە کافر دەزانێت هەر لە موعاویە (ڕەزای خوای لێبێت) تاکو کۆتا فەرمانڕەوا ئیسلامی.

*دان بەوەدا دەنیت کە ڕەخنە لە بیروباوەرە جێگیرەکانی ئەهلی سوننە ئەگرێت.

*لە جیاتی پیغەمبەر (ﷺ) عەلی ڕەزای خوا لێبێت بە بەڵگەو حوجحە ئەزانێت بەسەر موسوڵمانانەوە.عەلی بە (کتاب الله الناطق) دادەنێت و قورئان بە (کتاب الله الصامت)

*لە چاوپێکەوتنێکیدا یەزیدی بە فیرعەونی ئەم ئوممەتە ناساندووە.

*هاوەڵان دەخاتە هەڵەوە کە عوسمانیان لەسەر خیلافەت لانەبرد و عەلی بخەنە جێگەکەی.

*هاوەڵان دەخاتە هەڵەوە کە هەڵساون بە هەڵبژارنی ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێبێت و عەلی یان هەڵنەبژاردووە ڕەزای خوای لێبێت.

*هەندێك نەبێت لە هاوەڵان هەموویان بەهەڵە ئەزانێت.

*بە لایەوە مناڵترین کەس لە (أهل البيت) پلەو پایەی لە گەورەترین هاوەڵان بەرزترە ، وەکو خۆی دەڵێت: (**إن أصغر واحد من آل البيت هو أعلى من أعلى صحابي** )یان لە جێگەیەکی تر دەڵێت: (**إن وضع آل البيت بمنزلة الصحابة يعد تنقصًا لآل البيت** ) واتە: ئالوبەیت بخرێنە ئاستی هاوەڵانەوە ئەوە سوکایەتیکردنە پێیان .

حسون لە لایەن هەندێ لە توێژەرانەوە بە مارێك وێنا كراوە كە لە كاتی پێویستدا ڕەنگی خۆی دەگۆڕێت وژەهر دەڕێژێت لە كاتی تردا، چونكە ئەو قسانەی لەسەر مینبەرەكانەوە دەیكات ، تەواو جیاوازە لەو قسانەی كە لە چاوپێكەوتن و دانیشتە داخراوەكاندا دەیكات.

لە ڕاستیدا حسون كێشەی لەوە گەورەترە بە دوای هەڵەو لادان و چەواشەكارییەكانیدا بگەڕێی، چونكە ئەو وەكو بۆ هەموان دەركەوتووە بە شێوەیەكی راشكاوانە خۆی لە ژێر چەتری ئیسلامدا حەشارداوەوخۆی لە بوقێك زیاتر نییە بۆ ڕژێمە خوێنمژەكەی سوریاو بە كرێگرتەیەكی خۆفرۆشی ئێرانە، خۆ دەرخستنیشی وەكو سونی ، یان سۆفی نەقشبەندی وەكو كەسێك كە بەرگری لە بنەماكانی تصوف و وحدة الوجود وابن عربي دەكات ، یان باس لە برایەتی هەموو دینەكان پێكەوە دەكات ،هەموو ئەوانە ڕەنگێكی درۆینەیە بۆ ئەوەی خۆی پێ بشارێتەوە و ڕاستیەكانی بۆ هەموو خەڵكی دەرنەكەوێت، ئەگینا بەدەر لە شەرعیەتدەرێكی نەفعی بێ بار بۆ كاولكاری و تاوانەكانی بەشار ئەسەد لە سوریا هیچی تر نییە، كە كوڕەكەی خۆیشی بەو ئاگرە سوتا كە بۆ ڕژێمی سوریای خۆش كرد.

لە هەڵوێست وقسە سەیروسەمەرەكانی تری:

-جارێكیان لە وتارێكیدا وتی: **«لو طلب مني نبينا محمد، ان اكفر بالمسيحية او باليهودية لكفرت بمحمد»** واتە: ئەگەر پێغەمبەرمان محمد داوام لێ بكات كوفر بە مسسیحییەت یان جولەكەكان بكەم كوفر بە محمد خۆی ئەكەم.

-له جیگەیەکی تر وتی: «لو أن محمدا أمرني بقتل الناس لقلت له أنت لست نبيا» واتە: ئەگەر محمد فەرمانم پێ بکات خەڵکی بکوژم پێی دەڵێم تۆ پێغەمبەر نیت.

-له ساڵی ٢٠٠٧ لەبەردەم پەرلەمانی ئەڵمانیا وتی: «العلمانية ليست ضد الدين و أنا مسلم علماني»، واته: عەلمانیەت دژی ئایین نییە، من موسوڵمانێکی عەلمانیم.

-لە گەڵ مەریەم نور لە ناو الجامع الاموي باوەشیان بەیەکدا کرد و ماچی یەکتریا کرد، دواتریش مەریەم نور بەخۆی باسی ئەوەی لە بەرنامەیەکیدا کرد.

-لە وتارێکی تۆمارکراویدا باسی عیسی ئەکات، ئەڵێت کوڕی (روح القدس) ە کە ئاسمان ئەوی پیرۆزکردووە.

-لە چاوپێکەوتنێکیدا لە گەڵ وەفدیکی ئەمریکی پێی وتن: " نحن أخوة تحت قبة الله " واتە: ئێمەو ئیوە لە ژێر گومەزێکی خوای گەورەدا براین.

-هەروەها لە چاوپێکەوتنی لە گەڵ وەفدێکی زانکۆی جۆرج میسون ی ئەمریکی لە وەزارەتی ئەوقاف لە دیمەشق وتی: ( حملنا المسيحية للعالم وحافظنا على اليهودية في العالم ، امرنا الاسلام بالمحافظة على المسيحية واليهودية ) .واته:...ئیسلام فەرمانی پێکردووین پارێزگاری لە ئایینی گاورو جولەکەکان بکەین.

-داواشی کرد بابەتی پەروەردەی ئیسلامی لە خوێندنی قوتابخانەکان هەڵبگیردرێت ، هەورووەها داوای داخستنی هەموو خوێندگا ئیسلامییەکانی کرد و،وتی لە جیاتی ئەوە ئەتوانن لە ڕێگەی

سیدیەوە فێری زانستە ئیسلامییەکان بن. (مجلس الإفتاء السوري) بە سەرۆکایەتی أحمد حسون فەتوایان دەرکرد کە بەرگری کردن لە ڕژێمی بشار الاسد جیهادەو (فرض عین) یشە لەسەر هەموو سوریيەك.لە فەتواکانی تری ئەو ئەنجومەنەش فەتوای ئەوەیان داوە کە پەچەو نیقاب عادەتێکی نامۆیەو پەیوەندی بە ئیسلامەوە نییە.

-لە مزگەوتی (جامع الروضة) کە پێشنوێژ و وتارخوێنی بوو ، ڕێگەی بە ئافرەتی سفوری سەرڕووت و قاچ ڕووت ئەدا بچنە وورەوەو لەگەڵی دادەنیشتن لە ژورەکەی خۆی.

-لە ناو مزگەوتی الروضه ی خۆی ، تەوقەی لەگەڵ وەزیری دەرەوەی نەمسا (**أو رسولا بلا سنيك**) کرد، کە پرسیاریان لێ کرد چۆن تەوقە لەگەل ئافرەتدا دەکەی ؟ وتی: **انا المفتي،** واتە: من خۆم موفتیم. وینەی تەوقەکردنیشی لە گوگل لە گەل ئافرەتی نیمچە رووتدا زۆرە، هەروەها ئاساییە بەلایەوە وینە بگرێت لە گەل سوکترین ئەکتەرە ئافرەتەکانی میسر وەکو ئیلهام شاهین کە موسحەفێکی پێشکەش کرد بە هۆی پشتگیری ئەو ئافرەتە بۆ ڕژێمی بشار الاسد.

-پەیوەندی لەگەل قەشەکان زۆر پتەوترە تا زانا موسوڵمانەکان و سەردانەکانیشی بۆ کڵێساکان زیاترە تا سەردانی بۆ مزگەوتەکان.

-وێنەی سێڵفی لەگەل ئافرەتاندا دەگرێت، بۆ نموونە: سێڵفییەکەی لەگەڵ (ماریانا ناوموفا) پاڵەوانی رفع الاثقال للناشئين.

-جارێکان عائض القرني لە العربية نيت احمد حسون ی بە (كذاب أشر) و بەوەی یەکێکە لە (علماء السوء) وەسف کرد.

-لە سەردانێکیدا بۆ جەزائیر لەو کاتەی لە مزگەوتێکدا موحازەرەیەکی دەوتەوە بە ناونیشانی: "السنة والانفتاح ومبادئ الإسلام" هەندێ لە ئامادەبوان توانیان خۆیانی پێ بگەیەنن ولێدانێکی باشی بکەن!

-لە ساڵی ٢٠٠٨ وتارێکی لەبەردەم پەرلەمانی ئەوروپیدا پێشکەش کرد، ئەمەی خوارەوە هەندێکە لەو وتانەی تێیداهات: **الإنسان هو المقدس الأول بعد الله، أنا ضد العمليات الاستشهادية والانتحارية، لماذا لم يكن هناك عمليات قبل ١٩٤٨؟**

***لعن الله كل من يقتل طفلاً فلسطينياً أو اسرائيلياً أو عراقياً.**

***كە باسی شام ی کرد بەم شێوە پۆلێنی کرد: (فلسطين لبنان سورية الأردن إسرائيل.**

بۆ زیاتر ناسینی موفتی سوریا أحمد حسون/ بڕوانە:

-نشر التشيع في سوريا/ عبدالستير آل الحسين.

-يا علماء سوريا هلا وقفة رجال في وجه المفتي/ د.منير الغضبان.

-الشيخ الضال المضل مفتي النظام النصيري وذيله/ مؤمن محمد نديم.

ماذا تعرف عن مفتي سوريا أحمد حسون/ سایتی الالوكة.

-شبكة الربانيون العلمية، لە باسێکیدا دەربارەی أحمد حسون.

# ( محمد سعيد رمضان البوطي )



ناوی (شێخ محمد سعید رمضان البوطي)لە بنەماڵەیەکی کورد لە گوندی جلیکای سەر بە دورگەی بۆتان لە تورکیا لە ساڵی ١٩٢٩ لە دایکبووە، لە ساڵی ١٩٣٣ بە هۆی بڵاوبوونەوەی بیری کەمالیزم و زوڵم زۆریان لە سەر موسوڵمانان، کاتێك تەمەنی چوارساڵ بووە لەگەل مەلا ڕەمەزانی باوکی کۆچیان بۆ دیمەشق کردووە، لەتەمەنی سیانزە ساڵیدا دایکی وەفاتی کردووەو،باوکی ژنێکی تری هێناوە وتورك بووە، هەر بۆیە بوطی شارەزایی لە زمانی توورکیش هەبووە.لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا هاوسەرگیری کردووەو خاوەنی شەش کوڕو یەك کچ بووە، بوطي کاریگەری باوکی زۆر بەسەرەوە بووەو زانستە شەرعییەکانی لە ئەو وەرگرتووەو دواتر باوکی خستوویەتیە لای ئافرەتێك و لە تەمەنی شانزە ساڵیدا بە ماوەی شەش مانگ قورئانی پي خەتم کردووە.

بوطي خويندنى سەرەتايى لە مزگەوتى: منجك لەلاى شێخ حسن عبدالرحمن حبنكة الميداني تەواو كردووە،هەر لەوێ پێش تەمەنى حەڤدە ساڵى چووەتە سەر مينبەر و خوتبەى داوە.

لە ساڵى ١٩٥٣ بۆ تەواو كردنى خوێندنى زانكۆيى ڕوويكردووەتە قاهيرەو جارێكى تر لە ساڵى ١٩٥٦ چووەتەوە قاهيرەو دبلۆمى لە زمانى عەرەبيدا لە ئەزهەر بەدەست هێناوەو دواتريش بڕوانامەى دوكتۆراى لە ئەزهەر هێناوەو،بووەتە مامۆستا لە كۆلێژى شەريعە لە ديمەشق ودواى چەند ساڵيك بەرز بووەتەوە بە پلەى ڕاگر.

خاوەنى كۆمەڵێكى زۆرە لە كتێب كە كەمتر نييە لەچل كتێب لە جۆرەكانى زانستدا، لە فيكرو فقه و عقيدة وأدب و تصوف وبوارى تر، هەندێك لەو كتيبانەش وەكو پشتگيرى و بەرپەرچدانەوەش كێشەو مشت ومڕى زۆرى لێدەكەوتەوە، بۆ نموونە كتێبى: (اللامذهبية أخطر بدعة تهدد الشريعة الإسلامية) و (السلفية مرحلة زمنية مباركة لا مذهب إسلامي) و (الحكم العطائية شرح وتحليل) و(الجهاد في الإسلام: كيف نفهمه؟ وكيف نمارسه؟) و(فقه السيرة النبوية مع موجز لتاريخ الخلافة الراشدة) و(كبرى اليقينيات الكونية وجود الخالق و وظيفة المخلوق)

ئەم كەسايەتييە گومانى تێدا نييە كە كەسێكى زانا و قسەزان و خەتيبێكى بە تواناو نووسەرێكى خاوەن مەنتقى بەهێزو پێز بووە، تەمەنێكى درێژى لە فێربوونى زانست وتنەوەى وتارى هەينى و وانەى شەرعى و فێركردنى موسوڵمانان بەسەر بردووە، هەر لە مناڵى و پێش ئەوەى بگاتە تەمەنى پێگەيشتن، هەندێكى لە زانستە شەرعييەكان خويندبوو و(ألفية ابن مالك ) ى لەبەر كردبوو.

کاتیك باسی بابەتێکی فیکری ئەکرد گوێگری خۆی بەو زانستەی کە هەیبوو هەر وەها بەو هێمنی و لەسەرخۆییەی کە پێوە دیار بوو سەرسام ئەکرد، بۆیە خەڵکانێکی زۆر لە جیهانی ئیسلامی بەو زانایەوە هۆگر بوون، بە تایبەتی بەهۆی کتیبەکانی و ئەو وانەو خوتبەو چاوپێکەوتنانەی کە هەیبوو لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن.

شایانی باسە ئەم زانایە پەیوەندی لە گەل کۆمەڵەی (الاخوان المسلمین) باش نەبوو، چونکە ئەو لە بنچینەوە ئاڕاستەی کاری سیاسی و ڕەوتی جیهادی رەتدەکردەوە، لە پاش دەرچوونی کتیبی: «الجهاد في الإسلام» دوبارە مشت و مڕو ومقۆمقۆیەکی زۆر لە نێوان خۆی و نەیارەکانیدا درووست بوو.

بوطی لە عەقیدەو بیروباوەڕیدا لە سەر ڕێڕەوی ئەشعەرییەکان بوو، بەڵکو یەکیك بوو لە سەرانی ئەشعەرییەکان لەم سەردەمەی خۆماندا، هەندێك ئەویان چواندووە بە ئەبوحامیدی غەزالی لە ڕووی هێمنی و لەسەر خۆیی و بە هیزی بەڵگەو قسەکانی.هاوکات وەکو متصوف یش ئەناسرا ولە مەسەلەی پابەند بوون بە بەمەزهەبی فیقهی زۆر توند بوو.

یەکێکی تر لە نیشانەکانی زانستی ئەو پیاوە وڕێکردنی بوو لەگەڵ پێویستییەکانی سەردەمدا، کە ئەوەش وای کرد جەماوەرێکی زۆری هەبێت، ئەوە بوو گرنگی زۆری بە زانستی مادی پەتی ئەدا و ڕەددی بێ باوەڕانی ئەدایەوە، توێژینەوە دوکتۆراکەی لەسەر ڕەخنەگرتن بوو لە فیکری مارکسی و بەرگری بوو لە عەقیدەی ئیسلامی و وجودی خوای گەورە بە ناونیشانی: (نقض أوهام المادية الجدلية)، کتێبی: (كبرى اليقييات الكونية وجود الخالق ووظيفة المخلوق.)

لە کاتی خۆیدا چاوی موسوڵمانانی پێ گەشایەوە لە هەموو لایەکدا،چونکە کتێبەکەی بوطی سارێژی برینێکی بە سوێ بوو کە گەنجان لەو سەردەمە بە دەستییەوە ئەیانناڵان.

بوطی لە زانستە شەرعییەکاندا مامۆستایەکی تەقلیدی پارێزگار بوو، لەمەسەلەی فیقهدا مەزهەبییەکی توند و سەرسەخت بوو، ئەوەندە متمانەی بە ڕێڕەوی شافیعی هەبوو بەرگرییەکی ڕەهای لێ دەکرد و، هەر ئەوەش وای کرد بە شێوەیەکی توند لە گەل سەلەفییەکانی سوریا و وڵاتانی تر تێکبگیرێت ومشت مڕو شەڕە قسە و ئاڵوگۆڕ کردنی تۆمەت لە نێوانیاندا پەرە بسێنیت و بەردەوام بێت ، تەنانەت یەکێك لە گەورەترین زمانحاڵەکانی سەلەفییەت لەم سەردەمە کە محمد ناصر الدين الألباني بوو، کتێبێکی لە دژی محمد سعید رمضان البوطي نووسی بە ناونیشانی:

(الرد على جهالات البوطي)

بوطی لە گەڵ لێهاتوویی لە زانستە شەرعییەکاندا ، لە زمانی عەرەبیدا زۆر بەهێز بوو هەروەها بایەخی بە بواری ئەدەب و وێژەش هەبوو، هەندێ کتێبی لەو بارەشەوە نووسیوە،وەکو : من الفكر والقلب ، الحب في القرآن ودور الحب في حياة الإنسان، هەروەها وەکو مامۆستایەکی کورد ڕۆمانی مەم وزین ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی.

ئینجا ئەو بە یەکێك لە سەرانی تصوف یش دەناسرا و لەدەستەی ڕاوێژکاری زۆر لایەنی فەرمی سۆفییەکانی جیهاندا بوو وحیسابی بۆ دەکرا،

بۆ نموونە: لە دەستەی بەڕێوەبردنی دامەزراوەی (طابة) لە گەڵ علي الجفري بوو، کە بەیەکێك لە گەورەترین ئەو ڕێکخراوانە دادەنرێت کە لێدوان لە سۆفییەکان دەدات. بەڵام پاکی و بێگەردی تەنها بۆ خوای گەورەیە، بوطی سەرەڕای ئەو هەموو زانست و تواناو بەهرانە کە هەیبوو، کێشە وگرفتێکی زۆر گەورەی هەبوو، کە ئەویش بریتی بوو لەوەی لە ڕێزی (شیوخ السلاطین) یان (علماء السلطة ) پۆلین دەکرا، واتە: زانا و پیاوی دەسەڵات بوو. ئەمەش کردارێکی سەرسوڕهینەر بوو کە زانایەکی وەکو بوطی ئەو هەموزانستەی فریای نەکەوت بۆ ئەوەی خۆی لە حوکمێکی ستەمکاری خوینمژی وەکو حوکمی بەعسیەکانی سوریا ڕزگار بکات.

١ -بوطي وەکو نەیتوانی بەرانبەر ئەو ستەمکارانە جیهادی وتنی حەق بکات، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (**ورجل قام إلى إمام جائر فأمره ونهاه فقتله**)، نەشیتوانی بێدەنگی هەڵبژێرێت، یان وەکو ئەو زانا و کەسایەتییانە خۆی دەرباز بکات وهەڵبێت، بەڵکو خۆی بۆ پشتگیری کردنی حافظ الأسد یەکلا کردەوە، لە دوای بە هیلاك چوونی ئەویش درێژەی بە پشتگیری خۆی دا بۆ دڕندەکەی کوڕی (بشار الأسد)

٢ -سەرەتای پەیوەندی بوطی و حافظ الأسد بۆ ١٦ حزيران ١٩٧٩ دەگەڕێتەوە، لەو کێشەی کە بە "مجزرة مدرسة المدفعية في حلب" ناسرا، کاتێك کۆمەڵێك چەکداری ئیسلامی بەناو "الطليعة المقاتلة للإخوان المسلمين" تەقەیان لە کۆمەڵێك ئەفسەری عەلەوی کرد وسی و دوو کەسیان لێ کوشتن و پەنجاو چواریشیان بریندار کرد،

جا لەو کەیسەدا داوا لە بوطی کرا حوکمی شەریعەتی ئیسلام باس بکات و ئەویش بە شیکراوەیی لە تەلەفزیونی سوریا باسی لە حەرامی ئەو کارە کرد کە ئەو گەنجانە پێی هەڵسابوون.

٣ -لە ٢ شباط ساڵی ١٩٨٢ لە ئۆپەراسیۆنێکی دڕندانەدا بە سەرپەرشتی رفعت الأسد ی برای حافظ الاسد بۆ سەر شاری حەما کە بیست و حەوت ڕۆژدی خایاند، ئەو شارەیان خاپور کرد و لە قەتڵ و عامێکی کەم وێنە لە مێژوودا ، زیاتر لە چل هەزار لە خەڵکی ئەو شارە کوژران ودەوری پانزە هەزار کەسیش بێ سەرو شوێن بوون کە تاکو ئێستاش چارەنووسی زۆریان دیار نییە، هەڵوێستی محمد سعيد رمضان البوطي لەم قەتلو عامەیش پشتگیری و پاساو هێنانەوە بوو کە ڕژێم دەبوو بە توندی وەڵام بداتەوە بەرانبەر ئەو پشێوییەی ئیخوانەکان لە حەما درووستیان کردبوو.

٤ -بوطی پەیوەندییەکی بە هیز لە گەڵ حافظ الأسد کۆی دەکردەوەو تەنانەت ئەو ماوەی پێش مردنی ئەسەد بوطی بە تەلیفۆن هەر پەیوەندی لەگەڵی هەبوو، ئەویش لە وەسێتەکەیدا نووسیبووی بوطی نوێژم لەسەر بکات، هەروایش بوو بوطی نوێژی لەسەر جەنازەکەی کرد و بە پێچەوانەی نوێژی جەنازە کە دەنگی تیا بەرز ناکریتەوە بەڵام ئەو کە گەیشتە دوعاکەی بۆ ئەسەد بە دەنگی بەرزەوە ئەگریا وفرمێسکی ئەڕشت و ئەیوت: خوایە من شایەتی ئەدەم کە حافظ الاسد شایەتی یەکخواپەرستی بۆ تۆ ئەدا، بەردەوام ئەگریا وئارامی نەمابوو ، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە بەشاری کوڕی ئەسەد زۆر ئاسایی وەستابوو لە نزیك ترمەکە، دواتریش ئەو دڕەندە گۆڕ بەگۆڕەی بە عومەری کوری خەتتاب ڕەزای خوای لێبێت چواند.

٥ -لە ساڵی ١٩٩٤ باسل الاسد ی کوڕی حافظ الاسد لە روداوێکی هاتوچۆی تەمومژاویدا گیانی لەدەستدا، لە کاتێکدا ئاخونە عەلەویەکان حەزیان دەکرد نوێژی جەنازەکەی خۆیان بیکەن ،بەڵام حافظ الاسد داوای لە بوطی کرد نوێژەکەی بکات ودواتر بوطي وتی : "**و انني ارى باسل هذه الساعة في الجنة مع الصديقين والشهداء والصالحين وحسن اولئك رفيقا**" واتە: من ئێستا باسل لەبەهەشتدا ئەبینم، لەگەڵ ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکاندا..ئەمە لە کاتێکدا کەس ناتوانێت شایەتی چوونە بەهەشت بۆ کەسی خوا ناسیش بدات، نەخوازەڵا تاوانبارێکی وەکو باسل.(**أَطَّلَعَ الْغَيْبَ أَمِ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا**)

٦ -ئینجا لە دوای لە ناوچوونی ئەسەدی باوك بوطی لە ڕۆژی وەرگرتننی سەرۆکایەتی لەلایەن بەشار وتارێکی پێشکەش کرد و وتی: (**لقد آل الامر في هذا اليوم اليك بمشيئة الله عزوجل اولا ثم ببيعة صادقة صافية من هذا الشعب**) واتە: ئەمرۆ بە فەرمانی خوای گەورە وبە بەیعەتێکی راستگۆو بێ غەل و غەشی خەڵکی تۆ بوویت بە سەرۆك.بەهەمان شێوە لەگەڵ ئەسەدی کوڕدا بەردەوام بوو، بەڵام بشار ڕقی لە خۆ نزیك کردنەوەو ماستاو کردنی بوطی بوو بۆ باوکی، بۆیە لەسەردەمی خۆیدا گرنگی پێ نەئەدا و تەنها لە بۆنەکاندا ئەوی ئەیبینی ، ئەوەش وەکو هەندێ لە شارەزایان ئەڵێن هەلێکی باش بوو خۆی لە دەستیان ڕزگار بکردایە، بەڵام ئەو هەر لە دەرگای بەشاردا ئەوەستا تاکو ئەیبینی و، ئەو تەمەنە زۆرەی کە تەواو پیر بوو بوو، هیچ کاریگەرییەکی باشی نەبوو بۆ ئەوەی پشت لەو ستەمکارانە بکات.

٧ - کاتێك شۆرشی خەڵکی سوریا دەستی پێکرد، دووبارە ڕۆڵی بوطی دەستی پیکردەوەو، بە ناو ئایینی ئیسلامەوەوبوو بە پاریزەری ڕژێمی ئەسەد، ئەو خەڵکەی هەموو بە خوارج و یاخی بوو دەژمارد کە لە دژی شەرعییەتی دەسەڵاتداردا دەوەستانەوە.

٨ -لە پشتگیری بەردەوامی بوطی بۆ ڕژێم لە دژی خەڵکی کە ئەو کاتە زیاتر ڕۆژانی هەیني خۆپیشاندانیان دەکرد، ئەو فەتوای زۆری هەیە، لەوانە: : (**تأملت في معظمهم ووجدت أنهم لا يعرفون شيئاً اسمه صلاة ، والقسم الأكبر لم يعرف جبينه السجود أبداً** ) واتە: لە حاڵی ئەو خەڵکەی خۆ پیشاندان ئەکەن وردبوومەتەوە و بۆم دەرکەوتووە نوێژ ناکەن و زۆربەی زۆریان نەوچەوانی سوجدەیەکی نەبردووە، (**سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ** )

یان وەسفی دەکردن بەوەی کە بریتین لە: ( **حثالة ملاحدة يتمردون على الله كل جمعة** ) کۆمەڵە خەڵکانێکی بێ بایەخی بێ دینن، هەموو هەینییەك لە دژی خوای گەورە هەڵدەگەڕانەوە.

٩ -ئینجا ئەو هەمیشە سەربازانی سوریای نوسەیری و بەعسی خوینمژی بە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) چواندووە.سوپای بەشار و ڕژێمەکەشی بە دەوڵەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشبیە کردووە.

١٠ -جارێکیان کەسێك پرسیاری لێ کرد و،وتی: لە لایەن پیاوەکانی بەشارەوە لە زیندان ناچار کراوم سوجدە بۆ وینەیەکی بشار الاسد ببەم، ئەوە حوکمی چییە، ئەویش لە وەڵامدا وتی: وا بزانە بەرماڵێکەو لەسەری سوجدەت بۆ خوا بردووە!

١١ -جارێکی تر کەسێك پرسیارێکی لێ کرد و، وتی: «**ما حكم توحيد غير الله قسرا كما يحدث في فروع الأمن عند الاعتقال وإجبارهم على القول إن بشار الأسد إلهنا وربنا**) واتە: پرسیاری ئەوەی لێکراوە حوکمی چییە لە زیندانەکاندا بە زۆر ناچارمان ئەکەن بڵێین بەشار خوامانە، ئەویش وەڵامی دایەوە بە پێی فەتوای ژمارە ١٤٦٥٨کە تێیدا هاتووە: «**إن ذلك يحدث بسبب خروج هذا الشخص مع المسيرات إلى الشارع والهتاف بإسقاط النظام وسبّ رئيسه والدعوة إلى رحيله**»واتە: هۆکاری ئەو ناچار کردنە ئەوەیە ئەو کەسانە لەگەڵ خۆپیشاندەراندا دەردەچن وداوای ڕوخانی ڕژێمەکە ئەکەن و جنێو بە سەرۆك ئەدەن.

١٢ -لە خوتبەیەکیدا لە الجامع الاموي جارێکیان وتي: (سوريا ليست علمانية و هي افضل دولة تطبق الاسلام) واتە: سوریا عەلمانی نییە بەڵکو باشترین دەولەتە ئیسلام جێبەجي بکات..ئەمەش لە کاتێکدایە دەولەتی سوریا نەك عەلمانیە بەڵکو هەموو شەرو خراپەیەکی دونیای لە خۆیدا کۆکردووەتەو تۆمەتێکی ناشیرینەو بوهتانێکی گەورەیە ئەو ڕژێمە ستەمکارە بوترێت ئیسلام جێبەجي ئەکات ،بەڵکو بوختانێکیشە بۆ ئیسلام ئەکرێت.

١٣ -لە ٢٠١٢/٥/٨ لە وتاری هەینیدا وتی: (**إن ما يحدث في سوريا هذه الايام هو حرب على الله**) واتە: ئەمەی کە لە سوریا ڕوو ئەدات، جەنگێکە لە دژی خوا ئەکرێت! ئەم قسەش ڕاستە وەکو شێخ محمد اليعقوبي لە ڕەددانەوەیەکی بوطی دا دەڵێت، بەڵام جەنگەکە لەلایەن سەرگەورەکانی بوطی دژ بە ئیسلام و موسوڵمانان ڕاگەیەنراوە نەك بە پێچەوانەوە!

١٤ -لە وتاری پێش کۆتا وتاری لە ژیانیدا، وتی:«**بعد هذا أنا الضامن بإن الله عز وجل سيكرمنا جميعا بأعاجيب النصر.. بخوارق النصر والتأييد**»واتە: من دەستەبەرم بۆ ئەوەی خوای گەورە خەڵاتمان ئەکات بەسەرکەوتنێکی مەزن و بە پشتگیری و سەرخستنی خۆی!! لە دوای دوو هەفتە لەم وتەیەی کە ئەوپەڕی پشتگیری بۆ ئەو زوڵم زۆرەی بشار نیشان ئەدات و داوای سەرکەوتنی خوای گەورەشی بۆ ئەکرد، کوژرا وبۆ یەکجاری سەرینایەوەو لە پشتگیریکردنی بەعسیەکان کەوت!

١٥ -زۆر لە زانایان ئامۆژگاریان کرد واز لە پشتگیری کردنی ڕژێمی ئەسەد بهێنێت و تەوبە بکات و هیچ نەبێت لەماڵی خۆی دانیشێت وقسە نەکات، بەڵام ئەو هەر لەو کارەی خۆی تا دوا هەناسەی بەردەوام بوو، بۆ نموونە دکتۆرراتب النابلسي لە نامەیەکیدا بۆ بوطی ئامۆژگاری دەکات وپێی ئەڵێت برۆ لە ماڵی خۆت دابنیشە و پشتگیری ئەم ڕژێمە مەکە، چونکە من دەترسم بەرپرسی هەموو دڵۆپە خوێنێك بیت کە لە سوریا دەڕژێت، هەروەها پێی دەڵێت : پابەند بە بەوەی کە دەیزانی دەربارەی ڕۆژگاری فیتنە، ئەگەرنا بەرپرس دەبیت لە کوژرانی هەموو مناڵێك لە سوریا ، لە کوژرانی هەموو گەنجێك لە تەمەنی گوڵدا کە بەدڕندانەترین شێوە لە زیندانەکانی بەشاردا دەکوژرێت، یان لە بەندیخانە تاریکەکاندا ئەشکەنجە ئەدرێت: **(التزم بما تقوله عن أيام الفتن، والزم بيتك واملك عليك لسانك، لأنني أخشى عليك أن تحاسب عن كل نقطة دم من طفل بريء قتل ظلماً أو عن شاب في عمر الزهور قتل بوحشية أو عذِّب في أقبية الظلمة)**

١٦ -لە ٢٠١١/٧/٢٢ لە شاری دیر الزور لە پاش نوێژی هەینی خەڵکی وەکونارەزایی بەرانبەر هەڵوێستەکانی بوطی لە پشتگیری ڕژێمەکەی ئەسەدو وەستان لە دژی خەڵکی سوریا کتیبەکانی بۆتیان کۆکردەوەو ئاگریان تێ بەردا.

ئەمانەم تەنها بۆ نموونەی و بەڵگە هێنایەوە خستووەتەڕوو، باسەکەش ئەوەندە ناخۆش و ئازاربەخشە خوا ئاگادارە حەز ناکەم زۆر درێژەی پي بدەم، ئەگینا شێخی بوطی هەرگیز بۆ ساتێکیش لە دوای ساڵی ١٩٧٩ لە پشتگیری کردنی ئەو ڕژێمە سارد نەبووەتەوە کە ئەوە سەرەتای پەیوەندییەکانی بوو لە گەڵ حافظ الاسد و سەرەتای لە خشتەچوونی زانایەك بوو کە پلەوپایەی ئاراستەکردنی موسوڵمانانی هەبوو لە ئاستێکی باڵادا ، بەڵام مەخابن پشتی هەردوو ڕژێمی ئەسەدی باوك و ئەسەدی کوڕی بەرنەداو هەمیشە بەناوی خوا پێغەمبەرەوە(ﷺ) پاڵپشتی ئەوان بووەو ئەوانی بە هاوەڵان و پیاوچاکان و شەهیدان چواندووە، بۆیە بەوەندەی باسم کرد کۆتایی پێ ئەهینم و پێویست بە هێنانەوەی نموونەی تر ناکات.

لە ٢١/٣/٢٠١٣ لە مزگەوتی ئیمان لەگەڕەکی المزرعة لە دیمەشق، بوطی خەریکی وتنەوەی وانەیەك بوو وقورئانەکەی لەبەردەستدا بوو، کاتیك کە تەقینەوەیەك لە لە مزگەوتەکەیدا ڕوویدا وگیانی لەدەستدا.قسەو باس و شیکاری زۆر بۆ ڕوداوەکە کرا، بەو پێیەش کە کەس خۆی بە خاوەنی کوشتنەکەی نەکرد و بەرپسیارێتی نیشان نەدا، هەروەها لەبەر ئەوەی جێ پەنجەی ڕژێم بەسەر ڕوداوەکەوە دیر بوو، بۆیە بەڵگەکان بەرەو ئەوە ئاماژەیان کرد کە بەشار خۆی ئەوی کوشتووە.

ڕووداوی کوژرانی بوطی و دەیان لەوانەی ئامادەی وانەکەی بوون لەو مزگەوتە، ڕووداوێکی لێڵ و تەمومژاوی بوو، لە ٢٣ مارس ٢٠١٣ لە ماڵەکەی خۆیەوە جەنازەکەی بەرەو الجامع الأموي براو ،نوێژی لەسەر کرا بە ئامادەبوونی احمد بدرالدين حسون و کوڕێکی بوطی و بشار الاسد یش خۆی ئامادە نەبوو، تەرمەکەیان لە نزیك گۆڕەکەی صلاح الدين الايوب بە خاك سپارد.

هەموو ئاراستەکان بۆ ئەوە ئەچوون کە بەشار خۆی ئەوەی کوشتووە، سەبارەت بە هۆکارەکانیشی بەهەمان شیوە شیکردنەوەی زۆری بۆ کراوە، لەوانە:

بوطی سەرەڕای پشتگیری ڕەهای بۆ ڕژێمی بەعس لە سوریا، بەڵام پارسەنگی کەسایەتی خۆی لە ڕێگەی زانست و مێژووی خۆی و مەلا ڕەمەزانی باوکی پاراستبوو، خەڵکانیکی زۆر متمانەیان پێی هەبوو لە ناوەوەو دەرەوەی سوریا، بە کورتی بوطی سەرەڕای هەموو شتێك هەر کەسایەتییەکی ئایینی بوو لەسەر ئاستی جیهان، ڕاستە نەیاری زۆری هەبوو بە هۆی هەڵوێستە سیاسیەکانی لە پاساو هێنانەوە بۆ تاوان و کۆمەڵکوژییەکانی ڕژێمی ئەسەد، بەڵام هەر لەو کاتانەدا کەس و لایەنی زۆر هەبوون پێیان وابوو بوطی لە ژێر کاریگەریدایەو ناچارە و ئەو قسانەی بە زۆر پي ئەکرێت!

ماوەیەکیش بوو وەکو ئەوەترێت ڕژێم ترسێکی لەو پیاوە پەیدا کردبوو ومتمانەی بەئەو کەم بووبوویەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی ئەو ڕازی نەبوو ئیمزا لەسەر فەتوایەکی أحمد بدر الدين حسون ی موفتی وڵات بکات، لە وانەیەکیشیدا ماوەیەك پێش کوژرانی دەڵێت:

ئەوەی کە ئێستا ڕوو ئەدات لە سوریا بە پێی پلانێك ڕوو ئەدات لە دەرەوە دێت و ئیشی پێ ئەکرێت، بۆیە بشار بە کوشتنی بوطی دوو ئامانجی پێکا:

**یەکەم**: کەسێکی لەناو برد کە ئیشی پێ نەمابوو ، یان زۆربەی ئەوەی کە ویستی پێی کردبوو.

**دووەم:** نەیارەکانی بە کوشتنی ئەو تۆمەتبار کرد وکردی بە خاڵێکی سیاسی لە بەرژەوەندی خۆی و دژی نەیارەکانی..

هەموو ئەوانەش چووبوونە سەر ڕووداوەکەو گوێیان لە تەقینەوەکە بوو ، هەستیان بەوە کردبوو ئەو ڕووداوە و دەنگی تەقینەوەکەش حاڵەتێکی جیاواز بووە:

*مزگەوتەکە شوێنەواری کاولکاری پیوەدیار نەبوو کە لە کاتی ڕوودانی ئەوجۆرە تەقینەوانە دەرئەکەون، زۆرێك لە شتەکانی هیچیان بەرنەکەوتبوو، تەنانەت هەندیك بە تەقینەوەیەکی هاوڕێی ژینگە( صديق للبيئة) ناویان برد.

*چەند کەسێك لەگەل بوطی بینران کە کوژرابوون ڕاستە زۆربوون ، بەڵام هەرگیز ئەو ژمارە زۆرە نەبوون کە ڕاگەیاندنەکان باسیان کردبو.

*ئینجا زۆربەی کوژراوەکان وەکو دەڵێن سەریان بەرکەوتبوو، بەڵکو هەندي بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی بوطی لە تەقنەوەکەدا نەمردووە بەڵکو دوایی کوژراوە..

*کەسیش تەرمەکەی بوطی نەبینی لەو کاتەدا.

*هەروەها لە دوای ڕووداوەکە کە لەڕێگەی کەسێکی خۆکوژەوە ئەنجام درا، تەلەفزیۆنی سوری یەکسەر فیلمێکی دەربارەی کوژران و ژیاننامەی بوطی بڵاوکردەوە کە بە پێی شارەزایان فیلمێکی وا بەلای کەمەوە شەش سعاتی پێویستە بۆ ئەوەی ئامادە بکرێت.کە ئەوەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کوژرانەکەی بە پلانێکی بەرنامە بۆ داڕێژراو ئەنجامدراوە. هەرچۆنێکیش بێت، ئەو زاناو کەسایەتییە ناودارە بەو شێوە کۆتایی بە ژیانی هات، ئیمەیش لە دوو روانگەوە ئەتوانین تەماشای پرسەکە بکەین:

١ -بە ڕواڵەت و ئەوەی کە بە چاوی سەرمان بینیمان؛ بوطی لە ساڵی ١٩٧٩ تاکو ئەو ساتەی لە لەو مزگەوتە کوژرا لە ٢٠١٣ بۆ ساتیکیش لە پشتگیری ڕژێمی بەعسی سوریا سارد نەبوویەوەو

هەموو زانستی و توانای کەسایەتی خۆی بۆ داپۆشینی تاوانەکانی هەردوو ئەسەدی باوك وکوردا- کە لە سەدەی بیستەم بێ وینە نەبن وێنەیان زۆر کەم و دەگمەنە لە تاواندا - بە کارهێنا، بەدەر لەو شتانەش کە دەوترێت بەڵام لەسەر ئەو ڕێبازە مرد و نە تەوبەی کرد و پاشگەز بوویە، بەڵکو لاوازیش نەبوو لە بەرگری کردن لەو ڕژێمە، ئەمە بە ڕواڵەت و زاهیر و ڕاستی مەسەلەکەش یان ئەگەر نهینییەك لە پشت ئەم دیمەنەوە بوو بێت ئەوەیان تەنها خوای گەورە پێی عەلیمە.

٢ -سەرەڕای هەرچی ئەو هەڵوێستە خراپانەی کە بوطی هەیبوو لە پشتگیریکردنی ئەو ڕژێمە دڕەندەیە، من دەڵێم: کەس ناتوانێت قسە لە چارەنووسی بوطی لەلای خوا بکات، ئەو پەروەردگارێکی هەیە نهێنی و ئاشکرای ئەزانێت، بە باشەو خراپەکانی عەلیمە،

بە هەرچی وردودرشتی هەیە زانایە، دەرەنجامی ئەو تەنها لەلای ئەو کەسەیە کە درووستی کردووەو دوای مردنی گەڕاوەتەوە لای ئەو ، بۆیە من تەنها ڕاستییەکانم خستە ڕوو وبە هیچ شێوەیەك نە من - پێم وایە - نە کەسی تریش بۆی نییە بڕیار لە مەسیری ئەو لە مەسەلەی چوونە دۆزەخ و چوونە بەهەشت بدات. جێگای سەرنج و تێڕامانیشە ، کە ئەو تاکو ڕۆژی کوژرانی لە شوقەیەکدا کە لە نهۆمی چوارەمی عیمارەیەکی کۆندا بوو دەژیا ، لەبەرانبەر ئەو خزمەتانەی بە ڕژێمی سوریای دەکرد پارەی وەرنەدەگرت وەکو احمد حسون ی موفتی سوریا، بەڵکو خاوەن نەفسێکی بەرز و کەسایەتییەکی بە هێز بووە، سەرەڕای نزیکی لە چڵەپۆپەی دەسەڵات لە سوریا وەکو باسی دەکەن بۆ بەرژەوەندی خۆی و خانەوادەکەی کاری نەکردووە، تەنانەت بە بێ پاسەوان ڕێی کردووە لە شاری دیمەشق. بەش بە حاڵی حۆیشم، من خوینەری زۆرێك لە کتێبەکانی ئەو پیاوە بوومە لەو سەردەمەی کە خویندکاری ئامادەیی بووم لە کۆتایی هەشتاکان و دوای ئەوەش لە نەوەدەکان هەر موتابەعەی نووسینەکانییم کردووە، من سەرەڕای ئەوەی لەو کێشانەی لەگەل سەلەفییەکان هەیبوو، بە تایبەتی ئەوەی کە لەگەل شێخ ئەلبانی هەیبوو، من هەمیشە لە گەل نەیارەکانیدا بووم و ئەوانم بە ڕاست زانیوە، بەڵام ڕێزیشم بۆ بوطی هەبووە، ڕەخنەم لەسەر کتێبی فقه السيره هەبووە و بە تەحقیقی فەرموودەکانەوە دەمخوێندەوە و ئەشمزانی کتێبکی گرنگ و ناوازەیە ، بۆیە کاردانەوەی باشم لەگەلی هەبوو، دەمخوێندەوە و بە وانە لە ١٩٨٩ لە دوزخورماتوو دەموتەوە.

بوطی - وەکو پێشتر باسم کرد - ئەشعەری و سۆفی و مەزهەبی بووە، بەڵام هاوکات لە زۆر مەسەلەی تر، ڕاوبۆچوونی باش بووە،

بۆ نموونە: زۆر توند بووە بەرانبەر دژە سوننەتەکان و بەوردی بیرۆکەی بەناو قورئانییەکانی هەڵوەشاندووەتەو بەرگری لە سوننەت کردووە، ڕێزی لە هاوەڵان گرتووەو پڕ بە گەرووی لە سوریای سەر بە نوسەیرییکاندا بە موعاویە وهەموو هاوەڵان توویەتی ڕەزای خوایان لێبێت، هەر بۆیە ئەو ستایشەی عدنان ابراهیم بانگەشەی بۆ ئەکات و شانازی پێوە ئەکات کە بوطی بۆ ئەو کردوویەتی و ئەڵێت: مامۆستام بووە، ئەو بە شێوەیەکی کردەیی هەڵیوەشاندووەتەوە بەو بەرگری کردنەی لەسوننەت و هەڵوەشاندنەوەی بیری گومڕاکانی وەکو عدنان ابراهیم.

وەکو هەستێکی کەسێتی خۆیشم بەوەی بوطی لەسەر ئەو حاڵە وەفاتی کرد زۆر نیگەران و خەمبارم، پێم ناخۆش بوو کەسایەتییەکی ئاوها کەوتە داوی ئەو ستەمکارانەوە، ، من تەنها ڕقم لە کردەوەکانێتی لەگەڵ ئەو ڕژێمەداو دوا جاریش ئەڵێم بەڵکو پەروەردگاری ڕەحمی پێ بکات،

ئەم هەڵوێستەیشمە ڕەنگە پەیوەندی بە ئەسڵی کەسایەتی خۆمەوە هەبێت کە بە سروشتم توند نیم و حەز بە هیدایەتی خەڵکی ئەکەم و پیم خۆشە خوای گەورە لێیان خۆش بێت، بەڵام هیچ پەیوەندییەکی بەوە نییە کە بوطی کورد بووە، چونکە بەلای منەوە باش باشە، کورد بێت یان هەر نەتەوەیەکی تر، خراپیش بە هەمان شێوە.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە بۆ زۆر سەرچاوە گەڕاومەتەوە، لە دیارترینیان:

-الى أي مدرسة ينتسب البوطي/ محمد اليعقوبي.

-مقتل البوطي/ عبر وعظات/ محمد صالح المنجد.

-كلمة في الشيخ البوطي/ طريف يوسف آغا.

-البوطي قاتلا ومقتولا.

-سيرة عالم ومساندة ظالم/ محمد منصور.

-حكاية الظاهرة البوطية قصة البوطي مع النظام السوري/ حامد عبدالله العلي.

-حين خذل الشيخ البوطي/ موقع المسلم.

-بين البوطي ( رحمه الله ) وعدنان إبراهيم / الشريف حاتم بن عارف العوني.

-کۆمەڵێك تۆمارکراوی ڤیدیۆ لەسەر یوتیوب لە پشتگیری و ڕەخنەگرتن لە محمد سعيد رمضان البوطي، بۆ نموونە: ڕاو بۆچوونی د.وجدي غنيم و أحمد النقيب و صلاح الدين ابو عرفة.

# ( الحجاج بن يوسف الثقفي )




ناوی **(أبو محمد الحجاج بن يوسف بن الحكم بن أبي عقيل بن مسعود بن عامر)**ه، له هۆزی (ثقیف) ه، له ساڵی ٤٠ ی کۆچی له دایکبووەو له ساڵی ٩٥ وەفاتی کردووە، یەکێکە لەسەرکردە ناودارەکانی سەردەمی ئومەوییەکان، سەرەتا لەگەڵ (روح بن زنباع) ی نوینەری خەلیفە بوو، بەڵام دوای درکەوتنی وەکو کەسایەتییەکی سەربازی و سیاسی (عبدالملك بن مروان) لێپرسراوێتی سەربازی گەورەی پێ سپارد و تاکو گەیشتە ئەوەی داوای لێکرد شۆرشی عەبدوڵڵای کوری زوبەیر سەرکوت بکاتەوە و پاش لەنێوبردنی ئەو شۆرشەو کوشتنی عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر، حەجاج لەلایەن خەلیفەوە کرا بە والی لەسەر مەککەو مەدینەو تائیف و دواتر بوو بە والی عێراق و توانی بە ئاگر و ئاسن هەموو دەنگێکی ناڕەزایی دژ بە خیلافەتی ئیسلامی کە بەدەستی دەسەڵاتی ئومەوییەکانەوە بوو کپ بکاتەوە و بۆ ماوەی بیست ساڵ لەوێ فەرمانڕەوا و بەرپرسی یەکەم بوو.

حەججاج کەسێکی بەتوانا بوو لەقسەکردن و زمان پاراو بوو، بە توند وتیژی و زەبروزەنگ دەناسرا وخاوەن کەسایەتییەکی زبر وبە هێز بوو، دەست پاك و داوێن پاك بوو، زۆر دڵسۆز بوو بۆ سەرانی بەنی ئومەییەو گوێڕایەڵی ئەوانی بە دین وئیمان ئەزانی، سەرکردەیەکی ئازاو چاونەترس بوو، حەزی لە شیعرو ئەدەب دەکرد، ڕێزی لە قورئان و ئەهلی قورئان زۆر دەگرت و خەڵاتی دەکردن، خۆیشی پێش ئەوەی بەرپرسیاریتی وەرگرێت مامۆستای فێرکردنی قورئان بوو.

حەججاج یەکێکە لە ناودارترین سەرکردە مێژووییەکانی ئیسلام و زۆر قسەو باسی جۆراوجۆری لێ دەگێڕنەوە کە ڕاست و ناڕاستی پێویستی بە جیاکردنەوەیە و، وا دەردەکەوێت ئەم ناوداره مافی خۆی لە لێکۆڵینەوەو توێژینەوە وەرنەگرتووە و زۆر هەواڵی لێ دەگێڕنەوە جێگیر نەبووە لە ڕووی بەڵگەوە.

حەججاج بە کەسێکی ستەمکارو بێ بەزەیی ناسرا بوو، لەوانەشە ئەو بارودۆخەی ئەو لەو سەردەمە تێیدا گەشەی کرد، هۆکارێك بێت بۆ ئەو توندی وتیژییەی کە هەیبوو، چونکە لەو دەمە شۆڕشەکانی خەواریج و ئاژاوەکانی ناو عێراق و شوێنەکانی تر بە تایبەتی شۆڕشی (عبدالرحمن بن الأشعث) کە زۆری نەمابوو دەسەڵاتی ئومەوییەکان لەناو بدات، سەرباری هەموو ئەو دۆخە ناهەموارانەی تری وڵات هۆکار بووبن بۆ شێوازی مامەڵەی توندی حەججاج لە گەڵ نەیاراندا.

یەکێك لەو تۆمەتانەی کە دەدرێتە پاڵی ئەوەیە (ناصبي) بووە، واتە ڕقی لە عەلی و ئالوبەیت بووە لە بەرژەوەندی مەڕوانییەکاندا، زۆر قسەشی لێ دەگێڕنەوە کە بەڕواڵەت کوفر بووە، هەر بۆیە هەندێك لە زانایانی سەردەمی خۆی ئەویان تەکفیر کردووە،

زێدەڕەوی زۆری لە کوشتن و خوێن ڕشتندا دەکرد، (الذهبي) لە سیرأعلام النبلاء (٤/٣٤٣) دەربارەی فەرموویەتی: (**وَكَانَ ظَلُوْماً ، جَبَّاراً ، نَاصِبِيّاً ، خَبِيْثاً ، سَفَّاكاً لِلدِّمَاءِ ، وَكَانَ ذَا شَجَاعَةٍ ، وَ إِقْدَامٍ ، وَمَكْرٍ، وَدَهَاءٍ ، وَفَصَاحَةٍ ، وَبَلاَغَةٍ ، وَتعَظِيْمٍ لِلْقُرَآنِ ... وَلَهُ حَسَنَاتٌ مَغْمُوْرَةٌ فِي بَحْرِ ذُنُوْبِهِ ، وَأَمْرُهُ إِلَى اللهِ ، وَلَهُ تَوْحِيْدٌ فِي الجُمْلَةِ ، وَنُظَرَاءُ مِنْ ظَلَمَةِ الجَبَابِرَةِ وَالأُمَرَاءِ**)

بەڵام بۆچوونی پەسەند لەلای زانایان ڕاوەستانە لە مەسەلەی تەکفیر کردنیدا، لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی بە ڕوون و ئاشکرا چووە ئیسلامەوە بە هەمان شێوە بە بەڵگەی ڕوون وئاشکرا و بێ مشت و مڕ نەبێت لێی ناچێتە دەرەوە، ئەمە جگە لەوەی کە زۆرێك لەو هەواڵانەی دەربارەی خراپەو ستەمەکانی حەججاج پێمان گەیشتوون لە ڕێگەی کەسانێکەوە پیمان گەیشتوون کە جێگای متمانە نین و سۆزیان بۆ شیعەکان بووە وەکو المسعودي و الواقدی.

یەکێکی تر لە کارە خراپەکانی حەججاج ئابڵۆقەدانی بوو بۆ عەبدوڵڵای کوری زوبەیر (ڕەزای خوایان لێبێت) لە مەککەو دواتر کوژرانی ئەو هاوەڵە و هەڵواسینی تەرمەکەی لە لایەن هێزەکانی حەججاجەوە بە فەرمانی (عبد الملك بن مروان). لە (صحيح مسلم) داهاتووە کە (عبد الله بن عمر) ڕەزای خوای لێبێت: بە لای تەرمە هەڵواسراوەکەی (عبد الله بن الزبير)دا تێپەڕی وسێ جار وتی سەلامی خوات لێبێت ئەی باوکی خوبەیب، من لەم دەرەنجامە وریاییم بە تۆ دابوو، پاش ئەوەی شایەتی عیبادەت و خوا ناسینی بۆ دا ئینجا فەرمووی: (**أما والله لأمة أنت أشرها لأمة خير**) واتە: سوێند بە خوا ئوممەتیك تۆ خراپترینیان بێت ئوممەتیکی پڕ لەخێر و چاکەیە!

ئینجا حەججاج تەرمەکەی داگرت و خستیە ناو گۆڕستانی جولەکەکانەوە وناردی بە شوێن ئەسمائی کچی ئەبوبەکری دایکی عەبدوڵڵا ( ڕەزای خوایان لێبێت ) تەرمی کوڕەکەی بباتەوە، جا (أسماء) پێی فەرموو: گوێم لە پێغەمبەر بووە (ﷺ) فەرموویەتی: (أن في ثقيف كذابا ومبيرا) واتە: هۆزی سەقیف دوو کەسی لێ دەردەکەوێت یەکێکیان درۆزنەو ئەوی تریان خراپەکارو لەناوبەرە، یەکەممان ناسی کە موختار بوو، دووەمیشیان تۆی.

لە ڕاستیدا حەججاج تۆمەتبارە بە کوشتنی ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵ و زانا و موسوڵمانی یەکخواپەرست، زێدەڕەوی زۆری لە خوێن ڕشتندا دەکرد و، بەڵام دەیوت کەسم نەکوشتووە بە بێ ئەوەی بەڵگەم بۆ خۆم لای خوا نەهێنابیتەوە، ئیتر ئەگەر سەرجەم ئەو تاوانانەشی لەسەر جێگیر نەبووبن، بێگومان بەشێکی زۆری لەسەر جێگیر بووە، بۆیە کێشەی ئەو سەرکردە لەوە گەورەترە کە کەسێك باسی ئەوەی بکات کە نوێژی دەکرد وڕۆژووی دەگرت و بە زۆری قورئانی دەخوێند و وەکو سەرکردەیەك لەسوپای ئیسلامدا جیهادی دەکرد، هەر بۆیە لەسەر بنەمای ئەو تاوانە گەورانەی کە ئەنجامی داوە و دەربڕینی هەندێ وشەو هەڵوێست کە بەڕواڵەت مایەی تەکفیرکردنی بوونە هەندی زانای بە ناوبانگی وەکو: (سعيد بن جبير والنخعي ومجاهد وعاصم بن أبي النجود والشعبي) ئەویان تەکفیر کردووە و لەسەر بنەمای پێنج بەڵگە کە پێی دەوترێت (مناط التكفير) ئەویان بە کافر زانیوەو ئێرە جێگەی باسکردنی ئەو (مناط )انە نییە.

لە زانا هاوچەرخەکانیش پرسیار لە شیخ (محمد ناصرالدين الألباني) کرا ڕەحمەتی خوای لێبێت:

ئایا حجاج کافرە؟ فەرمووی: (**نحن نشهد أن الحجاج فاجروظالم، لكننا لا نعلم منه أنه أنكر ما هو معلوم من الدين بالضرورة، فلا يجوز تكفيره بمجرد أنه فجر، وظلم، وقتل الأبرياء من المسلمين**).واتە: ئێمە شایەتی زاڵمی و خراپەکاری بۆ دەدەین بەڵام نەمانزانیوە کە شتێکی کردبێت لە ئیسلام دەریکربێت..هەندی لە زانایانیش وەکو (الذهبي) سەرەرای زەم کردنیان بۆ حەجاج فەرموویانە یەکخواپەرستی هەبووە.

کێشەی حجاج کێشەی فیکر و تێگەیشتن بوو، خوێندنەوەیەکی سیاسی و گوێڕایەڵییەکی کوێرانەی بۆ بەنی ئومەییە هەبوو،هەروەها لە خوێندنەوەی ژیانی بە وردی ئەوە دەردەکەوێت بە ئاسانی تەکفیری نەیارەکانی بەنی ئومەییەی کردووە و لە سەر ئەو بنەما لە ناوی بردوون،ئەگینا ئەو هەمیشە بەوە ناسراوە کە خاوەن عیبادەت و قورئان خوێندن و تەنانەت خۆی و باوکیشی مامۆستای فێرکردنی قورئان بوونەو شایەتی داوێن پاکی و دووربوون لە مەی خواردن و کاری خراپەو خۆشنەویستنی پارەو زۆر سیفەتی باشی تری بۆ دراوە، ئەوەی لە زۆروستەم و کوشتن ئەنجامی دەدا بە دینداری دەزانی و تەنانەت ناوی خۆی نابوو: (مبير المنافقين) واتە: لەناوبەری دوو ڕووەکان.

بێگومان ئێمە لێرە تەنها مەبەستمان ناساندنێکی ئەو سەرکردەیە بە خێرایی، ئەگینا باسەکانی ئەو کاتێك فەرمانڕەوای عێراق بووە، یان سەرکوتکردنی بۆ شۆڕشەکانی خەواریج و شۆڕشی (عبدالرحمن بن الأشعث) ئەوانە هەمووی - بەدەر لەوەی چەندی جێگیرەو چەندی هەڵبەستراوە بۆی - نووسین و وردەکاری زۆری ئەوێت.

سەبارەت بە کوژرانی (سعید بن جبیر) لەسەر دەستی حەججاج کە ئەوە یەکێکە لە گەورەترین تاوانەکانی ئەو، بە پێی هەندێك سەرچاوەو لێکۆڵینەوە کە لەو بارەوە خوێندوومەتەوە وەکو: ( الحجاج بن یوسف الثقفي المفتری علیه) و توێژینەوەیەکی تریش بە ناونیشانێکی نزیك لەو ناونیشانە، وا دەردەکەوێت کە هەندێك وردەکاری و بەسەرهاتی پێش ڕوودانی ئەو تاوانە هەبووە، ڕاستە نابێتە پاساو بۆ حەججاج لەسەر کوشتنی یەکێك لەسەرانی تابیعین وەکو سەعید (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ، بەڵام هەندێ تیشك دەخاتە سەر مەسەلەکە و ڕوداوەکە دەخاتە چوارچێوەیەکی ناچاری سەربازی و سیاسی کە ئەوان سەعیدیان وەکو کەسێکی یاخی و هاوکار لەگەڵ دوژمنانی دەوڵەتی خیلافەت ژماردووەو هەروەها ئەویان بە هەڵوەشاندنەوەی بەیعەت تۆمەتبار کردووەو دووبارە بەیعەتدانی بە عەبدوڕەحمانی کوری ئەشعەس، هەروەها ئەوەشم بۆ دەرکەوت زۆر شت بۆ ئەو ڕوداوە زیاد کراوەو هەندێکی مێژوو نووسی بەناوبانگ ( ابن کثیر ) و غەیری ئەویش ڕەتیان کردووەتەوە.

حەججاج بە کوشتنی (سعید بن جبیرو عبد الله بن الزبیر) و زۆرێکی تر، بە توندو تیژی و ڕق لێبوونی لە دوژمنانی بەنی ئومەییە وەکو عەلی وبنەماڵەکەی (ڕەزای خوایان لێبێت)، بە جێهێشتنی کۆمەڵێکی زۆر لە یادەوەرەی تاڵ و ناخۆش لە پاش خۆی، هەروەها بە زەبروزەنگێکی بێ وێنە کە لەگەل خەڵکی عێراق بەکاری هێناو ، بە سنوور بەزاندنی مامەڵەکردن لە گەڵ زۆرێك لە هاوەڵان وەکو: (ئەنەسی کوڕی مالیك و عەبدوڵڵای کوری عومەر و ئەسمائی کچی ئەبو بەکر) رەزای خوا لە هەموویان بێت،

هەروەها بەو ناوبانگە خراپەی کە بۆ ئومەوییەکانی بە جێ هێشت وەکو سەرکردەیەکی ستەمکاری خوێن ڕێژ،هەموانی کرد بە دوژمن و ناحەزی خۆی، تەنانەت خودی ئومەوییەکانیش، بەو شێوەش سەرەڕای هەموو چاکەکانی کە لە دەریای خراپەکانیدا نوقم بوون، بوو بە کەسایەتییەکی بێزراوو نەویستراو لە مێژوودا.

بەڵام سەرەڕای هەموو شتێك شایانی باسە بوترێت، حەجاج لە کۆتاییدا مرۆڤێك بووە و فریشتەیەك نەبووە لە ئاسمان هاتبێتە خوارەوە هەڵە نەکات، تەنها باسی خراپەکانی دەکرێت و بۆشی زیاد دەکرێت و کەس بەلای چاکەکانیدا ناڕوات کە ئەوەش لە ڕووی ئینسافەوە نادرووستە، بۆ نموونە:

-بەردەوام خەریکی فتوحات بووەو سەرکردەیەکی دڵسۆز بووە بۆ سوپای ئیسلامی و چەندین سەرکەوتنی گەورەی بە دەست هێناوە لەو بارەوە.

-یەکەم کەس بوو کە دراوێکی ئیسلامی درووست بکات و لەسەری نووسی: **(لا إله الا الله محمد رسول الله)**

-یەکەم کەس بوو دوای هاوەڵان شارێکی درووست کرد کە شاری (واسط ) بوو.

-لە هیندستانەوە ئافرەتێك ستەم و دەست درێژی کرابووە سەر هاواری پێکرد( وا حجاجاه) ئەویش حەوت ملیۆن دەرهەمی خەرج کرد و توانی ئەو ئافرەتە لەوێ ڕزگار بکات.

-یەکەم کەس بوو کە خزمەتگوزاری زۆری لەبەرژەوەندی خەڵکی ئەنجام دا؛ وەکو درووستکردنی پرد و هەڵکەندنی بیر و داهێنانی درووستکردنی تانکی گەورە بۆ هەڵگرتنی ئاو بۆ کاتی پیویست بۆ خەڵکی وقەدەغەکردنی پیسایی کردن و میز کردن لە هیچ شوینێکی گشتیدا.

-فەرمانی کرد بە کوشتن و لەناوبردنی هەموو سەگێکی هار کە دەبیتە مایەی بلاوبوونەوەی نەخۆشی.

-گرنگی دەدا بە کشتوکاڵ و پارەی قەرز و ئاژەڵ و ئامرازی کشتوکاڵی بۆ خەڵکی دابین ئەکرد.

-هەروەها یەکەم کەس بوو کە فەرمانی کرد نوقتە بۆ قورئانی پیرۆز دابنرێتبەوەش خزمەتێکی گەورەی کرد کە موسولمانان تاکو ئێستە سوودی لێ ئەبینن، چونکە تا سەردەمی ئەو وشەکان نوقتەیان لەسەر و ژێر نەبوو و، هاوکات خەڵکی وابەستەی یەك شێواز خویندنی قورئانی پیرۆز کرد لە ناو قیرائاتەکاندا.

کۆتا وێستگەشمان لەگەڵ حەجاج دا ئەوەیە کە لەگەڵ خەڵکی عێراقدا بە تایبەت ئەو پەڕی توندوتیژی بە کارهێناوەو، بەشێوەیەك لێی کوشتوون وسزای داون و ترساندوونی، هەندیك پێیان وایە ئەو ترسە تاکو ئێستەش لە دەروون و کەسایەتی نەوەکانیادا ماوەو، هاوکاتئەو قەناعەتەش درووست بووە، لە لای هەندیك لە توێژەران کە خەڵکی عێراق ڕێگای ڕاست ناگرن بە دەسەڵاتدارانی وەکو حەجاج نەبێت کە بە ئاگر و ئاسن مامەڵەیان لەگەڵ بکات، لە یەکەم خوتبەی هەینیدا لە کوفە ئەو کاتەی بوو بە والی،

دەموچاوی هەڵپێکا بۆ ئەوەی نەناسرێت وخۆی بە کزو لاواز نیشاندا تا بزانێت ئەوان چۆن لەگەڵ والی تازە مامەڵە دەکەن، ئەوانیش تاکو توانیان گاڵتەو سوکایەتیان پێکرد و تەنانەت ناوکە خورمایان تێدەگرت، ئەویش لە ناکاو ڕوخساری خۆی دەرخست و هەڕەشەی توندی لێکردن و وتی سەرەکانتان وەکو میوە دێتە پێش چاوم کە پیگەیشتووەو کاتی برینە و لێکردنەوەی هاتووە: **(أما و الله فإني لأحمل الشر بثقله و أحذوه بنعله و أجزيه بمثله، والله يا أهل العراق إني لأرى رؤوساً قد أينعت وحان قطافها، و إني لصاحبها، والله لكأني أنظر إلى الدماء بين العمائم واللحى .**

(الحجاج بن يوسف الثقفي) نزیکەی پەنجاو شەش ساڵ تەمەنی کرد و لە کۆتایی ژیانیدا تووشی نەخۆشییەك بوو نزیك لە نەخۆشی شێرپەنجەی گەدە و بە هۆیەوە لە ساڵی ٩٥ی کۆچی دوای تەمەنێکی لێوان لێو لە ستەم و تۆقاندن وخزمەتی ناوازەومێژوویی بۆ ئومەوییەکان وزیدەڕەوی لە بەکارهێنانی دەسەڵاتدا،هەرلەو ساڵەدا کە (سەعیدی کوری جوبەیر)ی کوشت دونیای بە جێهێشت ، شایانی باسە و مایەی سەرسوڕمانە کە حەججاج هەرگیز وەکو تاوانبارێك کە دەستی لە کوشتنی هاوەڵ و تابیعی و موسوڵماناندا هەبوو مامەڵەی نەدەکرد، بەڵکو زۆر باسی لێخۆشبوونی خوای گەورەی دەکرد و چاوەڕوانی لێبوردەیی و میهرەبانی پەروەردگاری بوو، لەسەرەمەرگیشیدا دەیوت: «**اللهم اغفرلي فإنهم زعموا أنك لا تفعل**» واتە: خوایە لێم خۆشبە ئەوانە ئەڵێن گوایە تۆ لێم خۆش نابیت!

هەندێ لە توێژەران پێیان وایە مردنی حەجاج سەرەتای ڕووکانەوەی دەوڵەتی ئومەوییەکان بوو، چونکە دوای ئەو سەرکردەیەکی دڵسۆزو بە زەبری وەکو حەجاج ئیتر هەڵنەکەوت لە دەوڵەتەکەیانداو بە مردنی ئەو لاوازی ڕووی تێکردن.

-بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێیتەوە بۆ هەر سەرچاوەیەکی مێژوویی هەواڵی زۆری دەربارەی حجاج تیایە، بە تایبەتی (البداية والنهاية و سير أعلام النبلاء)...هەروەها پێم باشە هەرکێ دەیەویت بگاتە هەندێ حەقیقەتی نەزانراو دەربارەی (الحجاج ) و، بە بەڵگەوە ڕووداوەکان بزانێت، بگەڕیتەوە بۆ کتێبی (الحجاج بن يوسف الثقفي المفترى عليه): کە لە بنچینەدا ئوتروحەیەکی دوکتۆرایە لە نووسینی محمود زیادة.

**لە ناکاو ڕوخساری خۆی دەرخست و هەڕەشەی توندی لێکردن و وتی سەرەکانتان وەکو میوە دێتە پێش چاوم کە پێگەیشتووەو کاتی بڕین و لێکردنەوەی هاتووە.**

# ( جهيمان العتيبي )



ناوی (جهيمان بن محمد بن سيف العتيبي) هـ، لە ١٦ ی سبتمبر ساڵی ١٩٣٦ بەرانبەر ١ ی رجب ساڵی ( ١٣٥٥) کۆچی لە دایکبووە، بۆ ماوەی هەژدە ساڵ لە دامزراوەی

(الحرس الوطني) لە سعودیە فەرمانبەر بووە و بە دیاری کراویش شۆفێری تەنکەری ئاو بووە، ئەوەی کە باس ئەکرێت سەبارەت بە خوێندنی جوهەیمان ئەوەیە تاکو چواری سەرەتایی خویندووە، بەڵام دواتر لە قۆناغێکی تری تەمەنیدا درێژەی بە خوێندن داوە لە دەزگایەکی زانستی سەر بە ( الجامعة الاسلامية) لە شاری مەدینە، ئەگەرچی بەهۆی ناڕازیبوونی لەو مەنهەجانەی دەوترانەوە خوێندنی تەواو نەکردووەو هیچ بڕوانامەیەکی بەدەست نەهێناوە، لەوێ لەگەڵ کەسێکدا بە ناوی (محمد بن عبد الله القحطاني) کە یەکێك بوو لە قوتابیەکانی شێخ (عبد الله بن عبد العزيز بن باز) دەبێتە هاوڕێ و بە هۆی نزیکبوونیان لە یەکتر لە ڕووی فیکر و بیروباوەڕەوە،

پەیوەندییەکی تۆکمە لە نێوانیاندا دروووست دەبێت و قەحتانی خوشکێکی خۆی لە جوهەیمان مارە دەکات وهاوڕێتیەکەشیان دەبێتە سەرەتای وەرچەرخانێکی گەورە لە ژیانی هەردوکیاندا.

شایانی باسە باوکی جوهەیمان لە گەڵ کومەڵی ( إخوان من أطاع الله) وهۆزەکاندا بەشداری چەندین جەنگ و غەزای کردبوو لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا، لەوانە جەنگی (سبلة) کە لە دژی شا (عبدالعزیز ال سعود) پێی هەڵسابوون و لەو جەنگەدا هەرچەند دەڵێن کورژراوە بەڵام ڕاست ئەوەیە کە نەکوژراوەو جوهەیمانیش زۆر جار وەکو دەڵێن: شانازی بەو جەنگانەی باوکییەوە دەکرد.

-جوهەیمان کەسێکی دڵسۆز بوو بۆ بانگەوازەکەی ،خاوەن کەسایەتییەکی خۆشەویست بوو لەلای خەڵکی، باوەڕی تەواوی بەو بنەماو بنچینانەی خۆی هەبوو لە بیروباوەڕدا کە بانگەشەی بۆ دەکرد، بەردەوام لە ڕێگەی نووسین و وانە و گەڕان بە دەڤەرەکاندا بۆ بانگەواز وفەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە و بڵاوکردنەوەی نامیلکە خەریك بوو هۆشیاری بە خەڵکی دەدا، بە بێ ترس ڕەخنەکانی ئاڕاستەی حکومەتی سعودیەش دەکرد، بەڵام حکومەتی سعودیەی تەکفیر نەدەکرد.

-جوهەیمان لە سەرەتای شەستەکانەوە کۆمەڵەیەکی دروووست کرد بە ناوی (الجماعة السلفية) و یەکەم بنکەشیان ماڵێك بوو لە شاری مەدینە بە کرێ گرتیان، ویەکەم کەس لە زانایان پەیوەندییان لە گەڵ (ابن باز) پەیدا کرد. کە ئەو کاتە ئەو جێگری سەرۆك زانکۆی (الجامعة الاسلامية) بوو لە مەدینە و داوایان لێ کرد ئامۆژگاریان بکات و مامۆستا و ڕێپیشاندەریان بێت لە کارەکانیان،

بۆیە (ابن باز) سەردانی دەکردن و لەوێ هەندێ جار موحازەرەی پێشکەش دەکرد و کرێی ماڵەکەشی جاروبار بۆ دابین دەکردن، بەڵام شایانی باسە کۆمەڵەکەیان وەکو حیزب و کۆبوونەوەیەکی سیاسی نەبوو، چونکە جوهەیمان باوەڕی بەو جۆرە کۆبوونەوانە نەبوو، بەڵکو تەنها بۆ بانگەواز و گرنگیدان بوو بە یەکخوا پەرستی و دژایەتی بیدعەو هەر کارێکی ناشەرعی لە ناو خەڵکیدا، هەموو ئەوانەش لەو کۆمەڵەدا بوون بەبێ بەرانبەر کاریان دەکرد و زۆر جار بە یارمەتی ئەندامان و هەندی لەو زانایانەی سەردانیان دەکردن، یان لە ڕێگەی فرۆشتنی ماڵ و کێڵگەکانی خۆیان خەرجی ئیشەکانیان دابین دەکرد.

-پێش درووستبوونی ئەو کۆمەڵەی جوهەیمان ( الجماعة السلفية المحتسبة) هەندێ ئاژاوە لە شاری مەدینە درووستبوو بوو بە هۆی ئەو گەنجانەوە کە بە دارو تێلا کەوتبوونە شکاندنی ئەو پەیکەرانەی دوکاندارەکان لەبەردەم دوکانەکانیاندا لە مەدینە دایاننابوو، بۆ نمایش کردنی جلی ئافرەت و ئەو ئەوەیان بە حەرام دەزانی و بە زۆر پێیان لادەبردن، یان دەیان شکاند، ئەمەو چەند ڕووداویکی هاوشێوەی تر کاردانەوەو کەش و هەوایەکی گرژی لە شار درووست کردبوو.

-هەر لەو ساڵانەدا لە نێوان ١٩٦٠ بۆ ١٩٦٤ شێخ (محمد ناصرالدين الالباني) ش لە زانکۆی ( الجامعة الاسلامية ) لە شاری مەدینە گرێبەستێکی کردبوو پەیوەندیشی لەگەڵ جوهەیمان هەبوو، بەڵکو کاریگەریشی لەسەر خۆی و هاوەڵەکانی هەبوو کە ئەوان بە شێوەیەکی زۆر گرنگییان بە فەرموودەو وردبوونەوە لە زنجیرەی سەنەد و عیلەل و قەلاچۆکردنی بیدعە دەدا. جگە لە ئەڵبانی بە هەمان شێوە شێخ ( مقبل هادي الوادعي) پەیوەندییەکی تۆکمەی لە گەڵ ئەوان هەبوو،

وەکو خۆیشی دەڵێت: مامۆستا و موفقی ئەوان بوو، بەڵام دواتر لە کتێبی (المخرج من الفتنه) ڕەخنەی لە داگیرکردنیان بۆ حەرەم گرت و هاوکات ڕەخنەشی لە شێوازی مامەڵەی ڕژێمی سعودیە بەرانبەر ئەوان گرت.

-ئەو کۆمەڵەی جوهەیمان درووستی کرد لە سەرەتا تەنها شەش کەس بوون خۆی و (سليمان الشتيوي ، سعد التميمي ، ناصر بن حسين) کەسێکی تریش کە یەمەنی بوو هەر زوو وەفاتی کرد و ئەندامێکی تریشیان دواتر بە تۆمەتی ڕاکێشانی ئەو کۆمەڵە و گۆڕینی ئاڕاستەیان بەرەو کۆمەڵەی ( الاخوان المسلمين) ی میسر لە جەماعەتەکە دوور خرایەوەو فەسڵ کرا، ئەم شەش کەسە سەردانی (ابن باز) یان کرد و نیازی خۆیان بۆ خستە ڕوو کە دەیانەوێت بانگەواز بکەن و دژایەتی بیدعە بکەن و لە کەسیش چاوەڕوانی هیچ چاکەو پاداشتێک نین لە خوای گەورە نەبێت، بۆیە (ابن باز) وێڕای ڕازی بوونی لەسەر پیکهینانی کۆمەڵەکەیان پێشنیاریشی کرد ناوەکە لە ( الجماعة السلفية) وە بگۆڕن بۆ (الجماعة السلفية المحتسبة) و ئەوانیش گوێڕایەڵییان بۆ ئەو پێشنیارە نیشاندا و ناوە کەیان گۆڕی، لە دوای ئەوەش هەرچی بڵاوکراوەکانیان هەیە چاپیان نەدەکرد تاکو ابن باز سەرەتا نەبینینێت و هەرتێبینییەکیشی هەبوایە دەیانخستە سەر بڵاوکراوەکە.

-جوهەیمان و جەماعەتەکەی لە زۆرێك لە بیروباوەڕەکانیاندا لە زانایانی سعودیە جیاواز نەبوون، بە تایبەتی لە پرسەکانی عەقیدە وەکو یەکخوا پەرستی و ئیمان و دژایەتی بیدعە و بیدعەکاران و زۆر شتی تر، بۆیە زانایان ئامادەی کۆڕو وانەو کۆبوونەوەکانیان دەبوون وەکو (ابن باز و أبو بكر الجزائري) و زۆر زانای تر، بەڵام لە دوو مەسەلەدا لە زانایانی سعودیە جیا دەبوونەوە:

**یەکەم**: لە مەسەلەی پشتگیری کردنیان بۆ ڕژێمی سعودیە و فەرمان نەکردیان بە چاکەو نەهی نەکردنیان لە خراپەکانی ڕژێم.

**دووەم**: سەبارەت بە مەسەلەی دەرکەوتنی فیتنە و نیشانەکانی قیامەت و بە تایبەتیش دەرکەوتنی مەهدی جوهەیمان و کۆمەڵەکەی پێیان وابوو نیشانەکانی قیامەت نزیك بوونەتەوە و مەهدی کاتی دەرکەوتنی هاتووە.

-جوهەیمان و کۆمەڵەکەی زۆر بە ئازایی و بوێرانە (أمر بالمعروف و نهي عن المنكر) یان ئەنجام دەدا، تەنانەت وینەکانی پادشای سعودیەیان لەسەر دراوی ڕیال دەسڕییەوەو دەیانشێوان و ئەو مەسەلە لەو کاتە بوو بووە باسی خەڵکی و دوو ڕاو بۆچوونیان لە ناو خەڵکیدا درووست کردبوو کە هەندێك لە زانایان دەیان وت هەبوونی ئەو وینە لەسەر دراوەکان ئاساییە ودروستە، چونکە (تعظیم) ناکرێت، بەڵام لە ناو خەڵکیدا بۆچوونیکی تری پێچەوانەش هەبوو.

-هاوکات جوهەیمان وجەماعەتەکەی هەندێ جار تیگەیشتنی نامۆیان بۆ ئیسلام هەبوو، کە لەگەڵ زانایان ولە گەڵ تێگەیشتنی خەڵکیشدا نەدەگونجان، بە ڕواڵەتی فەرموودەکان کاریان دەکرد و بایەخی زۆریان بۆ هیچ قسەیەک دانەدەنا، ئەگەر بە روونی بەڵگەی کتاب و سوننەتی لەسەر نەبوایە، تەنانەت وەکو دەگێڕنەوە خودی جوهەیمان لە کتیبخانەکەی خۆیدا جگە لە ( المحلى) ی ابن حزم کتێبی تری فیقهی نەبووە، چونکە باوەری تەواویان بە فەرموودەکان هەبوو وەکو خۆی جێبەجی بکرێت، لەوانە زۆر جار ئەبینران بە پێ خاوسی ڕێیان دەکرد وەکو جێبەجێکردنی سوننەت،

لە ناو مزگەوتەکانیشدا دەبینران بەسەر فەرشەکانەوە بە نەعل نویژیان دەکرد بۆ هەمان مەبەست، بەشداری وانەی زانایانیان دەکرد و داوای بەڵگەی قورئان و سوننەتیان لە هەموو قسەکانیان دەکرد، هەر بیدعەیەکیان ببینیایە نکۆڵییان لێ دەکرد و بە دەست دەیانگۆری، یان بە بێ ترس و شەرم دەیانوت ئەوە بیدعەیە.

-لە لایەکی تریشەوە رۆژ لە رۆژ دەسەڵاتدارانی سعودیە زیاتر بەوان قەڵس و بێزار دەبوون و هەواڵیان پێدەگەشت کە جوهەیمان و کۆمەڵەکەی خەریکە دەبنە سەرچاوەیەکی پشێوی بۆ رژێم و لە بیروڕای خەڵکیدا گۆڕانکاری جەوهەری درووست دەکەن، تەنانەت جارێکیان - وەکو شێخ مقبل لە کتیبی المخرج من الفتنة دەڵێت - هەندێکی لە زانایان تۆمەتبار کرد بەوەی زانیارییان دەربارەیان داوەتە دەسەڵات وسیخوڕیان بەسەریانەوە کردووە، کە لەو تۆمەتەدا مەبەستیان (أبو بكر الجزائري) بوو، دواتریش لە پاش دانیشتنێکی نێوان أبو بكر الجزائري و جهیمان لە سەربانی ئەو ماڵەی لە مەدینە کردبوویانە بنکە گرژی لە نێوانیاندا درووست بوو و پەیوەندییان پچڕا لە دوای ئەو دانیشتنەوە کە بە (حادثة السطح) ناسرا.

-لەو کاتەوە لەسەرەتاو ناوەڕاستی شەستەکانەوە تاکو سەرەتای حەفتاکان جوهەیمان بە چەند گۆڕانکارییەکی بیروبۆچووندا تێپەڕی و ناکۆکی کەوتە نێوان خۆی و هەندی لە ئەندامانی دامەزرێنەری کۆمەڵەکەی، لە ساڵی ١٩٧٣ لە وەزیفەی حکومەت دەستی کێشایەوە چونکە ئەو پێی وابوو خۆی و هاوەڵانی لە وەزیفەی حکومەت نەبن باشترە بۆ ئەوەی بتوانن قسەی حەق بکەن و ئەو مووچەی کە لە دەسەڵات وەریدەگرن ،

ڕێگرە لە وتنی حەق و کۆمەڵە ناکۆکییەکی تریش کەوتە نێوانیان، بەڵام بەهەر حاڵ جوهەیمان هەر بەردەوام بوو لە بانگەواز و وانە وتنەوە لە مزگەوتەکانی مەدینە و دەشتەکانی دەوروبەری و تەعبیر کردنی خەو ( کە گرنگییەکی زۆریان بە مەسەلەی خەو دەدا) و، نووسینی نامیلکە و دوا جار تا ڕادەیەك جۆرێك لە ڕۆچوونی پیوە بەدی کرا لە مەسەلەی نیشانەکانی قیامەت و فەرموودەکانی فیتنەو دەرکەوتنی مەهدی بە شیوەیەکی تایبەت.

-دەگێڕنەوە کە جوهەیمان خۆی لە وانە وتنەوە لە مزگەوتە گەورەکانی شارەکان بە دوور دەگرت و زیاتر لە مزگەوتە بچوکەکانی ناو مەدینە و ناوچەکانی بیابانی دەوروبەری مەدینە باسی ئیسلامی دە کرد و ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد, بۆ هۆکاری ئەوەش هەندێ لە هاوڕێکانی جوهەیمان پاش جیابوونەوەیان لە ئەو دەیانوت بە هۆی ئەوە بووە دەشتەکی قسەی کردووە و لە دەربڕینی عەرەبی جوان و ڕاستو درووست شارەزا نەبووە چونکە لە دەشتی (ساجر) پەروەردە بوو بوو.

-جەماعەتەکەی جوهەیمان لە زیادبووندا بوون و شوێنکەوتوانیان لە هەموو شارەکانی سعودیە وەکو (مكة و رياض و حائل والقصيم و دمام) زیادیان دەکرد و، بەڵکو پەل و پۆیان بۆ دەرەوەی سعودیەش دەهاوێشت وەکو وڵاتی کوەیت،

کە زۆریك لە بڵاوکراوەکانیان لەوێ چاپ دەکرا و دواتر لە سعودیە دابەش دەکران، جوهەیمان خۆیشی بە قاچاغ و نهێنی سەردانی کوەیتی دەکرد.

-مامەڵەی هەندێ لە شوێنکەوتوانی جوهەیمان زانایان و خەڵکی تورە دەکرد و سکاڵایان لێ دەکرا و لە حەفتاکان کاتێك ژمارەیان زیادی کرد زیاتر بوونە جێگەی بایەخ بە تایبەتی دوای ئەوەی هەندێك لەو گەنجانە بە نەعلەوە لە مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژیان دەکرد و وشەی (الصلاه خير من النوم) یان لە بانگی یەکەمی بەیانیان دەوت و بەڵکو کار گەیشتە ئەوەی وێنەکانی شا (خالد بن عبد العزيز) یان لەسەر دراوی ڕیاڵ دەسڕییەوە یان دەیانشێواند، بەڵکو جوهەیمان بە هۆی ئەو ناشەرعییانەی لە ڕاگەیاندنی سعودیە دەیبینی وەکو دەرکەوتنی ئافرەت و هەندی ڕەخنەی تر کە لە دەسەڵات هەیبوو، بەیعەتیشی بە شەرعی نەدەزانی بۆ ئەو دەسەڵاتە بێ ئەوەی تەکفیریان بکات،بەڵام لە نێو ڕیزی کۆمەڵەکەی کەسانی کاریگری تێدا بوو وەکو ( فيصل اليامي) کە بە هۆی گرنگیدانی زۆری بە زانست بە (ابن تيمية الصغير) دەناسرا، ئاراستەی بەرەو تەکفیر کردنی ڕژێمی سعودیە بوو، بۆیە لە ساڵی ١٩٧٧ لە کاتی هاتنی شێخ ئەلبانی بۆ حەج ئەوان لەسەر باسی تەکفیرکردنی دەسەڵاتداران دانشتنیکی سێ قۆڵییان ئەنجامدا، بەڵام جوهەیمان لە کۆتایی دانیشتنەکە ئەو کاسێتەی دەنگەکانی لەسەر تۆمار کرابوو لە ناویدا و ترسی ئەوەی بوو ئاراستەو بۆچوونی فەیسەڵی هاوڕێی لە ناو ڕیزەکانی جەماعەتەکەی تەشەنە بکات.

-ئەوانەی جوهەیمانیان بینیوەو ناسیویانە بە کەسایەتییەکی کاریزما وەسفیان کردووە، کۆمەڵێک ئاکار و خەسڵەتی جوانی تێدابووە کە شوێنکەوتووانی زۆر پێوەی وابەستە بوونە، لەوانە ئەو کەسێکی سادە وڕوح سووك ولێبڕاو بووە بۆ بانگەوازەکەی، دوو ئۆتۆمبێلی (بیجۆ) و (سالۆن) ی هەبووە بەردەوام لە گەشت و سەردانی ناوچەکان و بەسەرکردنەوەی ئەندامان و وانە وتنە بووە لە

شار و لە دەشت وناوچە بیابانییەکاندا، هەروەها زۆر ژیر و لێهاتوو و ئازا و بەخشندە بووە، بۆیە کەسانی نوێ بۆ پەیوەندی کردن بەو کۆمەڵەوە زۆر جار تەنها ناوبانگ و کەسایەتی جوهەیمان سەرنجی ڕادەکێشان و بە کارکردن لەگەڵ ئەو کۆمەڵە قایلی دەکردن.

-لە دەورو بەری ساڵی ١٩٧٧ – بە پێی قسەی (ناصر الحزيمي) خاوەن کتیبی ( أيام مع جهيمان) کە لەگەڵ خودی جوهەیمان بووە وزۆر لێیەوە نزیك بووەو پێش ڕووداوی حەرەم بە هۆی جیاوازی دیدو بۆچوون لێی جیا بووەتەوە ، ڕاپۆرتێکیان لەسەر نووسرا کە ئەندامانی ئەم کۆمەڵە لە شاری مەدینە و هەندێ جێگەی تر حەشارگەی چەکیان هەیە، هەر بۆیە شاڵاوێکی دەستگیر کردن لەناو جەماعەتەکەی جوهەیمان دەستی پێکرد و هەندێك لە ئەندامانی دامەزرێنەری کۆمەڵەکە دەست گیر کران و جوهەیمانیش هەڵهات، شایانی باسە یەکێك لەوانەی دەستگیر کران لەو کەیسە شێخ ( مقبل بن هادي الوادعي) بووکە دوای سێ هەفتە لە دەستگیر کردنی ئازاد کرا و لە سعودیە دەرکرا بۆ وڵاتەکەی خۆی لە یەمەن، لە پاش ئەو هەڵهاتنە جارێکی تر جوهەیمان دەرنەکەوتنەوە تاکو لە ڕووداوی داگیرکردنی حەرەمدا لەوێ بینرا.

-لە ماوەی دیارنەمانیدا جوهەیمان بە شێویەوەکی ڕاشکاوانەتر دەستی کرد بە ڕاگەیاندنی بیروباوەڕو قەناعەتەکانی کۆمەڵەکەی و هەروها بەردەوامیش بوو لە بڵاو کردنەوەی هەندێك بڵاوکراوەو نامیلکە کە هەندێکیان لە کوەیت چاپ دەکران و بە ناوی جوهەیمان خۆی یان بە ناوی خوازراو لە ناو سعودیە دابەش دەکرا، لەوانە: ( رسالة الالتباس) و (رسالة الفتن) و( الامارة والبيعة والطاعة و كشف الحكام) (الرسائل السبع) ( الرسائل الاربع والسبع)

ڕای خۆی بە ڕاشکاوی لە سەلەفییەکانی سعودیە و کۆمەڵەی ئەنساروسسوننە و ئیخوانی میسر دەربڕی و هەروەها باسی مەهدی و دەرکەوتنی نیشانە گەورەکانی قیامەتی تێدا بوو، بڵاوکراوەکان لە کوەیت چاپ دەکران و بە قاچاغ دەیانگەیاندە ناو شارەکانی سعودیە و بە هەزاران نوسخەی لە ناو حەرەم و شوێنەکانی تر لە ڕێگەی چالاکوانانی(الجماعة السلفية المحتسبة) دابەش دەکرایە سەر موسوڵمانانىدا، جارێکیش لە بازگەیەکی سنووریدا دەست بەسەر چواردە هەزار نوسخە لە یەکێك لەو بلاوکراوانەدا گیرا کە لە ناو پیکابێکدا لە ژێر بارێکی کا شاردبوویانەوە.

-بەڵام لەو کاتەدا کە دەوری دووسال پێش ڕوودانی ڕووداوی حەرەم بوو، (محمد بن عبد الله القحطاني ) باسی کەوتبووە ناو باسەکانەوەو زۆری نەبرد قەحتانی وەکو مەهدی باس دەکرا و ئەمەش بووە مایەی دابەش بوونی جەماعەتەکەی جوهەیمان بۆ دوو کۆمەڵی ناکۆك: یەکێکیان باوەری بەوە بوو قەحتانی مەهدییەو کۆمەڵێکیان باوەری پێ نەبوو. سەیریش لەودا بوو خودی قەحتانی تاکو ماوەیەك باوەڕی بەوە نەبوو کە خۆی مەهدییەو پێی دەوتن لە خوا بترسن و وام پێ مەڵێن، بەڵام جوهەیمانی هاوڕێی گیان بە گیانی و زاوای ئەوی بە مەهدی دەزانی، لەسەر ئەم باوەڕەش کۆمەڵێك لە جەماعەتەکەیان لێ جیا بوویەوە بەڵام زۆرینەیان لەسەر بۆچوونەکەی جوهەیمان بوون. لە هۆکارەکانی قەناعەتیشیان بە وەی قەحتانی مەهدییە ئەوە بوو، کەسانێکی زۆر لە سعودیە و لە وڵاتانەوە خەویان پێوە بینیبوو کە ئەو مەهدییە.

-وا دەردەکەوێت جوهەیمان و جەماعەتەکەی هەر لە سالی ١٩٧٨ هوە( واتە ساڵیك پێش ڕووداوەکە) سەرقاڵی پلان دارشتن بوونە

بۆ داگیرکردنی حەرەمی مەککە بە مەبەستی بەیعەتدان بە مەهدی لە پەنای کەعبەدا، بۆیە ماوەیەك پێش سعاتی سفر ئەوان خواردن و خورمایان لە ژێر زەمینەکانی حەرەم هەڵگرتووە و سوودیان لە سووکی ئەو ڕێوشوێنانە وەرگرتووە لە دەروازەکانی حەرەمدا بووە و نەك تەنها خواردن و ئازووقە بەڵکو چەکیشیان حەشارداوە لە جێگەی تایبەتدا لەو ژێر زەمینانەدا.

بۆ ڕۆژی دیاریکراویش چەکی پێویستیان لە ڕێگەی تابوتەکانەوە گواستبوویە ناو حەرەم گوایە ئەو تابوتانە تەرمی مردووەو بۆ نوێژ کردن لەسەریان براونەتە ناو حەرەم، هەروەها توانیان تەنکەری ئاو و هەندی سەیارەی تری خزمەتگوزاری بۆ بردنە ژوورەوەی چەك و خورما بە کاربهێنن.

-یەکێك لە سەرانی ئەو کەسانەی کە لە مەسەلەی مەهدی هاوڕا نەبوون لەگەل جوهەیمان کە (أحمد المعلم) بوو،نامەیەکی بەپەلە نووسیبوو بۆ جوهەیمان تێیدا نکۆڵی کردبوو لەوەی محمد القحطاني مەهدی بێت و بە بەڵگەی فەرموودە بۆی سەلماندبوو کە پێش هاتنی مەهدی زۆر ڕوداوی تر ڕوودەدات کە تاکو ئەو کاتە هیچ لەو ڕووداوانە ڕوویان نەدابوو، نامەکە لە ڕۆژی ڕووداوەکە بە دەستی کەسێکدا گەیشتە حەرەم بەڵام کاتی ئەوە نەمابوو بە دەستی جوهەیمان بدرێت.

-لە بەرەبەیانی یەکەم ڕۆژی ساڵی ١٤٠٠ کۆچی بەرانبەر ٢٠ ی تشرینی دووەمی سالی ١٩٧٩ کاتێك (محمد السبيّل) پێش نوێژی مزگەوتی حەرام سەلامی لە نوێژی بەیانی دایەوە، جوهەیمان و زیاتر لە ٢٠٠ لە شوێنکەوتوانی لە ناو مزگەوتەکەدا دابەش بوون و یەکسەر دەستیان بەسەر مایکرۆفۆنەکەی لای پێشنوێژەکەدا گرت و

دەستیان کرد بە خویندنەوەی بەیاننامەکەیان دەربارەی دەرکەوتنی مەهدی و خویندنەوەی فەرموودەکان بە زنجیرەی سەنەدەکانیانەوە و وتیا ئەو مەهدییە ئێستا لەگەڵمانایە و داوایان لە موسوڵمانان کرد پاش کەمیکی تر بەیعەتی پی بدەن، بەڵام هەر لە کاتی خوێندنەوەی ئەو بەیاننامە جوهەیمان مایکرۆفۆنەکەی لە (خالد اليامي) وەردەگرت و چەکدارەکانی بە ناویان بانگ دەکرد و ئاراستەی دەکردن بچنە سەر منارەکان و دەروازەکانی حەرەم دابخەن، هەروەها پێی دەوتن وەکو لە تۆمارە دەنگییەکانی خۆیدا هاتووە: تەقە لە سەربازەکان مەکەن تاکو تەقەتان لێ نەکەن.

-خەڵکی تووشی ترس و سەرسوڕمان و حاڵەتێکی شپرزەیی بوون، هەر چۆنیك بێت، پاش خوێندنەوەی بە یاننەماکە، (محمد القحطاني) ڕووی کردە ئەو جێگەی کە لە فەرموودەکاندا هاتووە مەهدی بەیعەتی پێدەدرێت لە نێوان ڕوکن و مەقامدا، لەوێ ڕاوەستا و جوهەیمان و شووینکەوتوانی و زۆرێك لەو خەڵکەش بەیعەتیان پێ دەدا، دەنگی (الله أكبر) ی زۆرێك لە خەڵکیش بەو بۆنەوە بەرز بوویەوە.

-لە سعاتی یەکەمدا جەماعەتی جوهەیمان بەتەوای دەستیان بەسەر مزگەوتی حرام و هەموو بەرزاییەکانیدا گرت، لە پێکدادانێکیشدا لە نێوان چەکدارێکی جوهەیمان و سەربازێکدا لەیەکەم ساتەکانی هەڵمەتەکەدا یەکیك لە چەکدارەکان بە گوللەی پاسەوانێك کە بەر دەرگاکە کەوت و گەرایەوە بۆ چەکدارەکەو وکوشتی.

-لەم کاتەدا محمد سبەییلی پێشنوێژی حەرەم خۆی گەیاندە ژوورەکەی خۆی و لەوێوە دەسەڵاتدارانی لە بارودۆخەکە ئاگادار کردەوەو توانی لە دەرگایەکەوە کە کۆنترۆڵ نەکرابوو خۆیّ دەرباز بکات.

-سەرەتا دەسەڵاتداران نەیاتوانی لە ترسناکی و گەورەیی ڕووداوەکە باش تێبگەن و لە ڕۆژی یەکەم جۆرێك لە حەپەسان و ڕوون نەبوونی بەرنامە و شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارەکانیان پێوە دیار بوو، بەڵام شازادە ( فهد بن عبدالعزیز) کە جێنشینی شا خالیدی برای بوو، لەو ڕۆژدا لە لوتکەی عەرەبی بوو لە تونس و بە پەلە گەڕایەوە و مەلیك خالید یش هەر لەگەڵ دەستپێکردنی روداوەکە وەزیری ناوخۆ و وەزیری بەرگری بۆ مەککە نارد و ژوورێکی عەمەلیات یان لە ئوتێلێکی مەککە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ ڕووداوەکە درووست کرد.

-چەکدارەکانی جوهەیمان دیار بوو مەشق و ڕاهێنانی پێویستیان بۆ ئەو جەنگە چاوەڕوان کراوە کردبوو، جوهەیمان یش بە شێوەیەکی مەیدانی سەرپەرشتی دۆخەکەی دەکرد، بۆیە بەو چەکە سووکانەی کە پێیان بوو، خۆڕاگری و ئازایەتییەکی زۆریان نیشاندا، هێزەکانی سوپا لە ڕۆژی یەکەم و دووەمدا تووشی شۆك بوون و سەرەڕای سوڕانەوەی فرۆکەکان بەسەر حەرەمداو هاتنی هێزێکی زۆر بۆ ئابلۆقەدانی حەرەم و بەکار هێنانی تانك و هەموو جۆرە چەکێك بۆ ئەو دۆخ و شوێنە هەستیارە بگونجێت بە کارهات،

بەڵام بۆیان دەرکەوت پرسەکە لەوە گەورەترە بە ئاسانی و بەتەنها سعودیە خۆی کۆنترۆڵ بکرێتەوە،بۆیە یەکەم جار پەنایان بۆ (الحسين بن طلال) ی شای ئەردەن برد و ئەویش هیزی هێزێکی تایبەتی لە هێزەکانی ( الصاعقة ٩١) ڕەوانە کرد بە سەرکردایەتی: (تحسين شكتم) بەڵام سەرەڕای ئەوەی هیچیان پێ نەکرا ژمارەیەکی زۆریشیان بەدەست چەکدارەکانی جوهەیمان لێ کوژرا.

-حکومەتی سعودیە زۆر مەبەستی بوو خۆی ئەو کێشەیە یەکلا بکاتەوە، بەڵام نەیتوانی وناچار بوو پەنا بۆ هەندێوڵات وەکو ئەڵمانیا و ئەمریکا ببات و ئەوانیش ڕاهێنەرو ڕاوێژکاری بە ئەزموون و بە توانای خۆیان نارد بۆ یەکلا کردنەوەی پرسەکە، بەڵام چەکدارەکان سەرەڕای هەموو شتێك جێگیر بوون لە شوینەکانی خۆیاندا و بەو چەکە سووکانەوە خۆڕاگرییەکی زۆریان نیشاندا، ئەو کاتەش هێزەکانی سوپای سعودیە لە ڕێگەی پەرەشووتەوە دابەزاندنیانبە هێزێکی تایبەت کرد بۆ ناو حەرەم، ئەوان توانیان ژمارەیەکی زۆریان لێ بکوژن.

-لە ڕۆژی چوارەمی ڕووداوەکە لە نێو جەماعەتی جوهەیماندا ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا ئەوش کوژرانی ( محمد بن عبد الله القحطاني) بوو کە سێ ڕۆژ پێش کوژرانی وەکو مەهدي بەیعەتی پێ درابوو، ئەمەش بەشێکی لەوانە کە ئاگەداری کووژرانەکە بوون تووشی شۆك کرد ، سەرەتا جوهەیمان باوەڕی نەکرد و وتی مەهدی نامرێت ئێستا و هێشتا ئەرکی زۆر ماوە ئەنجامی بدات، بەڵام کە لە کوژرانەکەی دڵنیا بوون، جوهەیمان - بە پێی هەندێ سەرچاوە - داوای کرد ئەو هەواڵە بڵاوەی پێ نەکرێت.

-له ڕۆژانی داهاتوودا شەڕ لە نێوان چەکداران و ئەو هێزانەی ئابڵوقەی حەرەمیان دابوو بەردەوامی هەبوو، سوپایش داهێنانی ئەکرد لە بەکارهێنانی هەر ڕێگەیەك ببێتە مایەی ڕزگار کردنی مزگەوتەکە بە بێ وێران کردنی، غاز و دووکەڵ و ئاوو فرۆکەو تانك و چەکی قورس و هەموو توانایەکی خۆیان بە بە کارهێنا و سەربازەکانیش بە هەمان شێوە ئازایی و نەبەردییەکی زۆریان نیشاندا بۆ ئازادکردنی حەرم لە دەستی ئەوان، بەڵام چەکدارەکان و ئەو خەڵکەی لە ناو حەرەمدا گیریان خوارد بوو هەر مانەوە بەڵام توانای جەماعەتی جوهەیمان لە کەم بوونەوەدا بوو، فیشەك و ئازووقەو ئاوو خورما بەرەو تەواو بوون دەچوو، بۆنی کوژراوو و برینداەرەکانیش لە ناو حەرەمدا لە گەڵ بۆنی دووکەڵ و غاز و باروتدا تێکەڵ بە یەکتر بوون.

-دوای چەند ڕۆژێك جوهەیمان بڕیاریدا هەرچی مناڵ و ئافرەت هەیە ڕێگە بدرێن دەربچن لە حەرەم و بۆ ئەو مەبەستەش دەرگایەکیان کردەوەو ئەوان دەرچوون شایانی باسە هەندیك لە چەکدارەکانی جوهەیمان ژن و مناڵیشیان لەگەڵ خۆیان هێنا بوو، رەنگە هۆکاری ئەم هەنگاوەش نەمانی خوارد وئاو بێت.

-لە ڕۆژی چوارەمی دەست بەسەراگرتنی حەرەم واتە لە ٢٣ ی تشرینی دووەمی ١٩٧٩ سەرەڕای ئەو بەیاننامانەی حکومەتی سعودیە دەری دەکرد کە حەرەم لە ژێر کۆنترۆڵدایە، بەڵام هەموو جیهان دەیانزانی کە دۆخەکە یەکلایی نەکراوەتەوە بە تەواوی و چەکدارەکان هێشتا حەرەمیان لە ژێر دەستدایە، هەر لەو ڕۆژەدا مەلیك خالید گەورە زانایانی سعودیەی کۆکردەوەو ئەوانیش فەتوای ئەوەیان دەرکرد کە ئەمانە خوارج ن و خروجیان کردووە و

حەرەم کە جێگەیەکە خوای گەورە شەڕو کوشتاری تێدا قەدەغە کردووە ئەوان پشێوی و ترس و کوشتاریان تێدا ناوەتەوە بۆیە درووستە جەنگیان لە دژ بکرێت و بکوژرێن، فەتواکە لە زیاتر لە سی کەس لە گەورە زانایانی سعودیەوە دەرکرا کە (ابن باز) لە نێویاندا بوو.

-لە ڕۆژی نۆیەمی ڕووداوەکە هێزەکانی سعودیە بە تانك و زرێپۆش و چەکدارەکانەوە توانیان کەلێنێك بۆ ناو حەرەم درووست بکەن و بچنە ناو مزگەوتەکەوە، بەڵام زۆربەی چەکدارەکان لە ژوورەکانی خوارەی حەرەم هەر مابوون و لە ژێر زەمینەکانەوە بەرگریان دەکرد و بەو پێیەش ئەگەر چی حکومەت ئەو وێنانەی لە ناو حەرەمەوە بڵاو دەکردەوە وەکو بەڵگە لەسەر تەواو بوونی کێشەکە، بەڵام لە ڕاستیدا کێشەکە هێشتا یەکلا نەکرابوویەوەو ئەوان سەرەڕای نەمانی ئازووقە و ئاو و کەم بوونەوەی چەك و تەقەمەنی، ئەوان هێشتا توانای شەڕکردنیان هەر مابوو، بەڵام جەنگەکەیان بۆ ژوورەکانی خوارەوەی حەرەم گواستبوویەوە.

-هەر لەیەکەم ڕۆژەوە بە هۆی ئاژانسەکانی هەواڵ و ڕاگەیاندنەکانەوە جیهان هەمووی لەو ڕووداوە ئاگەدار بوون و بە ئەو پەڕی بایەخەوە چاودێری دۆخەکە دەکرا، بەڵام دەرکردنی حەرەم لە ژێر دەستی چەکدارەکان کارێکی زۆر قورس بوو، چونکە سوپای سعودیە مەبەستی بوو کە بە کەمترین ڕێژەی وێران کردن لە حەرەمدا پرسەکە کۆتایی پێ بێت،

هەر بۆیە پاش ئەوەی هێزەکانی ئوردون و ڕاهینەران و مەشق پێکەرانی ئەڵمانیا و ئەمریکا نەیانتوانی بە تەواوەتی کێشەکە بنەبڕ بکەن، ناچار سەرانی حکومەتی سعودیە پەیوەندییان بە (جیسکار دیستان) ی سەرۆکی فەرەنسا کرد و داوای یارمەتییان لێکرد،

ئەویش هەڵسا بەناردنی تیمێکی زۆر تایبەتی سەر بە یەکەی هێزەکانی نیشتمانی فەرەنسی GIGN و ئەوانیش لە جوددە مەشقیان بەشەست ئەفسەری سعودیە کرد لە سەر بە کار هێنانی گازێکی لە هۆشبەر ودوا جار و لە کۆتا شاڵاوی سوپادا بۆ سەر چەکدارەکان لە ڕۆژی سیانزیەمی ڕووداوەکان دەستی پێکرد و دوو ڕۆژی خایاند و بە یارمەتی ئەو گازە لە هۆشبەرە و چەکەکانی تر،هەموویان دەستگیر کران و جوهەیمانیش پاش تەواو بوونی چەك و زەخیرەیان بە تەواوەتی ،

خۆ بەدەستەوەدانی خۆی و چەکدارەکانی ڕاگەیاند ودوای پانزە ڕۆژ دەست بەسەراگرتنی حەرەمی مەککە هێزەکانی سعودیە توانیان لێیانی وەربگرنەوە.

-جوهەیمان و هاوەڵەکانی دەستگیر کران و خودی جوهەیمان بۆ ئوتێلێك گواستراپەوەو پەیامنێرەکانی جیهان وینەیان گرت و دوای ماوەیەك دادگایی کردنی هەموو بەشداربووانی ڕووداوەکە دەستی پیکرد و جوهەیمان و شەست کەس لە هاوڕێکانی فەرمانی کوشتنیان بۆ دەرچوو و بە شمشێر لە گەردنیان دراو ئەوانی تریش لە هەتا هەتایی بۆ ماوەی جیاواز حوکمی زیندانی دران.

دەرنجامە فەرمییەکان ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە زیانەکان بەم شێوە بوونە :

١٢٧ کوژراو لە سەربازەکانی سوپای سعودیە،

١١٧ کوژراو لە چەکدارەکانی جوهەیمان،

٢٦ کوژراو لە حاجییەکان کە لە ناو حەرەمدا بوون لە کاتی داگیرکردنەکە،

جگە لە ٤٥٠ بریندار لە ڕیزی سوپا..

بەڵام چاودێرەکان و ئەوانەی لەو کاتە ئامادەی ڕووداوەکان بوونە باسی ژمارەی زۆر لەمە زیاتر دەکەن.

لە کۆتاییشدا دوای گەڕان و خویندنەوەو وگوێگرتنی زۆرم لەسەر جوهەیمان و جەماعەتەکەی و ڕووداوەکە بەوە گەیشتم کە:

١ -جوهەیمانی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەیفی عوتەیبی، گەنجێکی موسوڵمانی وابەستە بووە بە مەنهەجی ئەهلی سوننەتەوە، لە دەشتی ناوچەی (ساجر) ی لای شاری ڕیاز پەروەردە بووەو بە شێوەزاری بەدەوی ئەوان قسەی کردووە، گرنگی زۆری بە زانستی فەرمووده داوە بە تایبەت مەسەلەی وردبوونەوە لە سەنەد وحاڵی گێڕەرەوەکان و مەسەلەی عیلەل، ئەمەش - دواتر - ڕەنگدانەوەی زۆری لەسەر شوێنکەوتوانی هەبووە، لەسەر ئەم بنەمایەش پەیوەندی تۆکمەی لە گەڵ زانا ناودارەکان هەبوو بەتایبەتی ئیبنو باز و ئەڵبانی، هەروەها لە گەڵ (مقبل بن هادي الوادعي) یەمەنی.

٢ -لەسەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەم لە گەڵ پێنج کەسی تردا هەڵساون بە درووست کردنی کۆمەڵەیەکی سەلەفی لەسەر ئەو بنەماو بنچینانەی کە باوەڕیان پێی بووە و جیاوازیشی نەبووە لە گەڵ بیروباوەڕی زانایانی ئەو سەردەمە کە لە شاری مەدینە بوونە وەکو:

(ابن باز،الالباني، مقبل الوادعي، أبو بکر الجزائري....) ابن باز ناوی کۆمەڵەکەیانی لە

( الجماعة السلفية) وە بۆ ( الجماعة السلفية المحتسبة) گۆڕیوە، بە شایەتی شێخ مقبل الوادعي لە پاش لە ناوچوونی جوهەیمان و شوێنکەوتوانی لە کتێبی(المخرج من الفتنة) سەرەڕای ئەوەی وتوویەتی ئەوان لە ڕووداوی حەرەم هەڵە بوونە بەڵام دانی بەوەدا ناوە کە ئەوان کاریگەری زۆر باشیان بووە لەسەر موسوڵمانانی سعودیە و وڵاتانی تریش وەکو میسر و سودان و کوەیت و شوێنەواریان لە بانگەوازدا نکۆڵی لێ ناکرێت.

٣ -جوهەیمان و جەماعەتەکەی بە چەند قۆناغێکدا لە تێگەیشتنی دەقەکان تێپەڕ بوونە، بۆیە چەندین کەسی دامەزرێنەری ئەو کۆمەڵە لەسەر بنەمای گۆڕانکارییە فیکریەکانی جوهەیمان لە کۆمەلەکە دوور کەوتوونەتەوە، بۆ نموونە: دوای تیکچوونی پەیوەندی جوهەیمان و ئەبو بەکری جەزائری ژمارەیەك لە هاوڕێکانی جوهەیمان ئەو جەماعەتەیان بەجێهێشت و شوێن جەزائری کەوتن لەوانە:( سلیمان الشتیوي) کە یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی ئەو کۆمەڵە، هەروەها (فیصل الیامي) بە هەمان شێوە لە ڕووی فیکرییەوە لەگەڵ جوهەیمان ناکۆکی کەوتە نێوانیان بەڵام وەکو هاوڕێتی و برایەتی ئەو جوهەیمانی بە جێ نەهێشت و تاکو مردن لە گەڵیدا بوو،

پێویستە ئەوەش بوترێت هێڵە پانەکە هەمیشە زۆرینە بووەو بەتەواوەتی وابەستەی ئاراستەو تێگەیشتنی جوهەیمان خۆی بوونە.

٤ -ئەم کۆمەڵە و سەرکردکەشیان، بە کرێگرتەی هیچ لایەنێك نەبوونەو پارەو یارمەتیشیان لە هیچ لایەنێك وەرنەگرتووە، کۆمەڵەیەکی بانگەواز بوونە نەك حیزبێکی سیاسی ، بەڵکو باوڕیان بە دامەزراندنی حیزبیش هەر نەبووە، کاتێکیش لە سەرەتای درووست بوونیان هەستیان بەوە کرد یەکێك لە دامەزرێنەرەکانیان جەماعەتەکەیان بەرەو کۆمەڵەی (الاخوان المسلمون) ی میسر ڕایان ئەکێشێت، یەکسەر فەسڵیان کرد، یان ناچاری دوور کەوتنەوەیان کرد لە خۆیان.

٥ -جوهەیمان تەوەرەی سەرەکی ئەو جەماعەتە بوو کە هەمووان پێوەی وابەستە بوون، ئەو وابەستە بوونەش هەر وا لە خۆڕایی درووست نەبوو بوو، چونکە جوهەیمان بە شایەتی ئەوانەش کە لەگەڵی ناکۆك بوون و دواتر لێی جیابوونەوە، نموونەی ڕەوشتی جوان و خۆ ڕاگری و پشوو درێژی و گەڕان بە دوای بەڵگە و دینداری بووە، تەنانەت تەنها ناوی بەس بووە بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە گەنجانی خۆبەخشی ئەو وڵاتە پەیوەندی پێوە بکەن بە مەبەستی فەرمان بە چاکە نەهی لە خراپە.

٦ -لە مەسەلەی دیاری کردنی ( محمد بن عبد الله القحطاني) وەکو مەهدی ئاخیر زەمان، جوهەیمان و هاوڕاکانی ئیجتهادێك بوو کردیان وهەڵە بوون و ڕاستییان نەپێکا، هەڵەکانی تریشیان وەکو داگیر کردنی حەرەم بیناکردن بوو لەسەر ئەو هەڵەیە،

بەڵام ئەوان وا دەردەکەوێت جگە لە جێبەجێکردنی فەرموودەکان دەربارەی مەهدی و بەیعەت پێدانی لە بنچینەداهیچ بەرنامەو مەبەستێکی تیکدەرانەیان نەبووە.

٧ -لە پرسی دەست گرتن بەسەر حەرەمدا ئەوان ( متأول) بوون و ئیمانی تەواویان بەوە بوو قەحتانی مەهدییە وقیامەت نزیك بووەتەوەو تەنانەت کاتێك لەناو حەرەم بوون چاوەڕوانی ئەو سوپا بوون کە لە فەرموودەکاندا باسکراوە کە بەرەو کەعبە دێن و خوای گەورە بە ناخی زەوییاندا دەبات.لە یەکەم فەرمانەکانیشیدا بە چەکدارەکان کاتێك دابەشیان دەکاتە جێگەکانی خۆیان پێیان دەڵێت تەقە مەکەن تاکو تەقەتان لێ نەکرێت،

حکومەتی سعودیەش ئەو شەڕەی لەسەر سەپێنرا و بە هیچ پێوەرێك نەیدەتوانی دەستەوسان بێت بەرانبەر ئەو کردەوە لە داگیرکردنی حەرەم، بەڵام قسە لەسەر ئەوەیە بۆچی کۆمەڵێك لە زانایانی بۆ گفتوگۆ کردن نەنارد لەگەڵیان ویەکسەر بەو شێوە مامەڵەی لەگەڵ کردن.

٨ -هۆکاری ئەوەم بۆ ئاشکرا نەبوو نەشمتوانی تێبگەم؛ بۆچی جوهەیمان لە چوارەم ڕۆژی ڕووداوەکەدا، کاتێك (محمد القحطاني) کە گوایە مەهدییە کوژرا کە بە پێی فەرموودەکان ئەو نابێت لەوێدا بمرێت، بۆچی دوای ئەوەش جوهەیمان هەر بەردەوام بوو لەسەر شەڕ کردن و خۆی بە دەستەوە نەدا؟!

٩ -ئەگەر چی ڕوداوی حەرەم ڕوداوێکی نەخوازراو بوو سعودیەی خستە هەڵویستێکی زۆر ناخۆشەوە، بەڵام هەندێك وەکو:

( أبو محمد المقدسي) پێیان وایە، ئەو ڕووداوە هەلێکی زێڕین بوو بۆ حکومەت هەڵکەوت بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵە لە نێو بدات، هەندێکی تریش بە دووری نازانن کە دەسەڵاتداران لەو پلانەی ئەوان ئاگادار بووبێتن و ئاسانکاریان بۆ داگیر کردنی حەرەم بۆ کردبن بۆ ئەوەی بەهانەی لە ناوبردنیان لەسەرتاسەری وڵات دەست بکەوێت.

١٠ -ئەوان لە دیدی خەڵکی و بگرە هەندێك لەو سوپایەش کە ئابڵۆقەی حەرەمی دابوو بە کەسانێکی موسوڵمانی وابەستە بە دینەوە ئەناسران، بۆیە شا خالد داوای فەتوای لە زانایان کرد بۆ شەڕکردن لە دژی ئەوان و کوشتنیان ،

دوا جار ٣٢ لە زانایانی سعودیە - کە ابن باز یشیان تێدا بوو - فەتوای ئەوەیان دا ئەوان خروجیان کردووە و پێویستە بکوژرێن.

١١ -جوهەیمان وکۆمەڵەکەی خەوارج نەبوونە بەو واتای لەسەر بیروبۆچوونی خەواریجەکان بووبن، بەڵکو زۆر دووریش بوونە لە بیروباوەڕی ئەو تاقمە کە باوەڕیان بە فەرموودە نەبووەو نەفرەتیان لە هاوەڵان کردووەو بە تاوانی گەورە موسوڵمانیان کافر کردووە، بەڵام خروجیان لەسەر ئەو دەسەڵاتە کردووە کە زۆر بە ڕەخنە بوونە لێی و کێشەیان لەگەڵ دەسەڵاتدا کێشەیەکی شەرعی بووە و لەو ڕووەوە بووە کە ئەوان لە شەرعی ئیسلام لایان داوە،

بە ڕای خۆیشم و ئەوەی تێگەیشتووم داگیرکردنیان بۆ حەرەم تەنها بۆ مەبەستی بە جهینانی بەیعەتدان بووە بە مەهدی کە بە بۆچوونی ئەوان بریتی بووە لە (محمد القحطاني).

بەڵام شێخ موقبیل وادعی پێی وایە جگە لە مەسەلەی بەیعەتدان بە مەهدی چەند هۆکارێکی تریش لە پشت داگیرکردنی حەرەمەوە وەستاوە، لەوانە:

*دژایەتی هەندێك زانا بۆ جوهەیمان و کۆمەڵەکەی، وەکو: ابن صالح و شیبة الحمد و ابن مزاحم، کە ئەوان خەڵکیان لە جوهەیمان و جەماعەتەکەی وریا دەکردەوەو قسەشیان بۆ هەڵدەبەستن.

*بێ ئینسافی دەسەڵاتی سعودیە لە گەڵ ئەو گەنجانەو ئازاردان و زیندان کردنیان و تەماشاکردنیان وەکو تاوانبار و لارێ و لادەر.

*تێکەڵ بوونی هەندێ گەنجی میسری لەگەڵیان و درووستکردنی کاریگەری لەسەریان.

*تێکچوونی کۆمەڵگەی سعودی و دوورکەوتنەوەیان لەشەرعی خوا کە بووە مایەی تووڕە بوونی ئەوان لەو واقیعە دوورە لە ڕوحی ئیسلام.

بابەتەکەم بەم پرسیارە کۆتایی پێ دەهێنم:

ئایا ئەوان - سەرەڕای هەموو شتێك - لە داگیرکردنی حەرەمدا ڕاست بوون یان هەڵە بوون؟

بێگومان هەڵە بوون، چونکە ئەوان:

*بوونە هۆکاری خوێن ڕشتن و خوێن ڕشتنیش لە ناو حەرەمدا قەدەغەیە وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( لا يسفك فيها دم)

*چەکیان لە ناو حەرەمدا هەڵگرت و چەك هەڵگرتنیش لەناو حەرەمدا بە فەرموودەی صحیح حەرامە.

*پشتیان بە خەو بینین بەست بۆ مەسەلەی مەهدی و خەویش هیچ حوکمێکی شەرعی پێ جێگیر ناکرێت، تەعبیری ئەو خەوانەش وەکو شێخ مقبل ئەڵێت: یان وەسوەسەی شەیتان بووە،

یان ئەوەیە قەحتانی لە سیرەو ڕەوشتیدا مەهدی بووە نەك خۆی بە ڕاستەوە مهدی بێت، چونکە شێخ موقبیل دەڵێت: من خۆم قەحتانیم دەناسی و پیاوێك بوو خوا ناس و وابەستە بەشەرعی خوا، هەموو قورئانی لەبەر بوو ڕەحمەتی خوای لێبێت، بەڵام کەوتنە هەڵەوە.

ئەی حوکمیان لەسەر ئەو کردارەی کە کردیان چیە؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەش دیسان ئەچمەوە سەر وەڵامەکەی شێخ موقبیل هەم لەبەر ئەوەی ئەو زانایەکی گەورەیە و هەم لەبەر ئەوەی ئەوانی هەموویان بە شەخسی ناسیوەو لە زانیارییەوە قسە دەکات.

ئەو دەڵێت: حوکمی ئەوان ئەوەیە (بغاة) ن، واجبی حکومەتی سعودیەش ئەوەبوو کەسانی وەکو (ابن باز و ابن حميد) ی بناردایە قسەی لەگەڵ بکردنایەو بەبەڵگە قناعەتی پێ بکردنایە، هەر وەکو چۆن عەلی ڕەزای خوای لێبێت (ابن عباس) ی بۆ لای خەواریجەکان نارد و گفتوگۆی لەگەڵ کردن و ژمارەیەکی زۆری لێ پەشیمان کردنەوە. کە مادام بوغاتیش بن، دیل و برینداریان ناکوژرێت و ژن و منالیان دەستگیر ناکرێت و،

بە ڕای شێخ موقبیل یش - سەرەڕای ئەوەی کە هەڵە بوونە لە داگیرکردنی حەرەمدا - بەڵام ئەوان لە ڕۆژی قیامەتدا لەلای خوای گەورە حکومەتی سعودیە دادگایی دەکەن لەسەر ئەوەی بەسەریاندا هات.

ئەم نووسینەم بریتییە لە بە دواداچوون و دەرەنجامی خویندنەوەیەکی زۆر و گوێگرتن لە وانەو دیکۆمێنتاری و چاوپێکەوتنی زۆر لەسەر ئەو ڕووداوەو کۆمەڵەی ( الجماعة السلفية المحتسبة) بەتایبەت کەسایەتی یەکەمیان کە جوهەیمان بووە، هەوڵم داوە دادگەرانە و بەبێ ئەوەی هیچ کاریگەرییەکم لەسەر بێت ئەنجامی بدەم،

بۆیە نووسینەکەم تەنها هەوڵێکە، ئەگەر ڕاستیم پێکابێت ئەوە فەزڵ و چاکەی خوایە بەسەرمەوە، ئەگەریش تووشی نەپێکان و هەڵە بووبێتم ئەوە لە خۆم و لە شەیتانەوەیە و هەرکێ هەڵەیەکم بۆ ڕاست بکاتەوە بە بەڵگە لێی وەردەگرم و سوپاسیشی دەکەم

تێبینی:سەرچاوەکانم بۆ نووسینی ئەم بابەتە هەمە جۆر بوون،

قسەی دۆست و دوژمنی جوهەیمان و جەماعەتەکەیم خوێندەوە و گوێ بیستی بووم،

بۆ نموونە:

-أيام مع جهيمان،كنت مع الجماعة السلفية المحتسبة، ناصر الحزيمي.

-المخرج من الفتنة، مقبل بن هادي الوادعي.

-جهيمان العتيبي: لو كنت أعلم الغيب لما قدت جماعتي بالسلاح داخل الحرم، مركز المسبار.

-حتى لا يعود جهيمان،توماس هيغهامر وستيفان.

-مقال:جهيمان بعد ٢٨ عاما.. نهاية أسطورة/منصور النقيدان/ صحيفة ايلاف.

-چاوپێکەوتنێکی (أبو محمد المقدسي) لە یوتیوب کە بە وردی باس لە جوهەیمان و بزوتنەوەکەی دەکات.

-موحازەرەیەکی درێژی : فیصل قزار الجاسم بە ناونیشانی: حادثة جهيمان واقتحام الحرم

-دیدارێکی دەنگیی (محمد المسعري) باسی ڕووداوی حەرەم و جوهەیمان ئەکات.

-چاوپێکەوتنێکی (ناصر الحزيمي) لە کەناڵی الخليجية لە گەڵ عبد الله المديفر باسی پەیوەندی خۆی و کارکردنی لە گەڵ جوهەیمان دەکات.

-بەرنامەیەکی دەکیۆمینتاری کەناڵی بی بی سی دەربارەی جوهەیمان وڕوداوی حەرەم.

-تەنانەت ئەو بەرنامانەش کە کەناڵێکی وەکو (العربية) ی سەر بەسعودية دەریکردووە تەماشام کرد بۆ ئەوەی وەکو وتم قسەی دۆست و دوژمنی جوهەیمان وەرگرم.

( لەگەڵ چەندین سەرچاوەی تر)

# ( حسن حنفي )



لە قاهیرە لە ساڵی١٩٣٥ لە دایکبووە ، بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی سۆربۆن لەفەرەنسا بەدەستهێناوە لە ساڵی ١٩٦٦ ، مامۆستای فەلسەفەیە و سەرۆك بەشە لە هەمان زانکۆ ، سکرتێری کۆمەڵەی فەلسەفەی میسرییە ، خاوەنی چەندین کتێبە کە تێدا هەڵوێستەکانی دژە یەکترن ، بەڵام بە گشتی پشتگیرییەکی ڕەهای عەلمانییەت دەکات و دژایەتیشی بۆ ئیسلام ناشێرێتەوە ، لە کۆنگرەی (الاسلام والحداثة) وتی: (**أنا أكثر ماركسية من الماركسيين**) واتە: من لە مارکسییەکان مارکسی ترم.

هەروەها دەیووت: ئێمە لە سپێدەی ڕاپەڕینی نوێوە کۆشش دەکەین لە ئیمانی سەلەفی دەربچین ، هەروەها دەڵێ:

( **أنا مفكر وضعى وكل ما يخرج من نطاق الحس والمادة والتحليل أضعه بين قوسين**)

واتە: من بیرمەندێکی سەر بە قوتابخانەی پۆزەتیڤێستم (المدرسة الوضعية) هەرچییەکیش لە بازنەی هەستکردن و مادده و شیکردنەوە ( مەبەستی لە بابەتە ئاینییەکانە) بەدەربێت دەیخەمە نێوان دوو کەوانەوە.

لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ (منى الشاذلى) لە کەناڵی دریم خۆی دەڵێت:من کۆنە ئیخوانیم (إخوانى شیوعیم) هەروەها دەڵێت منکاتی خۆی ڕەفیقی مەهدی عاکف ی ڕابەری گشتی کۆمەڵەی (الاخوان المسلمون )بوومە ولەسەر یەك تەختە دانیشتووین ، بەگشتی پێی خۆشە بە بیرمەندی ئیسلامی چەپ (الإسلامى اليسارى)ناوببرێت! بڕوانە:الحداثه والإسلام٢١٧-٢٢٤ هەروەها ژیاننامەکەشی لە هەمان کتێبدا لاپەڕە:٤١٦.

# ( نصر حامد أبو زيد )



لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٣ ز، ئەکادیمییەکی میسرییە ، توێژەرو پسپۆڕە لە بواری زمانی عەرەبی ولێکۆڵینەوەی ئیسلامی ، یەکێکە لە سەرسەختترین ناحەزانی ئیسلام لەم سەردەمەدا، پێی وایە قورئانی پیرۆز زیاتر نییە لە دەقێکی ئاسایی ،هەروەهادەڵێت:(وحی) دیاردەیەکە و قابیلی گفتۆگۆ لەسەر کردنە ووەرگرتن و بەرپەرچدانەوەیە، عەلمانییەت بە تاکە ئایینی شایستە دەزانێت ، هەموو جۆرە ڕوبەڕووبونەوەیەکی ئایینی ئیسلامیش بە ئەرك وبنەمایەکی گرنگ تەماشا دەکات ،سەرەتا گرنگی بە لێکۆڵینەوەی زمانەوانی و زانستەکانی قورئانەدا ، وەکوهەوڵێك بۆ دۆزینەوەی زەمینەیەك بۆ لێدانی ئیسلام ،شێوازێکی کارکردنی ڕەچاو دەکرد کە پشتی دەبەست بە لێدانی بنەماکانی ئیسلام لەناوەوەی خۆیەوە ،

لەکاتی گفتوگۆی دکتۆراکەی بە ناونیشانی (فلسفة التأويل (دراسة في تأويل القرآن عند محيي الدين بن عربي) سەرۆکی لیژنەکە دکتۆر (عبدالصبور شاهین) ئەوی بە کافروبێ دین ناساند ،

دواتر پاش هەندێك كەيسی دادوەری سەبارەت بە هەڵوێستەكانی لەئیسلام و بڕیاری جیاكردنەوەی لە خێزانی ، ڕژێمی (حسنی مبارك) ئاسانكارییان بۆ كرد و بواریان بۆ ڕەخسان لە میسر دەربچێت وئیدی لەزانكۆكانی ڕۆژئاوا لە ئیسپانیا و هۆڵەندا ئەمریكا و فەرەنسا پێشوازی گەرمی لێكرا تاكو لە ٢٠١٠ لە ئەوروپا تووشی ڤایرۆسێكی نامۆ بوو بە پزیشكەكان چارەسەر نەكرا ودوو هەفتە پێش مردنی گەڕایەوە میسر وپاش ئەوەی بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لە غەیبوبەوبێ ئاگاییدا بوو گەڕایەوە لای ئەوپەروەردگارەی كە جەنگی لەدژی ئایینەكەی ڕاگەیاندبوو.

بڕوانە: سایتی ویكبیدیا ،

هەروەها: الانحراف العقدی فی أدب الحداثة وفكرها.

# ( محمد عابد الجابري )



بیرمەندو ئەكادیمییەكی مەغریببییە ، لە ساڵی ١٩٣٦ لە مە غریب لە دایكبووە ، لە ساڵی ١٩٧٠ بڕوانامەی دكتۆرای لە بواری فەلسەفە بەدەستهێناوە ، خاوەنی كۆمەڵێك كتێب وتوێژینەوەیە ، وەكو:(الخطاب العربي المعاصر) و ( الدين والدولة وتطبيق الشريعة) و(مدخل إلى القران ) ٣ بەرگە و(معرفه القران الحكيم) ٣ بەرگە. لەنووسینەكانیدا بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ هەوڵیداوە گومان لە دەوری قورئان و هاوەڵان و مێژووی ئیسلام و زۆرێك لە بابەتە فیقهی و ئوصوڵییەكان دروست بكات ، یان وەكو خۆی دەڵێت زۆرێك لەوانەی خستووتە نێوان دوو كەوانەوە! ئەم كەسایەتییە جێگای ڕێزو بایەخی زۆربەی حەداسییەكان و عەلمانییەكانە لە هەموو جیهاندا و وەكو پێشەنگ و سونبول تەماشا دەكرێت ، كۆمەڵێك ڕاوبۆچوونی نامۆی هەیە سەبارەت بەئیسلام.

ئەمەی خوارەوەهەندێکیانە:

-گۆڕینی سزای جەڵدە لێدان (الحد) بە زیندانی کردن!

-بە پێویستی دەزانێ پێداچوونەوەی گشتگیر بۆ بنەماکانی ئیسلام بکرێت بە تایبەتی (أصول الفقه).

- پێی وایە بەرژەوەندی (المصلحة) بنەمای هەموو بنەماکانە ،و لەم بارەشەوە قسەی زۆر وشیکردنەوەی دوورودرێژی هەیە.

-چەندین پێویستی تری بۆ (الضرورات الخمس ) زیاد کردووە.

-گومانی لەوە هەیە کە قورئان بە بێ گۆڕین و زیادو کەم و پێمان گەشتبێت.

-لە بارەی مێژووی ئیسلام و هاوەڵان یش بیرو بۆچوونی نامۆی زۆرە.

محمد عابد الجابري دەڵێت:

**( لم أكن في يوم من الأيام من معتنقي الماركسية أبدا فقد وجدت أن النظرية الماركسية كما هي عند ماركس و انجلز جيدة جدا ، لكن تطبيقها يحتاج إلى بيئة أخرى غير بيئتنا العربية)**واتە: من ڕۆژێك لە ڕۆژان هەرگیز مارکسی نەبوومە ، چونکە من بینیم ڕێباز وبۆچوونی مارکس و ئەنجلز زۆر باشە ، بەڵام جێبەجێکردنی پێویستی بە ژینگەیەکی ترە جیاواز لەژینگەی عەرەبی.

جابری -وەکو حەسەن حەنەفی- سەبارەت بە ناشیرینکردنی ئیسلام میکانیزمێکی تایبەتی هەیە ئەویش بریتیە لە گومان درووستکرن بەزمانی زانست وتازەگەری وچاکسازی ودروشمی لەشێوە ،هاوکات شارەزایی زۆریشی لە زانستەئیسلامییەکان هەیە، هەربۆیە جومهوری زۆرە و هەندێ لە رۆشنبیرە ئیسلامییەکان یش- بە تایبەت ئەکادیمییەکان - کەوتوونەتە ژێر کاریگەری قسەکانی

وسەرسامن بە کتێبەکانی ، بۆیە بە پێویستی ئەزانم وریایی پێویست دەربارەی ئەم بیرمەندە بدریت و پەردە لەسەر بیرو بۆچوونە نامۆکانی هەڵبدرێتەوە. شایەنی باسە لەکوردستانی خۆیشماندا خوێنەری هەیە و چەندین دکتۆر و مامۆستای زانکۆ کە لەوانەیە هەندێکیان خۆیان بەخاوەنی بیرێکی ئیسلامی بزانن پێی سەرسامن وبەدوای کتێبەکانیدا دەگەرێن..

الجابري لە ٣-٥-٢٠١٠ کۆچی دوایی کردووە.

بڕوانە: ( الانحراف العقدي في أدب الحداثة وفكرها)

(الحداثة في ميزان الاسلام)

( كتاب يجب ان نحذرمنهم) المجلة العربية ع١٦٥

(قراءه فی فكر الدكتۆر محمد عابد الجابري) مجله البيان.

# ( محمد الماغوط )



شاعیرو ڕۆماننوسێکی سوریە ، لە دایکبووی ساڵی ١٩٣٦ز ،لە سەرانی قوتابخانەی تازەگەرییە لە ئەدەبدا ،سەرەتا بەرهەمەکانی لە گۆڤاری (شعر) بڵاودەکردەوەو هەر ئەوگۆڤارەش بوو ناوبانگی بۆ درووست کرد ، شیعری پەخشان (قصیدە النثر) دەنووسێت ، خاوەنی چەند دیوانێکە لەوانە: (سأخون وطني).

دوژمنێکی ماندوونەناسی ئیسلام بوو تاکو ئەوکاتەی لە ساڵی ٢٠٠٦ لەدونیا دەرچوو ، هەروەها جەنگی لەدژی شیعری تەقلیدی وەزن وقافیە ڕاگەیاند ، بەیەکەم کەس دادەنرێت کە شیعری پەخشانی داهێناوە ، واتە:نەوەزن نە قافیە (نە واتاش) جگە لەوشیعرانەی نەبێت کە گاڵتەجاری تێدا دەکات بە خوای گەورە ،زۆر بە ڕوون وئاشکرا دەینووسێت،

بۆ نموونە دەربارەی خوای پەردگار (پەنا بە خوا ) دەڵێت:

**لماذا خلقني ؟ وهل كنت أوقظه بسبابتي كي يخلقني؟** واتە: بۆ دروستی کردم؟

ئایا من بە پەنجەم ئەوم بێدار کردەوە کە درووستم بکات...

هەروەها وتوویەتی :

"إنني أعد ملفا ضخما عن العذاب البشري لأرفعه إلى الله فور توقيعه بشفاه الجياع وأهداب المنتظرين ولكن يا أيها التعساء في كل مكان جُلَّ ما أخشاه أن يكون الله أميّا" أنا نبي لاينقصني إلاّ اللحية والعكازوالصحراء"

بە گشتی لیستی جنێودان وسوکایەتی کردنی ( محمد الماغوط) بە خواو هەموو پیرۆزییەکان لیستێکی دوورودرێژە، هەر بۆیە بەیەکێك لە هەرە گەورەترین سەرانی حەداسییەکان (الحداثة الأدبية) دادەنرێت وهەمیشە لەلایەن عەلمانییە عەرەبەکانەوە جێگای ڕێزو بایەخی زۆر بووە ، بە ژمارەیەکی قورس وەسفیان دەکرد.

لە ساڵی ٢٠٠٦ لە کاتی پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا گەڕایەوە لای ئەوپەروەردگارەی جەنگی لە دژ ڕاگەیاندبوو.

بڕوانە:(الإنحراف العقدى فى أدب الحداثة وفكرها) د.سعيد الغامدى،

(سایتی ویکبیدیا)و ( الحداثة في ميزان الإسلام) لعوض القرني

# ( محمد أركون )



(محمد أركون) توێژەرو بیرمەندو مێژوونووسە ، لە ساڵی ١٩٢٨ز لە جەزائیر لە دایکبووە ، لە ساڵی ١٩٦٨ بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی سۆربۆن لە فەرەنسا بەدەستهێناوەو هەر لەوێیش دواتر بووەتە مامۆستای فەلسەفەی فیکری ئیسلامی ، زۆربەی نووسینەکانی بە ئینگلیزی و فەرەنسی داناوە و وەرگێڕدراوەتە زمانی عەرەبی .

وەکو: (تاريخية الفكر العربي الإسلامي) (الفكر الأصولي واستحاله التأصيل)و ( الإسلام ، أوربا ، الغرب).

دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلامە، ئەو ئەگەر چی بەناو موسوڵمان بوو ، زۆر قەڵس دەبوو بەوەی پرسیاری لێ بکرایە : ئایا ئیمانداری؟

لە وەڵامدا دەیووت : من حەز لەو پرسیارە ناکەم و وەڵامی نادەمەوە!

لەبیروبۆچوونەکانی:

- باوەڕی وابوو قورئان بەرهەمێکی ئەدەبییە ، کەسیش وەکو ( محمد أحمد خلف **الله**) لێی تێنەگیشتووە. لە کاتێکدا ئەو ناوبراوە مارکسییەکی بێ باوەڕ بوو.

- جگە لە نکۆڵی کردنی لە ڕاستی و درووستی قورئانی پیرۆز ، نکۆڵی لە ڕاستی فەرموودەکانیش دەکرد و پێی وابوو لە دەرەنجامی هەل و مەرجی سیاسی و بارودۆخی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان هەڵبەستراون!

-هەمیشە لە کتێبەکانیدا باسی ( نقد العقل الإسلامی) دەکات و مەبەستیشی پێی ئایینی ئیسلامە.

- بە پاساوی تازەگەری و کۆشش کردن و دووبارە خوێندنەوەی دەقەکانی قورئان زانستی خۆی هەمیشە بەکار هێناوە بۆ تێکدانی چەمکەکانی ئیسلام ،خوێنەریشی زۆر بووە ولە عێراق وکوردستانیشدا جومهوری خۆی هەیە.

- (تركي الدخيل) لە کەناڵی (العربية) لە دوو ئەڵقەدا چاوپێکەوتنی لەگەڵ کرد و زۆرێك لە بیروبۆچوونەکانی دژ بە ئیسلام بە ئاشکرا باسکردووە.

-لە ساڵی ٢٠٠٣ (جاك شیراك ) ی سەرۆکی پێشووتری فەرەنسا لیژنەیەکی پێکهێنا بۆ بڕیاڕدان سەبارەت بە قەدەغەکردنی پۆشینی سەرپۆش لە ئافرەتان ، لیژنەکە پێکهاتبوو لە ( حنيفة الشريفي) و (محمد أركون) و بەوەش گەیشتن کە پێویستە سەرپۆش لە فەرەنسا قەدەغە بکرێت.

لە ساڵی ٢٠١٠ز لەتەمەنی ٨٢ ساڵیدا بەنەخۆشییەك کە زۆر بەدەستییەوە ناڵاندی کۆچی دوایی کرد.

بڕوانه:

- ( الإسلام والحداثه) عوض القرني..

- ( رأيهم في الإسلام) حوار صريح مع أربعة وعشرين أديبا عربيا .

- ( الإنحراف العقدى في أدب الحداثة وفكرها) .

- (القرآن الكريم قراءالحداثية د.حسن العباقي).

(سايتى ويكبيديا).

**دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلامە، ئەو ئەگەر چی بەناو موسوڵمان بوو ، زۆر قەڵس دەبوو بەوەی پرسیاری لێ بکرایە : ئایا ئیمانداری؟**

# ( نزار قباني )



شاعیرێکی بەناوبانگی سوریيە ، لە دایکبووی ساڵی ١٩٢٣ز ،لە ساڵی ١٩٤٥ز کۆلێژی ماف ی تەواوکردوە، یەکێکە لەسەرانی ڕێڕەوی (الحداثة الأدبية) ، بە شاعیری ئافرەت ناسراوە ،چونکە زۆربەی شیعرەکانی تایبەتن بۆ وەسفی لاشەی ئافرەت و وەکو ئامرازێکی حەزوئارەزووی جنسی تەماشای دەکات .

زۆربەی دیوانێکەکانی یان بریتین لە باسی ئافرەت وەکو هاندانی بۆ هەڵگەڕانەوە لەسەر باوك و براو کۆمەڵگا ،یان گاڵتە کردنە بە دروشمەکانی ئیسلام بە گشتی ،هەر وەها زۆر ڕقی لە عەرەب و زمانی عەرەبیش بوو ، ئەم واتایانە لە دیوانەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە .

وەکو:

(طفولة نهد )و(قصائد متوحشة) و( أنت لي)...هتد .

یەکێکە لەوشاعیرانەی بەهەناسەیەکی زۆر درێژەوە دژایەتی ئیسلامی کردووە لە ڕێگای سوکایەتی کردن بە خواو پێغەمبەر (ﷺ) وئایەت وفەرموودەکان ،

لەهەموو ئەوانەشدا بە شێوازێکی ئاسان وڕاستەخۆ و بە ڕاشکاوی شیعری نووسیوە ، بەگشتی توانا شیعرییەکانی -کە دۆست دوژمن شایەتی بۆ داوە- لەو بوارانەدا بەکارهێناوە..بۆ نموونە دەڵێت:

(ذهب الشاعر يوماً إلى الله..

ليشكو له ما يعانيه من أجهزة القمع..

نظر الله تحت كرسيه السماوي

وقال له: يا ولدي

هل أقفلت الباب جيداً ؟؟.) والعياذ بالله.

هەروەها بە (جمال عبدالناصر) دەڵێت: ( قتلناك يا اخر الانبياء). ئەم شاعیرە پانزە ساڵی کۆتایی ژیانی لە لەبریطانیا بەسەر بردووەو لە ١٩٩٨ز لە یەکێك لە خەستەخانەکانی لەندەن مردووە لە کۆتا هۆنراوەشی لەسەرە مەرگیدا وتوویەتی:

(**السكنى في الجنة.. والسكنى في دمشق.. شيء واحد. الأولى تجري من تحتها الأنهار.. والثانية تجري من تحتها القصائد والأشعار**)

چەند ساڵێکیش لەمەوبەر کتێبێکم دەربارەی ئەم شاعیرە نووسیبوو بەناونیشانی:

(**نزار قباني ولوثة الفكر الحداثي في شعره**) کە بریتی بوو لە توێژینەوەی دەرچوونم لەکۆلێژی پەروەردە لە زانکۆی کەرکوك ،

کە لە بیروت چاپ کرا ولە کوردستان وهەندێ وڵاتی عەرەبی بڵاوبوویەوە بەتایبەت لە ئێنتیەرنێت:

:http://www.saaid.net/book/open.php?cat=٨٨&book=٧٣٨٥

**یەکێکە لەوشاعیرانەی بەهەناسەیەکی زۆر درێژەوە دژایەتی ئیسلامی کردووە لە ڕێگای سوکایەتی کردن بە خوا پاشان پێغەمبەر (ﷺ) وئایەت وفەرموودەکان.**

# ( جمال البنا )



(جمال البنا) له ساڵی ١٩٢٠ز له میسر له دایكبووه ، نوسەرە وبەلای هەندێكەوە بیرمەندێكی ئیسلامییه ، برا بچووكی ( حسن البنا)ی دامەزرێنەری كۆمەڵەی (الإخوان المسلمون)ه.چەندین كتێبی هەیە ، وەكو: "ثلاث عقبات في الطريق إلى المجد"و "ديمقراطية جديدة"خاوەنی كۆمەڵێك بیروبۆچوونی نامۆیه كه بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا ناگونجێن، لەوانە:

-دەیووت: هەركەسێك ئەگەر له ئیسلام پاشگەز بێتەوە و ببێتە جوولەكە یان گاور هیچی لەسەر نییە.

-پێی وابوو پیاو بۆی نییە خێزانەكەی تەلاق بدات بەبێ ڕەزامەندی ئەو ، واتە: سەرەتا چۆن بەڕەزامەندی هەردوو لا هاوسەرگیری ئەنجامدرا تەلاقیش بەهەمان شێوە.

-نكۆڵی دەكرد له سوننەت و پێی وابوو هەردوو سەحیحی بوخاری و موسلیم بەڵگە نین لەسەر حوكمە شەرعییەكان!

- لەبیروبۆچوونە نامۆکانی تری - کە زۆرن- بۆ نموونە جگەرە کێشانی بە ئاسایی دەزانی لە کاتی بەرۆژوبوندا ، هەروەها ماچکردنی نێوان هەردوو ڕەگەزی نێرو مێی نامەحرەمی بە حەڵاڵ دەبینی یان بە لەمەم و گوناهی بچووکی دەژمارد.

-پێی وابوو پێشنوێژی کردنی ئافرەت جائیزە بۆ پیاوان ئەگەر قورئانی زیاتر لەبەر بێت.

- سەرپۆشی بەفەرز نەدەزانی لەسەر ئافرەت وبە حاڵەتێکی تایبەتی دەزانی بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) .

ئەمەو جگە لە چەند بۆچوونێکی تر کە شیاوی باسکردن نین لێرەدا! زۆرێك لە زانایانیش بەرپەرچیان داوەتەوە.

لە ساڵی ٢٠١٣ز کۆچی دوایی کرد و بەم شێوەش زنجیرەی بیروبۆچوونە نامۆکانی بۆ یەکجاری ڕاوەستا و بەڵایەك لە کۆڵی موسوڵمانان بوویەوە.

# ( محمود أبو رية )



لە ساڵی ١٨٨٩ز لە الدقهلية لە میسر لە دایكبووە، لە یەكەمینەكانی ئەو كەسانەیە كە دژایەتی سوننەت و فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) یان كردووە و نكۆڵییان لێ كردووە ،لەم بارەشەوە كتێبێكی نووسی بەناوونیشانی:( أضواء على السنة المحمدیه) كە هەمووی هێرش بوو لەسەر سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ، و یەكێ لەوانەی دەستخۆشی لێ كرد و پیرۆزبایی ئاراستە كرد (طه حسين) بوو ، بە تایبەتیش دروشمی دژایەتیكردنی ئەبو هورەیرەی بەرزكردەوە ، لەوبارەشەوە كتێبێكی تەرخان كرد بە ناوونیشانی:

(أبو هريرة شيخ المضيرة) كە تێیدا ئەو هاوەڵە بەڕێزەی بە درۆ و بوختانكردن بۆ پێغەمبەر (ﷺ)تۆمەتباركرد بە بێ ڕەچاوكردنی هیچ ئەدەب و شەرمێك ، (محمود أبو رية)ئەگەرچی خۆی بەناو سونی بوو،

بەڵام بە شێوەیەکی گشتی داکۆکی لەسەر بیروباوەڕەکانی شیعەدەکرد لە میسردا وکتێبەکانیشی هەر لە ژیانی خۆیدا بە جیهاندا بڵاوبوونەوە و گەورەترین چاپخانەکانی بیروت و قاهیرە چاپیان دەکرد ،زۆرێك لە زانا هاوچەرخەکان بەرپەرچیان داوەتەوەو دەمکوتیان کردووە ، لەوانە: مصطفى السباعى لە کتێبی:

(السنة النبوية ومكانتها فى التشريع الاسلامي) ، هەروەها د. محمد عجاج الخطيب لە کتێبی (السنة قبل التدوين ) هەروەها:د. علي السالوس لە کتێبی : (الهجوم على السنة) ، هەروەها شێخ محمد علي الصابوني ، لە کتێبی (مكانة السنة في التشريع ) و..هتد.

شێخ(مُحمّدِ بنِ مُحمّدٍ المُختارِ الشنقيطيّ ) دەگێڕێتەوە

(أبو رية) لەسەرە مەرگیدا لە ساڵی ١٩٧٠دەیووت:

ئاە ئاە ئەبوهورەیرە ئەبوهورەیرە و دوای ئەوە گیانی دەرچوو، ئەوەش سەیر نییە کەرامەتێك بێت بۆ ئەو هاوەڵەی کە بەردەوام لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوو (ﷺ) ..

# ( أدونيس )



ناوی (علي أحمد سعيد)هـ و لە دایکبووی ساڵی ١٩٣٠ز لە سوریا ، هاوسەرەکەی ناوی (خالدة سعيد) ە کەلەسەر هەمان ڕێبازی مێردەکەیەتی وبە چالاکوانێکی دژ بە ئیسلام ناسراوە! ئەدۆنیس لەساڵی ١٩٧٣ز بڕوانامەی دوکتۆرای لە ئەدەب بەدەستهێناوە ،نامەی دکتۆراکەی ( الثابت والمتحول) جەنگێکیی ڕاگەیەنراو بوو لە دژی ئیسلام و زمانی عەرەبی بە ڕاشکاوی ، ئەدۆنیس بە مامۆستاو پێشەنگی حەداسییەکان دەژمێردرێت ، بەڵکو بە مامۆستای یەکەمیان دادەنرێت ، دەڵێت:

((..اكره الناس كلهم اكره الله و الحياة أي شيء يخافه من تخطاهم و مات..))

هەروەها وتوویەتی:

(.. مات إله كان من هناك يهبط من جمجمة السماء..)

تۆمەتبارە بەوەی کە بەرهەمی کەسانی تری داوەتە پاڵی خۆی و دزیویتی.

بە هۆی هەڵوێستەکانی لە دژی ئیسلام ڕێزی زۆری لێ دەگیردرێت لە لای سەرانی حەداسی و عەلمانیەت لە جیهاندا وچەندین خەڵاتی نێو دەوڵەتی پێ بەخشراوە،

لە کتێبەکانیدا و بە تایبەت لە (الثابت والمتحول) ستایشی هەموو کەسایەتییە مێژوویەکانی کردووە کە خاوەنی هەر هەڵوێستێك بن لە دژی ئیسلام و بە زانا وڕوناکبیر ژماردوونی.

بە هۆی هەڵوێستەکانی لە دژی ئیسلام ڕێزی زۆری لێ دەگیردرێت لە لای سەرانی حەداسی و عەلمانیەت لە جیهاندا وچەندین خەڵاتی نێو دەوڵەتی پێ بەخشراوە.

# ( قاسم أمين )



لە دایکبووی ساڵی ١٨٦٣ز لە میسر لە باوکێکی کورد و دایکێکی تورك ، نووسەر و کەسایەتییەکی بە ناوبانگە ،باوکی لە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی بوو لە شاری سلێمانی، بە سەر مەشقی بزوتنەوەی ڕزگارکردنی ئافرەتان دادەنرێت.

قوتابی (محمد عبده) بوو ، دەیەویست گونجان درووست بکات لە نێوان ئیسلام و شارستانی ڕۆژئاوادا لە ڕێگەی ئەنجامدانی کۆمەڵێك گۆڕانکاری لەسەر ژیان و بارودۆخی ئافرەت .

بەتایبەتی مەسەلەی سەرپۆش زۆر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە حجاب دابو نەریتێکی عەرەبەکان بووە وپەیوەندی بە ئیسلامەوە نییە پێویستە ئافرەت لەو کۆت وزنجیرە خۆی ئازاد بکات! پێی وابوو حوکمەکانی شەرع لە مەڕ سەرپۆش و تەڵاق و فرە ژنی و شتی لەو شێوە جێگیر نین و بە پێی سەردەمەکان قابیلی گۆڕان و دەستکاری کردنن ، بەوشێوازەی لەگەڵ بەرژەوەندی خەڵکیدا بگونجێن ،

بەم شێوەش ئیسلام لەگەڵ هەموو گەشەكردنێكی شارستانی وپێشكەوتنێك گەشەدەكات وپێشدەكەوێت ،

هەروەها پێی وابوو دەكرێت زۆرێك لە فەرموودەكانی پێغەمبەر (ﷺ) لابدرێن وكاریان پێ نەكرێت ، هەر بۆیە بانگەشەی ئافرەتی دەكرد بۆ فڕێدانی سەرپۆش ودەیووت: نهێنی پێشكەوتنی ڕۆژئاوا لە ئازادكردنی ڕەهای ئافرەتانداية ، ترسناكی بیروبۆچوونەكانی قاسم أمين لەوە خۆی دەبینییەوە بە ناو ئیسلامەوە قسەی دەكرد و ئەم لادانانەی خۆی لە شەرع بە چاكسازی دەزانی و هەموو ئەم بابەتە گومڕاكەرانەی لە كتێبی (تحرير المرأة) و (المرأة الجديدة) و لە نووسینەكانی تریدا باسكراون ، خەڵكیش لەو سەردەمە بەدەستی نەفامی زۆرەوە دەیانناڵاند و قاسم و هاوشێوەكانی بە ئاسانی لەخشتەیان دەبردن، لە تەمەنی چل و پێنج ساڵی و لە ساڵی ۱۹۰۸ز كۆچی دوایی كرد.

دوای ئەوەی ژیانی لە ڕێگەی هاندانی ئافرەتدا بەسەر برد بۆ فڕەدانی سەرپۆش و لاساییكردنەوەی ئافرەتانی ڕۆژئاوا لە هەموو شتیكدا..

# ( علي عبدالرازق )



لە ساڵی ١٨٨٨ز لە میسر لە دایکبووە ،هەر لە منداڵییەوە قورئانی لەبەر کرد و بڕوانامەی (العالمية)ی لە ئەزهەر بەدەستهێنا و ،دواتر بۆ خوێندن چووە زانکۆی ئۆکسفۆرد لە بریتانیا و لە پاش گەڕانەوەی بۆ میسر بە دادوەر دامەزرا.

بەوە ئەناسرێت کە نووسەری کتێبی (الإسلام وأصول الحكم)ە کە پاش یەك ساڵ لە ڕوخانی خیلافەتی ئیسلامی چاپی کرد و ئیدی لەو کاتەوە تاکو ئەم ڕۆژگارەی خۆمان هەرایەکی گەورەی لێ کەوتەوە، لەو کتێبەیدا بەکورتی دەڵێت:

هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر ئەوەی لە ئیسلامدا دەوڵەت بوونی هەبێت ،سیاسەتیش پێویستە لە دین جیابکرێتەوەو دوور بخرێتەوە ، خیلافەتیش بە درێژایی مێژوو لە خراپە زیاتر هیچ چاکەیەکی نەبووە ، ئەم کتێبە: بە یەکەمین کتێب دادەنرێت کە هەوڵیداوە بیرۆکەی عەلمانیەت بخاتە نێو شەرعی ئیسلامەوە و ویستوویەتی بڵێت:

جێگای ئیسلام تەنها مزگەوتەو هەندێ بواری کەسێتی وڕوحی دەگرێتەوە و بەهیچ شێوەیەك توانای بەڕێوبردنی کاروباری سیاسی ودونیایی خەڵکی نییە و خەڵکی خۆیان سەرپشکن بە چی شێواز و سیستمێك ژیانی خۆیان بەڕێوە دەبەن.

بە کورتی کتێبەکە هەوڵێکی سەرنەگرتوو بوو بۆ بە عەلمانی کردنی ئیسلام ، - یان بە بۆچوونی هەندێك -بۆ بەئیسلام کردنی عەلمانییەت ، لە لایەنی ئەزهەرەوە سەرەتا بەرپەرچ درایەوەو نووسەرەکەشی لە ئەزهەر دەرکرا ، دواتر زۆرێك لە زانایان بۆ ڕەددانەوەی کتێبی تایبەتیان نووسی ، بۆ نموونە:(نقض الإسلام وأصول الحكم)ی محمد الخضر حسين ،(حقيقة الإسلام وأصول الحكم) ی محمد بخيت المطيعي ، هەروەها محمد قطب و محمد الغزالي و زۆرێکی تر لە زانایان بەرپەرچیان داوەتەوە. (علي عبدالرازق) لە ساڵی ١٩٦٦ لە میسر کۆچی دوایی کردووە.

**ئەم کتێبە: بە یەکەمین کتێب دادەنرێت کە هەوڵیداوە بیرۆکەی عەلمانیەت بخاتە نێو شەرعی ئیسلامەوە.**

# ( طه حسين )



نووسەر وئەدیب و ڕەخنەگرێکی میسری زۆر بە ناو بانگە ، لە ساڵی ١٨٨٩ز لە دایکبووەو لە ساڵی ١٩٧٣ز کۆچی دوایی کردووە ، پێی خۆشبوو ناوی بە (طاها) بنووسرێت ، لە تەمەنی مناڵی باوکی هەموو قورئانی پێ لەبەرکرد ، لە تەمەنی چوار ساڵی تووشی نەخۆشی ئاوڵە بوو و چاوەکانی لە دەستدا ، کە گەورە بوو بۆ ماوەی چوار ساڵ لە ئەزهەر خوێندی. خۆی ئەڵێ: وەکو چل ساڵ بەسەمدا تێپەڕی ، دواتر نێردرایە فەرەنسا و بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێنا ،مامۆستای (الأدب العربي) و ڕاگری چەند کۆلێژێکی ئاداب بوو بۆ ماوەیەکیش وەزیری فێرکردن بووە لە میسر لە چەند کاتێکی جیاوازدا ، خاوەنی کتێبی (فی الشعر الجاهلي) ە کە هەرایەکی گەرەی لێکەوتەوە و قەدەغە کرا لە میسر ، تێیدا نکۆڵی کرد لە هەموو شیعرەکانی سەردەمی جاهیلی و

هەروەها نکۆڵی کرد لە هەبوونی دوو پێغەمبەر بە ناوی إبراهیم و ئیسماعیل ،ئەو دەیووت:

(**للتوراة أن تحدثنا عن إبراهيم وإسماعيل وللقرآن أن يحدثنا عنهما ولكن هذا لا يكفي لصحة وجودهما التاريخي**). بە گشتی لە سەر ڕێرەوی (دیکارت )بوو گومانی لە هەموو شتێك دەكرد.زۆر سەرسام بوو بە شارستانییەتی ڕۆژئاواو پێی وابوو پێویستە موسوڵمانان بۆ ئەوەی پێشكەون لە هەموو شتێكدا لاسییان بكەنەوەو شوێنیان بكەون،لە كتێبی ( **مستقبل الثقافة في مصر**) دەڵێت:

( **أن نسير سيرة الأوروبيين، ونسلك طريقهم لنكون لهم أنداداً، ولنكون لهم شركاء في الحضارة، خيرها وشرها، حلوها ومرها، وما يحب منها وما يكره، وما يحمد وما يعاب**) .خۆیشی ئەوەی پێیكرا لەو بوارەدا كردی ، داوای لە قوتابییەكانی دەكرد كە تەماشای قورئان نەكەن وەكو كتێبێكی پیرۆز كە قابیلی ڕەخنە نەبێت ، بەڵكوبەبێ ترس ڕەخنەی ئەدەبی لێبگرن، ئەمەش هەندێكە لە ڕاو بۆچوونەكانی:

-بە گومان بوو لەوەی قورئان فەرموودەی خوای گەورە بێت.

-نكۆڵی دەكرد لەوەی ئیبراهیم و ئیسماعیل پێغەمبەری خوا بن.

- پێی وابوو سەدەی دووەمی كۆچی ( كەسەردەمی هاوەڵان وتابعییەكان بوو)سەدەی بێ ڕەوشتی خراپەكاری بووە.

-پێی وابوو میسر پێویستە شانازی بە فیرعەونییەتەوە بكات نە ك ئیسلام.

-توێژینەوەیەكی دەربارەی (الضمائر) لە قورئاندا پێشكەش كرد و هەوڵی ناشیرینكردنی قورئانی پیرۆزیدا.

-پێی وابوو دژایەتی و نەگونجان هەیە لە نیوان زانست و دەقەکانی ئیسلامدا

ئەمانەوچەندین کارەساتی تر کە لەکتێبەکانیدا وەدی دەکرێت..لەگەڵ ئەوەشدا  هەندێ کتێبی ئسلامی نووسی بە تایبەت پاش ئەوەی فەتوای بێ دینی و لە ئیسلام دەرچوونی لە میسر و شوێنەکانی تر دەرچوو وەکو نیشاندانی پەشیمان بوونەوەو تۆبە کردن بەڵام بە بۆچوونی هەندێ لە زانا هاوچەرخەکان کتێبە ئیسلامییەکانی وەکو (على هامش السيرة) و ( الفتنة الكبرى)لە کتێبە نائیسلامییەکانی تری خراپترە چونکە پڕی کردن لە بۆچوونی دژ بە ئیسلام بە شێوەی ناڕاستەوخۆ..وەکوپاداشتێك بۆ هەڵوێستەکانی بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام( بێگومان خۆیشی ئەدیبێکی بە توانا بوو) لەبەر ئەوەش کە یەکەم عەمید بوو بۆ کۆلێژی ئاداب نازناوی ( عميد الأدب العربي) پێ بەخشرا. بۆ ناسینی زیاتر بڕوانە:

- (نقض كتاب في الشعر الجاهلي ) ی محمد الخضر حسين.
- ( فكر طه حسين في ضوء العقيدة الإسلامية ) ی فاطمة بنت حميد الحسني,( الوجه الآخر لطه حسين ) أنور الجندي.
- سایتی(ویكبیدیا).

# ( حسن فرحان المالكي )



بیرمەندو توێژەرێکی مێژوویی سعودیە ، لە دایکبووی ساڵی ١٩٧٠ز ، بەکالۆریۆسی لە ڕاگەیاندن وەرگرتووە لە زانکۆی (الإمام محمد بن سعود ) ناوبانگی لە وڵاتە عەرەبییەکان و جیهاندا بەوە دەرکردووە کە هەندێ بیرۆبۆچوونی خراپی دەربارەی هەندێك لە هاوەڵان هەیە ، بەتایبەتی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان (ڕەزای خوای لێبێت) ، بە لایەنگری فیکری شیعە تۆمەتبار دەکرێت و هەروەها بە یەکێك لە سەرانی قورئانییەکان دەناسرێت ، بە گشتی خاوەنی کۆمەڵێك بیروبۆچوونی تایبەتی خۆیەتی سەبارەت بە مێژووی سیاسی ئیسلام و لێکدانەوەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلام ، بەشداری زنجیرەیەك گفتۆگۆی لە کەناڵی (الوصال) کرد ، بەڵام پاش ئەوەی دەرکەوت کە بێ ڕێزی بەرانبەر هەندێ لە هاوەڵان کردووە لە ئەڵقەی سێیەمی زنجیرەکە لە لایەن پێشکەشکاری بەرنامەکە لە قسەکردن قەدەغە کرا ،

ئينجا بەهۆی ناوبانگ دەرکرنی و بڵاوبوونەوەی بیروبۆچوونە تێکگیراوەکانی لە گەڵ ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، ئەو لە لایەن زۆرێك لە نووسەران و زانایان لە سعودیە و وڵاتانی تر بەرپەرچ دراوەتەوە و کتێبی لەسەر نووسراوە ، بۆ نموونە:

(حراسة العقيدة /ناصر عبدالكريم العقل) (حقيقة حسن فرحان المالكي /أبي عبدالله الذهبي)(الانتصار للصحابة الأخيار في رد أباطيل حسن المالكي لعبد المحسن العباد)...هتد ناوبراو بە خۆێشی کتێبی زۆری هەیە، لەوانە:

-حرية الاعتقاد في القرآن الكريم والسنة النبوية.

نقض رأي ابن تيمية في إسلام معاوية.

-حسن الإجابة في عقيدة الإمساك عما شجر بين الصحابة.

-نحو إنقاذ التاريخ الإسلامي.

شایەنی باسە کە (حسن فرحان المالكي) بۆ ماوەیەك لە سعودیە زیندانی کراوە و دواتر پاش دە نگدانەوەی زیندانی کردنەکەی ئازاد کراوە ، یەکێ لەوانەش کە بەرگری لێ دەکەن و بیروبۆچوونەکانی پەسەند دەکەن دکتۆر (عدنان إبراهيم)ە.

# ( فرج فودة )



نووسەرو وبیرەمەندێکی میسرییە ، لە ساڵی ١٩٤٥ز لە (دمیاط) لە میسر لە دایکبووە ، دوکتۆرای فەلسەفەی هەیە لە ئابوری کشتوکاڵدا ، خاوەنی چەندین کتێب بوو کە تێیاندا هێرشی دەکردە سەر ئیسلام و،داوای جیاکردنەوەی دین ودەوڵەتی لەیەکتر دەکرد، هەمیشە لە نووسینەکانیدا جەختی دەکردە سەر تانەدان لە دەسەڵات و مێژووی ئیسلامی و سوکایەتی کردن بە سەرانی ناودارە ئیسلامییەکان بە تایبەت ئەوانەی داوای جێبەجێکردنی شەریعەتیان لە میسر و جیهانی ئیسلامیدا دەکرد ،کەئەمەش بووە مایەی پەیدا بوونی شەپۆلێکی نارەزایی و ڕەخنەگرتنی جەماوەری لە فەرەج فۆدە کە دواجار ئەزهەریش تێیدا بەشدار بوو ، ئەو مەترسی ئەوەی هەبوو دەوڵەتێکی دینی هاوشێوەی دەوڵەتی ئێران _ با سوننیش بێت - لە میسر درووست بێت، بۆیە بەردەوام حکومەتی لەو جۆرە مەترسیانە ئاگەداردەکردەوە .

هاتنی (جعفر النميري)ش لەسودان بە حوکمێکی ئیسلامی لە ١٩٨٣ز مەترسێکانی پتر کرد ، ئینجا بە پێی چەندین بەڵگە کە لە کتێبەکانیدا دەیخستە ڕوو پێی وابوو خیلافەتی ئیسلامی دەسەڵاتێکی سیاسی بووەوە هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نەبووە ،هەروەها پێی وابوو دەقەکانی قورئان و سوننەت دەکرێت دەسکاری بکرێن ، جگە لە بیروبۆچونی تایبەتی خۆی لە دژی زۆرێك لە چەمکە جیاجیاکانی ئیسلام و هاوکات لێکدانەوەی سەلبی خۆی هەبوو بۆ هەموومێژووی ئیسلام ، پێش کوژرانی بە ماوەیەکی کەم بە هاوبەشی لە گەڵ کەسایەتی کۆمۆنیستی بەناوبانگ(محمد أحمد خلف الله) مونازەرەیەکی لەگەڵ (محمد الغزالي و مأمون الهضيبي ومحمد عمارة ) ئەنجامدا بە ناوونیشانی:( مصر بين الدولة الدينية والدولة المدنية) کە زیاتر لە بیست هەزار کەس ئامادەی بوون، هەورووەها مونازەرەیەکی تریشی بەهەمان ناوونیشان و بەهاوبەشی لەگەڵ کەسایەتی عەلمانی بەناوبانگ(فؤاد زکریا )لەبەرانبەر (محمد عمارة و محمد سليم العوا) ئەنجامدا کە زیاتر لە چوار هەزار کەس ئامادەی بوون...لە ساڵی ١٩٩٢ز لەسەر دەستی گەنجێك بە ناوی ( عبدالشافي رمضان ) کوژرا کە دواتر ئەو گەنجە لە سێداه درا.

بۆزانیاری زیاتر بڕوانە:

- (الإنحراف العقدي في أدب الحداثة و فكرها).
- سایتی(ویكبیدیا)

# ( هدى شعراوي )



ناوی **( نور الهدى محمد سلطان)** هـ ، لە ساڵی ١٨٧٩ز لە میسر لە دایکبووە ، یەکێکە لە دیارترین ئەوانەی چالاکی بەرچاویان هەبووە لە بواری ئافرەتدا و هەمیشە هەوڵی داوە ئافرەتانی میسر و عەرەب بەگشتی شوێن پێی ئافرەتانی ڕۆژئاوا هەڵگرن ، لە کاتی گەڕانەوەی (سعد زغلول) لە ئەوروپا (هدى شعراوي) لە مەڕاسیمی پێشوازیەکەیدا سەرپۆشەکەی داکەند و خستیە ژێر پێی ، لەو ڕۆژەوە ئەو ئافرەتە کرایە سونبولی ئازادکردنی ئافرەت نەك هەر لەسەرپۆش بەڵکو لە هەموو شەرم و شکۆ وابەستە بوونێك بە ئیسلامەوە ، دواتریش لە ساڵی ١٩١٩زئەم ئافرەتە لە گەڵ (صفية) ی هاوسەری (سعد زغلول) و کۆمەڵێك ئافرەتدا وەکو نارەزایی دەربڕینێك بەرانبەر داگیرکەری ئینگلیزی ! سەرپۆشەکانیان لە گۆڕەپانێکی قاهیرە داکەند و سوتانیان و لەو ڕۆژەوە ئەو گۆڕەپانە ناو نرا (ميدان التحرير). دەربارەی ئەو ڕوداوەش (حافظ إبراهيم) ی شاعیر وتوویەتی:

**(خرج الغو اني يحتججن ورحت أرقب جمعهنه)**

لە ساڵی ١٩٢٣ز ئامادەی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی ئافرەتان بوو لە ئیتاڵیا و لەوێ تەوقەی لەگەڵ هەموو ئەندامانی کۆنگرەکە کرد و سێ جاریش چاوی بە (موسولینی) کەوت.

لە پاش گەڕانەوەی بۆ میسر یەکێتی ئافرەتانی دامەزراند، لە ساڵی ١٩٤٤ز کۆنگرەیەکی بەست لەسەر ئاستی دەوڵەتە عەرەبیەکان و چەند بڕیارێکیان دەرکرد، لەوانە:یەکسانکردنی ئافرەتان و پیاوان لە مافەکاندا بەتایبەتی مافی سیاسی ، سنوردارکردنی (طلاق) ،سنوردارکردنی دەسەڵاتی باوك و برا ومێرد وبراگەورە بەسەر ئافرەتاندا ، سنوردارکردنی فرەژنی ، تێکەڵکردنی کوڕان و کچان لە قوناغی سەرەتایی ،هەورەها پێشنیاریان کرد بۆ (مجمع اللغة العربية) وشەی ( نون النسوة) لە زمانی عەرەبی هەڵگرن.

لەکۆنگرەیەکدا لە ئیستەمبول چاوی بە ئەتاتۆرك کەوت و پێی وت: ئەگەر تورکەکان تۆیان بەباوکی خۆیان داناوە ئێمەش بە (أتاشرق) واتە: باوکی ڕۆژهەڵاتت دادەنێین، لە درێژەی هەوڵەکانیشی بۆ ئازادکردنی ئافرەت! ئامادەی چەندین کۆنگرەی نێودەوڵەتی بووە لە پاریس و ئیمستردام و بەرلین وشوێنەکانی تر ، هەمیشە وەکو ئافرەتێکی موسوڵمانیش ئەم کارانەی کردووە! هەر بۆیە لە لایەن حکومەتە یەك بەدوای یەکەکانی میسر ودەوڵەتە عەرەبەکان و بەڵکو جیهانیش بە پێشەنگ و ڕابەری مافەکانی ئافرەت دادەنرێت چونکە لە ڕوانگەی عەلمانییەکانەوە ئیسلامەتی بەو شێوە باشە و قبوڵ دەکرێت.( هدى شعراوي) لە ساڵی ١٩٤٧ز بە سەکتەی دڵ لە دنیادەرچووەو ڕوبەڕووی لێپرسینەوەی پەروەردگاری بوەتەوە.

# ( محمد أحمد خلف الله )



ئەدیب و زانایەکی ناوداری زمانی عەرەبییە ، لە ساڵی ١٩٠٤ز لە میسر لە دایکبووە ، فەلسەفەو دەروونناسی لە لەندەن تەواو کردووە ، دواتر لە ١٩٤٧ بووەتە ڕاگری کۆلێژی ئاداب لە ئیسکەندەرییە ،جگە لەوەش بە هۆی ڕۆڵی زۆری لە دژایەتی و هەوڵدان بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام پۆست و پلەو پایەی زۆری پێ سپێردراوە لە میسر ئەومامەڵەیەکی مادی پەتی لەگەڵ ئیسلام دەکرد بە واقیعێك دایدونا پێی وابوو پێویستە بوشێوەیەکی گونجاو مامەڵەی لەگەڵ بکرێ ،خۆی لە بنچینەدا باوەڕی بە ڕابوونێکی چاکسازی هەبوو لە بیری مارکسیدا لەو سۆنگەشەوە پێی وابوو هەندێ لە چەمکەکانی ئیسلام پێویستە بەکاربهێنرێن بۆ ئەو مەبەستە!و سەرخستنی ئەو پرۆژەیە ، بۆیە گومڕای ناودار ( محمد أرگون) پێی وابوو کەس وەکو ( محمد أحمد خلف الله ) باش لە ئیسلام تێنەگەیشتووە!

هەروەها بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە قورئان بەسە بۆ چاکسازی و تێگەشتن لە ئیسلام بەمەش سەرەڕای ئەوەی کە مولحید بوو هاوکات یەکێکیش بووە لەسەرانی قورئانییەکان کە لێرەو لەوێ لە کوردستاندا بوونیان هەیە ، ئەو سوننەتی وەردەگرت تەنها لە حاڵەتێکدا بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ قورئان جیاوازی نەبێت و هەردوو دەقەکە پشتگیری یەکتر بکەن ، سەبارەت بە قورئانیش هەموو تەفسیرێکی رەتدەکردەوە و تەنها بە موفرەداتی ( الراغب الأصفهاني ) ڕازی دەبوو کە بریتییە لە شەرحی زمانەوانی وشەکان، کۆمەڵێ هەوڵی لەبواری نوسینەوە داوە بۆ تێکدانی چەمکەکانی ئیسلام لە زەینی خەڵکیدا لەوانە: "دراسات في الأدب الإسلامي"."وثائق من الأدب الإسلامي السياسي""الفن القصصيّ في القرآن الكريم" لە ساڵی ١٩٨٣ز پاش ئەوەی لە لایەن دەوڵەتی میسری و ناوەندە عەلمانییەکانی جیهان بە پاڵەوانی داهێنان و تێگەیشتنی هاوچەرخ لە قورئان ناسێندرا وچەند خەڵاتی گەورەی پێدرا ،بەرەو لای پەروەردگاری بەڕێکەوت.

# ( نجيب محفوظ )



ڕۆماننوسێکی میسری زۆر بەناوبانگە ، لە دایکبووی میسرە لە ساڵی ١٩١١ز،یەکەمین ئەدیبی عەرەبە کە خەڵاتی نۆبڵ ی بە دەست هێنابێت ، نزیکەی (٥٢) ڕۆمانی هەیە ،

لێوان لێون لە دوو بابەت : بێباەڕی و جنس ،

لەوانە:

- همس الجنون (١٩٣٨م)
- عبث الأقدار (١٩٣٩م)
- رادوبيس (١٩٤٣م)
- القاهرة الجديدة (١٩٤٥م)
- خان الخليلي (١٩٤٥م)

- زقاق المدق (١٩٤٧م )
- بداية و نهاية (١٩٥٠م )

الثلاثية :

- بين القصرين (١٩٥٦م )
- قصر الشوق (١٩٥٧م )
- السكرية (١٩٥٧م ) ،

بەڵام بەناوبانگترین ڕۆمانەکانی کە بەو هۆیەشەوە خەڵاتی نۆبڵ ی پێ بەخسرا ، بریتیە لە ( أولاد حارتنا) کە لە ڕێگەی هەندێ هێمای ئایینیەوە شەڕێکی لە دژی ئیسلام بەرپاکرد و هەرایەکی نایەوە کە شوێنەوارەکەی تاکوئێستاش هەر ماوەتەوە ،

لەو ڕۆمانەدا کە بریتیە لە دوو بەش کەسایەتیە سەرەکیەکانی بەشی یەکەم پێکهاتوون لە: ( الجبلاوي) و مەبەستی پێی خوای گەورەیە ، هەروەها کوڕەکانی (الجبلاوي) کە بریتین لە: (أدهم: واتە: ئادەم عليه السلام، (جبل) واتە: موسا عليه السلام، (رفاعة) واتە: عيسى عليه السلام، (قاسم) واتە: پێغەمبەر (ﷺ) .

بەشی دووەمیشی تەرخان کردووە بۆ ( عرفة) کە مەبەستی پێی زانستی هاوچەرخە و دواتر دەبێە هۆکاری مردنی ( الجبلاوي) واتە: کۆتایی هێنان بە ڕۆڵی دین لە ژیانی خەڵکیدا...

بەگشتی ئەم نوسەرە بە شێوازی ڕەمز و ناڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ئیسلام بووەتەوە ئەگەر چی جاری وا هەیە هەموو کەسێك لێی تێدەگات مەبەستی چییە؟ دژایەتی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی ئەدەبی جنسی لە (سلامة موسى)وە فێر بوو کە بە مامۆستای مەزنی خۆی وەسفی دەکات ، لە زۆربەی ڕۆمانەکانیدا دەڵێت: ناکۆکی لە نێوان ئایین و زانستدا هەیە ، چاەسەریش ئەوە دەستبەرداری ئایین بین ، لە ساڵی ١٩٩٥ز هەوڵێکی کوژرانی لەلایەن دوو گەنجەوە درا و بەسەختی بریندار بوو ، لە ساڵی ٢٠٠٦ لە دونیا دەرچووە .بۆ زیاتر ناسینی ئەم کەسایەتیە، بڕوانە:

- أدب نجيب محفوظ وإشكالية الصراع بين الإسلام والتغريب ، للدكتور سيد أحمد فرج
- الصحافة والأقلام المسمومة ، أنور الجندي.
- أعلام وأقزام ، للدكتور سيد العفان.

# ( حسن الترابي )



ناوی **(حسن عبدالله الترابي)** ه ، سودانیه و لەوێ لە ساڵی ١٩٣٢ز لە دایکبووە ،دکتۆرای لە یاسای نێو دەوڵەتی هەیە لە زانکۆی سۆربۆن لەفەرەنسا ، چوار زمان بەباشی دەزانێت: عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی.مامۆستا ودواتر ڕاگری کۆلێجی ماف بووە لە زانکۆی خەرتوم و دواتر وەزیری داد ودەرەوەو و سەرۆکی پەرلەمان بووە لەسالی ١٩٩٦ز ،نووسینی زۆری هەیە ، لەوانە: (تجديد الدين) (تجديد الفكر)( التفسير التوحدی).بیرۆبۆچوونی زیاتر لەگەڵ موعتەزیلە و قورئانییەکان دەگونجێ و لادەکانی لە عەقیدە و شەرع وفیکری ئیسلامی ئەوەندە زۆرن مەگەر لە کتێبێکی سەربەخۆ باسی بکەین.

بەڵام دەکرێ لێرە تەنها بە ئاماژەکردن ئاماژە بکەین بۆ هەندێکیان کە ئەو پێی وایە:

١- موسوڵمان بۆی هەیە لە ئیسلام پاشگەزبێتەوە.

٢- کۆبوونەوەی ئایینەکان پێکەوە لە ژێر یەك ناودا!

٣- دەڵێت قورئان و سوننەت بەسمان نییە و ئەو بۆچوونە وەهمە!

٤- دین شێوازی کۆتایی خۆی لە هیچ سەردەمێکدا وەرنەگرتووە تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) .

٥- بانگەشە کردنی ئاشکرای بۆ ڕێڕەوی موعتەزیلە.

٦- ڕەتکردنەوەی بۆ تەفسیری پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەم سەردەمە، وەکو وتوویەتی:

(الرسول بشر مثلنا يُوحى إليه، ما حَيْفَسر القرآن لهذا اليوم، لأنه لا يعرف هذا اليوم).

٧- لێکدانەوەی قورئان بەشێوازێکی تازەو جیاواز.

٨- باوەڕی بەتازەگەری هەیە لە عەقیدە.

٩- بانگەشەکردن بۆ ئەوەی دیموکراسیەت بکرێتە دادوەر بۆ چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان.

١٠-باوەڕی بە تەفسیرێکی پێشکەوتوو هەیە بۆ ئیسلام کە - بۆ نموونە- سزای حەدی تێدا نییە .

١٠- دەڵێت جیهاد حاڵەتێك بوو ڕابورد و تەوا بوو.

١١- پێی وایە یاری تۆپی پێ جیهادە لە پێناو خوای گەورە!

١٢- سوکایەتی کردنی بەو کەسانەی بایەخ بە پرسەکانی عەقیدە دەدەن.

١٣- تانەدانی لە دادگەریی هاوەڵان.

١٤- ئیجتیهاد مەرج نییە پابەند بێت بە دەقە شەرعییەکانەوە!

١٥- پێی وایە ئیجماع بەواتای ڕاپرسی گشتی دێت.

١٦- پێی وایە شیعەو سوننە ٩٥ لە سەد تەبان ناکۆکی نییە لە نێوانیاندا.

١٧- دەڵێ من سونی نیم و نازانم سونی و شیعە چییە!

١٨- پێی وایە عارەق خواردن نابێتە تاوان ئەگەر دەستدرێژی تێدا نەبێ.

١٩- پێشنوێژی ئافرەتان بۆ پیاوان بە جائیز دەزانێ.

٢٠- تەوقەکردنی پێ جائیزە لەگەڵ ئافرەت و هەروەها پێی جائیزە ئافرەت بکرێت بە سەروك.

٢١- تانەدان لە کتێبەکانی تەفسیر و ئینکارکردنی زۆر پرسی جێگیر لە قورئان وسوننەت لەگەڵ دەیان شتی تری لەم شێوەو خراپتر.، لەسەر هەموو ئەم بۆچوونانەشی بەڵگەی ڕاشکاوم لایە لە قسەی خۆی بەڵام دووروودرێژن ناشێن بۆ ئێرە.

# ( جميل صدقي الزهاوي )



شاعیرێکی عێراقی بە ڕەگەز کوردە لە بنەماڵەی زەهاوە ،دەوترێتیش لە بنەماڵەی بابانییەکانە ، مامی کەسایەتی ئیسلامی بەناوبانگ ( أمجد الزهاوي)ە ،لەدایکبووی ساڵی ١٨٦٣ز ، لەلای باوکی و زانایانی سەردەمی خۆی خوێندوویەتی ، لەزۆر شوێن مامۆستایی کردووەو ، دواتر سەردانی ئەستەمبەڵی کردووە و بە کەسایەتیە سیاسی و فیکرییەکانی ئەوێ سەرسام بووە ، دوو جار بووەتە ئەندام لە پەرلەمانی ئەو سەردەمە ( مجلس الأعيان)شیعرەکانی بە هەردوو زمانی عەرەبی و فارسی نووسیوە ، زەهاوی زۆر بە خۆی سەرسام بوو ، هەمیشە حەزیشی بە جیاوازی دەکرد لە گەڵ خەڵکیدا ،هەروەها بانگەشەی فەیلەسوفی وگەردووونناسی دەکرد ،شیعرەکانی وەکو - وليد الأعظمي - دەڵێت وشك و ناخۆش بوو ، باسی زانست و بیردۆزەکانی تێدا دەکرد ،

هەروەها بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە ئیسلامی دەدا و هەوڵی ناشیرینکردنی لە ڕێگەی شیعرەکانیەوە دەدا ، پێش هەموو شتێکیش بەوە دەناسرا بانگەشەی ئازادکردنی ئافرەت دەکات وداوای فرێدانی سەرپۆشیان لێ دەکات و بەڵکو بگەنە کاروانی ڕۆژئاوادا ، ،وەکو وتوویەتی:

**مزقي يا ابنة العراق الحجابا أسفري فالحياة تبغي انقلابا**

**مزقيه واحرقيه بلا ريث فقد كان حارسا كذابا**

ئەو پێی وابوو دوو هۆکار هەیە بۆ دواکەوتنی موسوڵمانان: سەرپۆشی ئافرەت و بەکارهێنانی زمانێکی تر جگە لەو زمانەی کە لە ژیانی ڕۆژانەدا قسەی پێدەکەن مەبەستی پێویستی لابردنی زمانی عەرەبی بوو. لەلایەن کەسایەتی ناوداری دژە ئیسلام (طه حسين) بەوە ستایش دەکرا مەعەڕی سەردەمی خۆیەتی و شاعیری عەقڵە و سەربە ڕۆژئاوایە لە زانستەکانیدا. زەهاوی خۆی دەربارەی خۆی وتوویەتی: (**كنت في صباي أُسمى (المجنون) لحركاتي غير المألوفة، وفي شبابي (الطائش) لنزعتي إلى الطرب، وفي كهولي (الجرىء) لمقاومتي الاستبداد، وفي شيخوختي (الزنديق) لمجاهرتي بآرائي الفلسفية**) واتە: خۆی بەوەی زانیوە کە لەدوادواییەکانی ژیانیدا بە زندیق و بێ دین ناسراوە بەهۆی بۆچوونەکانی! هەروەها بە دژایەتی کردنی شێخ (محمد بن عبد الوهاب) یش دەناسرا وکتێبێکی لە دژی نووسیوە.

جطة لەوانەش شەڕو ناحەزیەکی زۆریشی هەبوو لە گەڵ (معروف عبد الغني الرصافي) شاعیر سەرەڕای ئەوەی کە هەردوکیان سەبارەت بە بانگەشەی ئازادی ئافرەت و سەرسام بوون بە ڕۆژئاوا و ڕەخنەگرتن لەئیسلام لەسەر یەك ڕێڕەو بوون.

دیوانەکەی زەهاوی پڕە لە بیرۆکەی فەلسەفی و بێ باوەڕی و ڕەخنەگرتن لە ئیسلام و داوای سەرپۆش فرێدان لە ئافرەتان و گەشتن بە کاروانی خەڵکی ڕۆژئاوا.

لە ساڵی ١٩٣٦ز لە بەغدا کۆچی دوایی کرد ، شایەنی باسە کە (أمجد الزهاوي) برازای ئامادە نەبوو لەگەڵ تەرمەکەی بچێتە گۆڕستان چونکە وەکو کەسێکی زندیق تەماشای دەکرد.

**دیوانەکەی زەهاوی پڕە لە بیرۆکەی فەلسەفی و بێ باوەڕی و ڕەخنەگرتن لە ئیسلام و داوای سەرپۆش فرێدان لە ئافرەتان و گەشتن بە کاروانی خەڵکی ڕۆژئاوا.**

# ( أحمد صبحي منصور )



کەسایەتییەکی میسرییە لە ساڵی ١٩٤٩ز لە دایکبووە ، بەسەر گەورەی قورئانییەکان دەژمێردرێت ، جێگری سەرۆکی ناوەندی «مركز التعددية الإسلامية» ی ئەمریکییەکە لایەن هەندێ لەسەرانی ئەمریکاوە پشتگیری دەکرێ وەکو بول (وولفووتیز ) جێگری وەزیری بەرگری ئەمریکا ، دکتۆرای لە مێژووی ئیسلامدا هەیە لە ئەزهەر وهەر لەوێیش بۆ ماوەی چەند ساڵێك مامۆستا بووە ، بەڵام دواجار فەتوای بێباوەربوون و هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام دەرکرا و لە مامۆستایی فەسڵ کرا بەهۆی بیروباوەڕەکانی سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی سوننەت وبانگەشە کردن بۆ ئەوەی تەنها قورئان سەرچاوەی ئایین بێت نەك سوننەت!

لەساڵی ٢٠٠٠ز پاش ئەوەی بیروبۆچوونە نامۆکانی بە هیچ شێوەیەك پێشوازی لێنەکرا کۆچی کرد بۆ ئەمریکا و بووە مامۆستا لە زانکۆی هارفەرد .

بۆچوونی جیاوازی لەگەڵ مەنهەجی ئەهلی سوننەت زۆرە ، لەوانە :

- هەموو ئەوە حوکمانەی لە سوننەتدا هاتوون ئەگەر دەقی قورئان ڕاستەوخۆ پشتگیری نەکات ڕە تیان دەکاتەوە.

- لە چاوپێکەوتنەکانی لە یوتیوب بە ئەوپەڕی بێ ئەدەبی و بە سوکایەتی باسی هاوەڵان و سەرانی سەلەف دەکات.

-پێی وایە پێغەمبەر (ﷺ) نەخوێندەوار نەبووە!

-دەڵێ حیجاب و نیقاب بوونی نییە لە شەرعی ئیسلامدا!

- پێی وایە هەموو پێشەوایانی فەرمووده درۆزن بوونە ، بە تایبەتی پێشەوا بوخاری بەردەوام لە یوتیوب هێرشی دەکاتەسەر و بە درۆزنی ناو دەبات.

-دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) کۆتای پێغەرمبەران نییە.

-رەتکردنەوەی هەموو تەفسیر ومێژوو وقسەی سەلەف کە لەقورئاندا نەهاتبێت.

-دەڵێت: فتوحاتی ئیسلامی داگیرکردن بووە لەبەر بەرژەوەندی مادی موسوڵمانان!

لەگەڵ کۆمەڵێك زۆری قسەی تر کە لە بازنەی ئیسلامدا جێگای نابێتەوە.

بە کورتی ئەم ناوبراوە بە هەمووعەقڵییەوە ڕووبەڕووی مێژوو وکەلتوری ئیسلام بووەتەوە بە ناو ئیسلامەوە گوایە ئەو وقورئانییەکان باش لە دین حاڵی بوونە! لە ئەنجامی ئەم قەناعەتەوە زۆربەی حوکمەکانی ئیسلامیان ڕەتکردەوە.

**لە مامۆستایی فەسڵ کرا بەهۆی بیروباوەڕەکانی سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی سوننەت وبانگەشە کردن بۆ ئەوەی تەنها قورئان سەرچاوەی ئایین بێت نەک سوننەت!**

# ( السيد أحمد خان )



بەسەر گەورە و داهێنەری بیرۆکەی قورئانییەکان (نکۆڵیکەران لە سوننەت) دەژمێردێت لە سەدەی نۆزدەیەمی زاینی،لە هیندستان لە شاری دلهی لەساڵی ١٨١٧ز لە دایکبووە ، هەندێ لە نووسەران بە چاکسازێکی گەورە دەیناسێنن، لە خێزانێکدا پەروەردە بوو کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی تۆکمەیان لە گەڵ مەگۆلەکان هەبوو کە حوکمی هیندیستانیان دەکرد پێش داگیرکردنی لە لایەن بریتانیەکانەوە. بانگەشەی نوێکردنەوەی بیروهزری ئیسلامی دەکرد ، هاوکات خاوەنی کۆمەڵێك بیروبۆچوونی تایبەت بوو بە خۆی بە پێچەوانەی زانایانی ئیسلام هەربەو هۆیەشەوە تەکفیر کرا لەلایەن هەندێ لە زانایانەوە..

لە بۆچوونە نامۆکانی:

پێی وابوو قورئان بەواتاکانی دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر (ﷺ) نەك بە وشەوتەعبیرەکانی! هەروەها پێی وابوو بە پێی ئایەتەکان جائیز نییە کەس لە یەك ژن زیاتر بهێنێ ، باوەڕیشی بە بوونی جن نەبوو.

پاش مانەوەی زیاتر لە ساڵێك لە لەندەن گەڕایەوە هیندیستان و زانکۆی (علیکرە) ی دامەزراندن و مامۆستایانی ڕۆژئاویی بۆ بانگهێشت کرد بەو هیوایەی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا بگوێزێتەوە بۆ ئەوێ. یەکێکە لەوانەی ئەحمەد ئەمین لە کتێبی (زعماء الإصلاح)دا باسیکردوون.

**خاوەنی کۆمەڵێك بیروبۆچوونی تایبەت بوو بە خۆی بە پێچەوانەی زانایانی ئیسلام هەربەو هۆیەشەوە تەکفیر کرا لەلایەن هەندێ لە زانایانەوە.**

# ( غلام أحمد برويز )



لەساڵی ١٩٠٣ز لەناوچەی (باتالا) لە هیندستان لەدایكبووە ، لە خوێندندا زیاتر لە ناوەندی پێ تەواو نەكرا ،یەكێكە لە سەران ودامەزرێنەرانی بیرۆكەی قورئانییەكان ، واتە:ئەوانەی باوەڕیان بە فەرموودەو سوننەت نییە، یەكێك بوو لەوانەی لە ئەبولئەعلای مەودودی نزیك بوون و دواتریش پاش سەربەخۆیی پاكستان لەلایەن (محمد إقبال) ە وە پشنیار كرا بۆ كاركردن لەوەزارەتی ناوخۆ ،ئەم ناوبراوە نكۆڵی لە وەرگرتن و كاركردن بە سوننەت دەكرد بە هەموو شێوازێك ، قورئانی بە تاكە سەرچاوەی شەرع دەزانی ( ئەویش بە پێی تێگەیشتنی تایبەتی خۆی) ، باوەڕی بە بوونی ئادەم و حەوا ، بەهەشت و دۆزەخ ، مەلائیكەتەكان نەبوو، هەروەها قەزاوقەدەری بە پیلانێكی مەجوسی دەزانی! لەوانەش سەیرتر ، پێی وابوو هەر سەردەمێ بۆ خۆیان دەتوانن حوكمی گونجاو لە قورئان دەربهێنن وەكو چۆن پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵان حوكمی گونجاویان بۆ سەردەمی خۆیان دەرهێنا! پێویستیش ناكات كەس پابەند بێت بە حوكمە شەرعییەكانی سەرەتای ئیسلام یان هەر سەردەمێكی تر! لەسەر

ئەم بۆچوونانەوچەندین تێگەیشتنی لارو نارێکی تر کە هەیبوو وترسناکی زۆریشی هەبوو لەسەر موسوڵمانان ،شێخ ئەبولئەعلا وقوتابیەکانی لە لاهورەوە بەرپەرچیان دایەوەو هەروەها زیاتر لە هەزار زانای هند و باکستان و حیجاز فەتوای دەرچوونی ئەویان دا لە بازنەی ئیسلام ، ئینجا دەستەی گەورە زانایانی سعودیە و بەتایبەتیش شێخ (ابن باز) ڕەحمەتی خوای لێبێت فەتوای لە ئیسلام دەرچوونی (غلام أحمد برويز) ی دەرکرد و لە کۆتایی فەتواکەیدا فەرمووی:

**(وأرجو أن يكون فيما ذكرته كفاية للقارئ والمستفتي؛ لأن كفر هذا الملحد [غلام أحمد برويز] على حسب ما ذكر من آرائه ومعتقداته يعلم بالبداهة لعامة المسلمين فضلاً عن علمائهم، فلا ضرورة إلى بسط الأدلة عليه، ونسأل الله أن يعافي المسلمين من شره وأمثاله).**

(غلام أحمد برويز) لە ساڵی ١٩٨٤ز نەخۆشکەوت و لە ساڵی ١٩٨٥ز مرد گەڕایەوە لای خوای تعالی ،کرد و مناڵیشی لێ بەجێ نەما.

# ( رشاد خليفة )



یەکێکی ترە لە سەران ورێپیشاندەرە بە ناوبانگەکانی کۆمەڵی قورئانییەکان لەسەر ئاستی جیهان ، لە ساڵی ١٩٣٥ز لە خێزانێکی ناسراو بە (تصوف ) لە میسر لە دایکیووە ، لە ساڵی ١٩٥٩ز کۆچی کردووە بۆ ئەمریکاو دکتۆرای لە ( الكيمياء الحيوية) بەدەستهێناوەو ناسنامەی ئەمریکی لەوێ وەرگرتووە، سەرەتا قورئانی پیرۆزی وەرگێڕاوە سەر زمانی ئینگلیزی و تاکو ئێستاش بە باشترین وەرگێڕان دەژمێردرێت ، ماوەیەك (خبير )بوو لە نەتەوە یەگرتووەکان و دواتر بوو بە پێشنوێژووتارخوێنی مزگەوتێك لە ئەمریکا و چاپخانەو ئامێر و پارەی زۆری لەبەر هستدا بوو ،لە ساڵی ١٩٧٤ز بیردۆزەی ئیعجازی ژمارە (١٩) ی ڕاگەیاند لە قورئاندا وچەندین کتێبی لەو بارەوە نووسی ، سەرەتا هەندێ لە زانایانی سوننە پێی هەڵخەڵەتان وپێشوازیان لەباسەکانی ئیعجازی ژمارە(١٩) وباسەکانی تری خەلیفە کرد ،

یەکێ لەوانە شێخ (أحمد ديدات) بوو کە کتێبێکی خەلیفەی لەو بارەوە تەرجەمە کرد بۆ زمانی ئینگلیزی ، بەڵام پاش ئەوەی لابردنی سوننەتی ڕاگەیاند و وتی:

تەنها قورئان بەسە بۆ موسوڵمانان ، هەروەها وتی سوننەت لە شەیتانەوەیە و ئیمامی بوخاری بە کافر ناساند، متمانەیان لێ وەرگرتەوەو فەتوای لە ئیسلام دەرچوونی لە لایەن (عبدالعزيز بن باز) و(يوسف القرضاوي) و زۆر زانا و لایەنی ترەوە دەرچوو ، بەتایبەتی دوای ئەوەی پێغەمبەرایەتی خۆی ڕاگەیاند بە پێی ئایەتی (٨١) ی ال عمران خۆی ناساند بە "رسول الميثاق" وتی: محمد (ﷺ) ( آخر النبيين ) نەك (آخر المرسلين)! هەروەها ڕایگاند کە موعجیزەی ئەو ژمارە نۆزدەو کۆمپیوتەرە لە موعجیزەی پێغەمبەرانی پێش خۆی مەزنترە چونکە دیارە و ئاشکرایە ، هەروەها لە ساڵی ١٩٨٩ز پێش کوژرانی بە چەند مانگێك وتی:(إن شهادتكم وصلاتكم صيامكم وزكواتكم وحجكم غلط ، ووظيفتي كرسول أن أصححها لكم) واتە: شایەتمان ونوێژ و ڕۆژوو زەکات وحەجتان هەڵەیە ومن وەکو ڕەوانەکراوێکی خوا بەئەرکی خۆمی ئەزانم بۆتانی ڕاست بکەمەوە!

لە ساڵی ١٩٩٠ز و لەتەمەنی پەنجا و چوار ساڵیدا لە شاری توسان لە ویلایەتی ئەریزونا و لەسەر دەستی موسوڵمانێکی ڕەش پێستی ئەمریکی لە ناو مزگەوتەکەی خۆیدا بە چەقۆ کوژرا.

# ( معمر القذافي )



قەزافی هەرچەند کەسێکی زۆر بەناوبانگە بەڵام لەو ڕوانگەی کە لێرە باسی دەکەم ناسراو نییە بۆیە بە کورتی دەڵێم : ناوی **( معمر محمد عبدالسلام)** و لە دایکبووی ساڵی ١٩٤٢ز لە لادێیەك لە(سرت) بەناوی (جهنم) لە ١٩٦٦ز لەنێردەیەکی سەربازیدا ڕۆیشتە بریطانیا ، لە ١٩٦٩ز بەهاوکاری چەند ئەفسەرێك کودەتایان کردە سەر (الملك إدريس الاول) و بوو بە سەرۆك کۆماری لیبیا هێشتا تەمەنی نەگەشتبووە سی ساڵی ، لە ساڵی ٢٠١١ بە دەستی شۆڕشگێڕان لە لیبیا کوژرا.

بێگومان لای زۆرێك لە ئێوەی بەڕێز سەیرە کە سێکی ستەمکاری بەدناوی وەکوسەرۆکی پێشووی لیبیا یەکێك بێت لەوانەی بانگەشەی ڕەتکردنەوەی سوننەتی کردبێت ،لەوانەیە بڵێن ئەوچیدابوو لەم باسە لە بنچینەوە ، دەی هەروا بوو ،

قەزافی جارِی کارنەکردنی بە سوننەت ئاشکرا کرد و بە ئارەزووی خۆی سوکایەتی بە فەرموودەکان وهەندێ لەهاوەڵان دەکرد بەتایبەتی( أبوهريرة) و معاوية) و ( أبو سفيان) ..هتد و هەمان گوتاری قورئانییەکانی هەبوو ، لە ( الكتاب الأخضر) یشدا بنەمای ( القرآن شريعة المجتمع) ی ڕاگەیاند ، خۆی دەڵێت:

(**إذا اتى واحد وقال لنا؛ ان حديث النبي لا بد ان تقدسوه وتعملوا به مثل القرآن، فهذا شرك، وهذا كلام ربما يكون غريباً،** )

هەروەها بە بێ ڕەچاوکردنی هیچ ئەدەبێك دەیوت:

(**لا نستطيع مثلما تأتي لنا بحديث وتقول؛ هذا الحديث رواه النبي، لا نستطيع ان نعرف هل هذا الحديث اختلقه معاوية أم قاله النبي فعلا؟ أم اختلقه سجاح أم قاله أبو سفيان أم أبو لهب؟ لا نعلم، لأن هناك الآف الأحاديث عليها علامة استفهام، يا ترى أياً منها قاله النبي فعلاً**)..

کاتێك پرسی ئینکارکردنی قەزافی بۆ سوننەت سەریهەڵدا وزانرا ، لیژنەیەکی باڵا لە پێنج وڵات پێکهات کە بریتی بوون لە:(صالح بن محمد اللحيدان ، أبي بكر محمود جومي ، أحمد الحماني ، علي محتار) لیژنەکە چاویان بە قەزافی کەوت و بەقورئان وفەرموودەو قسەی زانایان ئامۆژگارییان کرد ، ئەویش نکۆڵی کرد لەوەی نوێژی عەسری کردبێتە دوو ڕکات ووشەی (قل) ی لە قورئان لابردبێت ،

بۆ وەفدەکەشی ڕوونکردەوە کە ئەو تەنها باوەڕی بە سوننەتی فیعلی هەیە وەکو نوێژ و حەج ، بەڵام سەبارەت بە سوننەتی قەولی تەنها کار بەو فەرموودانە دەکات کە بە ڕاستی دەزانێ،جا تەماشاکە!

من وەکو خۆم کە زانیم قەزافی قورئانی بووە ئەم دوو بەیتە شیعرەم بیرکەوتەوە :

فلوْ أني بليتُ بهاشميٍّ ** خُؤُولتُه بنُو عَبدِ المَدانِ

لهان ما ألقى ولكن ** تعالوا انظروا بمن ابتلاني

بۆ زانیاری زیاتر ،بڕوانه:

- (القذافي مسيلمة العصر/عبد الرحمن حسن).
- سایتی (ویکبیدیا)

**نکۆڵی کرد لەوەی نوێژی عەسری کردبێتە دوو ڕکات**

**ووشەی (قل) ی لە قورئان لابردبێت**

# ( محمد شحرور )



مامۆستای ئەندازیاری شارستانی یە لە زانکۆی دیمەشق ، سوریە ولە دایکبووی ساڵی ١٩٣٨ز ، بە داهێنەرو بڕیادەری بیرۆکەی خۆێندنەوەی هاوچەرخ دەژمێردرێت بۆ قورئانی پیرۆز ، پاش خوێندنی ئەندازیاری لە موسکۆ و گەڕانەوەی بۆ سوریا تۆمەتی بە مارکسی بوونی دراوە پاڵ ، نووسەری کتێبی (الكتاب والقرآن) کە تێیدا هەوڵی داوە شێوازێکی تازەلە تەفسیر ڕەچاو بکات ، کە ئەم کارەشی بووە مایەی هەرایەکی زۆر لەسەر ئەم داهێنانەی کە چاوی هەموو قورئانی و ناحەزانی ئیسلامیشی بە گشتی پێ گەشایەوە .

(محمد شحرور) خاوەنی لایەنگر و نەیارێکی زۆرە بە هۆی بیرۆکەکانی کە جۆرێك لەتازەگەری نەبیستراوی تێدایە سەبارەت بە ئیسلام بە گشتی وقورئان بە تایبەتی ،لادانەکانی ئەم نووسەرە لە بوارەکانی بیروباوەڕ و فیقە وهەموو بابەتەکانی تر زۆرن

وبەڕەچاوکردنی فەلسەفە و پشت راستکردنەوەی هەن بیردۆزەی وەکو بیردۆزەکانی داروین ومارکس ولینین وئەنجلز بە شێوەی ناڕاستەوخۆ دەگەیەنێت بە خوێنەرەکانی ، نووسەری کتێبی « النزعة المادية في العالم الإسلامي » دەڵێت:

زیاتر لە هەزار سەرپێچیم لە کتێبەکەی شەحروردا وەدی کردووە لەگەڵ ڕێبازی ئیسلامدا! لە زۆربەی وردەکاریەکانی شەرعدا قسەی پێچەوانەی شەرعی هەیە بە شێوازێکی سەرنج ڕاکێش و تازە کە توانای هەیە کاریگەری لەسەر بیری خوێنەر درووست بکات وبە ئاسانی لادانەکانی هەست پێنەکرێت ئەگەر کەسەکە شارەزایی باشی نەبێت ، لە نێو قورئانیەهکاندا شێوازی نووسینی شەحرور جیاوازی زۆری لە گەڵ ئەوانی تر هەیە وەکو( أحمد صبحی منصور) بۆ نموونە ، ئەوهەرچەند دەڵێت من قورئانی نیم بەڵام هەڵگری هەمان بیرۆکەکانی ئەوانە لە باوەڕنەبوون بە سوننەت ودەڵێت:

**"لا أؤمن بالحديث النبوي، الله تعالى قال "وأطيعوا الرسول"، الطاعة إذن هي للرسول وليس للنبي، والاحاديث النبوية هي الغيبيات مثل عذاب القبرومشاهد الساعة وعذاب البرزخ وهذه هي النبوة، والرسول لا يعلم الغيبيات، ويكفي لنا أن نؤمن بالغيبيات التي وردت في المصحف".**

بەکورتی بەڵای شەحرور لەوەدایە سوننەت بە جارێ ڕەتدەکاتەوە ، هاوکات بەتەواویش پشت بە عەقڵ و بۆچونی خۆی دەبەستێت بۆ تێگەشتنی قورئان ، بۆیە سەدان داهێنانی سەیرو سەمەرە وناکۆك لەگەڵ ئیسلامدا لەنووسینەکانی دەبینرێت.

پوختەی فیکری محمد شحرور:

باوەڕی وایە قورئان پەیامێکە بۆ هەموو جیهان، مەبەستی ئەوەیە پێویستە بگونجێت یان بگونجێنرێت لە گەڵ هەموو میللەتاندا تەنانەت مییلەتانی یابان و ئەمریکا، پێشی وایە ئیسلام کۆتا پەیامە بۆ مرۆڤایەتی بۆیە دەبێت دەقەکانی قورئان لەگەڵ هەموو پێشکەوتن و پەرەسەندنێکی شارستانیدا ڕێ بکات، بەڵام شەحرور لە جیاتی ئەوەی پەنا بۆ قورئان ببات بۆ وەرگرتن و هەڵێنجانی چەمك و بەها و حوکمەکان بەدەر لە کاریگەری بەهاکانی عەلمانیەتی هاوچەرخ، ئەو هەڵساوە بە کردارێکی پێچەوانە و قورئانی کردووەتە پاشکۆی بەهاکانی عەلمانیەتی هاوچەرخ، بۆ ئەو مەبەستەش گەردەنی دەقەکان بادەدات و هەر بەزۆر دەیانگونجێنێت لەگەڵ ئەو مەبەست و ئاراستەدا،

محمد شحرور ڕەنگە گومڕاترین کەس بێت کە بەبێ وچان خەریکی گومان درووستکردنە بۆ موسوڵمانان و بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ سەرقاڵی دژایەتیکرنی قورئانە، ئەمەی خوارەوەش چەند نموونەیەکی خێرایە لە خەرمانی لادان و گومڕاییەکانی کە هەمووی لە زاری خۆیەوە بە دەنگ و ڕەنگ تۆمار کراوە:

-خوێندنەوەی محمد شحرور بۆ قورئانی پیرۆز بە شێوەیەکی گشتی وەکو توێژەرێك دەڵێت

- لەسەر هەڵگەڕانەوە و هەوڵی هەلوەشادنەوەی واتاکانی قورئان بونیات نراوە و هیچی تر.

- پێی وایە نوێگەری بە هیچ شێوەیەك ناكرێت بەبێ دووبارە قسەكردن لەسەر ئەو بابەتانەی لە ئیسلامدا جێگیر و نەگۆڕن.

- سەرەرای ئەو هەموو دروشمە زلانەی دەربارەی تێگەیشتنی لە قورئان بەرزی كردووەتەوە، ناتوانیت بە جوانی قورئان بخوێنێتەوەو هەڵەی سەرەتایی لە خویندنەوەیدا دەكات.

- قسەی زل و فەلسەفەی بەتالی زۆرە سەبارەت بە تێگەیشتنەكانی لە قورئان، بۆ نموونە دەڵێت: أب و أم لە گەڵ والد و والدة یەك شت نین و جیاوازییان هەیە!

- دەڵێت: سەرپۆش لە پێش ئیسلامدا هەبوو، بەڵام ئیسلام هات و لایبرد!

- دەڵێت: ئافرەت ئاساییە بە شۆرتێكەوە دەربچێتە سەر جادە!

- پێی وایە مناڵ بوون بەبی هاوسەرگیری ئاساییە چونكە دەڵێت: مناڵی زینا و داوێن پیسی وشەیەكە شەرعناسەكان پەیدایان كردووە.

- دەڵێت: كۆمەڵگای دیندار كۆمەڵگایەكی مونافیق و دوو ڕووە.

- دەڵێت: مەسەلەی ئەوەی كە ئیسلام لەسەر پێنج كۆڵەكە بونیات نراوە، ئەوە وەكو ئەوەیە كڵاوێكمان كرابێتە سەر و مەسەلەكە وا نییە.

- دەڵێت: موسوڵمان هەرئەوە نییە سەر بە ئیسلام بێت" دەگونجیت موسوڵمان بێت و یەهودی بیت یان مەسیحی و بوزی و هیندۆسی بێت.

- دەڵێت: ئەوانەش کە دژی پێغەمبەر (ﷺ) جەنگاون و کوژراون شەهیدن!

- دەڵێت: لویس باستۆر کە میکرۆبی دۆزیوەتەوە شەهیدەو لەگەڵ پێغەمبەراندایە.

- لە هەموویشی سەیرتر پێی وایە شەهید مەرج نییە مردوو بیت دەکرێت شەهید بێت و زیندوو بێت.

- باوەڕی نە بە عەدالەت و نەبە ڕاستگۆیی هاوەڵان نییە و بگرە پێی وایە ئێستا ئێمە لەم سەردەمەدا لەوان باشترین.

- ئەڵێت: فەرمان و قەدەغەکردنەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وەکو فەرمانەکانی سەرۆك شارەوانی پاریسە مەرج نییە بە گوێ بکرێت.

- بە ڕاشکاوی وتوویەتی: ئەگەر فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) م بە دەنگ و ڕەنگ پێ بگات خۆم بە وابەستەی کارپێکردنی نازانم.

- باوەڕی بە پێغەمبەر (ﷺ) هەیە، بەڵام وەکو خۆی دەڵێت کە ئەویش حاڵی حاڵی پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی و هیچ پەیوەندیمان پییانەوە نییە!

- بەڵکو دەربارەی زاتی الله دەڵێت ئەو نێرینەیە لەبەر ئەوەی پەیامەکان لەسەردەمی نێرینەکاندا هاتوون..تعالى الله عما يقولعلوا كبير.هەموو ئەم قسانەش بە ڤیدیۆ لە یوتیوب هەیە بۆ کەسێك بیەوێت بیانبینێت و هەمووی لەلایەن توێژەرێکەوە کۆکراونەتەوە.

بۆ تەفسیری قورئانیش ڕێکخەری سەرەکی و گرنگ بەلای شەحرورەوە ڕەگە ومانەوانییەکەیە ( الجذر اللغوي) بۆیە کاتێك دەیەوێت ئایەتێك تەفسیر بکات، لە فەرهەنگەکانی زماندا بۆ گونجاوترین

واتا دەگەڕێت کە لەگەڵ تێگەیشتنەکەیدا یەك بگرێتەوە کە گونجاندنی ئیسلامە لەگەڵ عەلمانیەتدا.

بۆ شارەزایی یزیاتر ،بڕوانە:

- التحريف المعاصر في الدين ، عبد الرحمن بن حسن حبنكة الميداني.
- بيضة الديك، يوسف الصيداوي.
- كيف يحرّف محمد شحرور القرآن؟ شريف محمد جابر.
- تهافت القراءة المعاصرة : د. منير محمد الشواف.

**بەڵای شەحرور لەوەدایە سوننەت بە جاری ڕەتدەکاتەوە ، هاوکات بەتەواویش پشت بە عەقڵ و بۆچونی خۆی دەبەستێت بۆ تێگەشتنی قورئان**

# ( ئەرستۆ )



زۆربەمان ناوی (أرسطو) مان بیستووە ، بەڵام پێم وایە زۆربەشمان تەنها بە ناو ئەیناسین ، (أرسطو ) فەیلەسوفێکی یۆنانیە وقوتابی ئەفلاطۆنە کە بەگەورەترین فەیلەسوفەکانی یۆنان دێتە ئەژمار ، لەساڵی ٣٨٤پ ز لەدایکبووەو و لە ساڵی ٣٢٢پ ز کۆچی دوایی کردووە ، لە زۆربەی بوارەکانی زانستدا نووسینی هەبووە وەکو فیزیا و شانۆ و هۆنراوەو ڕەوانبێژی ومۆسیقا وسیاسەت و...هتد شوێن کەوتووانی بە (المشائين) دەناسرێن چونکە ئەو بە ڕێکردنەوە قسەی بۆ قوتابیەکانی دەکردو وانەی پێدەدان ، باوکی پزیشکی تایبەتی ئەسکەندەری مەقدۆنی بوو ، بەڵام ئەو پادشایە لە ساڵی ٣٢٢پ ز مرد و ئەرستۆ یش بە لایەنگری ئەو دەناسرا بۆیە کە ئەسینا کەوتە دەستی دوژمنانی ئەسکەندەر ئەرستۆ هەڵهات بەرەو شاری خەلسیس ولەوێ نەخۆش کەوت ومرد ،

ئەرسطو قسە نییە لەسەر ئەوەی بلیمەت وزانایەکی گشتگیر بووە ، بەڵام لەبەر ئەوەی تەنها پشتی بە عەقڵی خۆی دەبەست دوور لە ڕووناکی وڕێنموونی وەحی کەوتە زۆر هەڵەی گەورەوە(ئەمەش قسەی من نییە وکەس نەڵێت ئەرستۆی بە هەڵە خستەوەو زەربی سفری کرد)، ئەمەی خوارەوەش هەندێکە لە بۆچوونەکانی کە مشتێکە لە خەروارێك وتەنها بۆ نموونە هێناومەتەوە:

- ئەو دەیووت: خوا شتە سەرەکییەکان دەزانی و ئاگای لە وردەکاری شتەکانی تر نییە لەگەردووندا.

یان دەیووت: خوا ئەوبزوێنەرەیە کە خۆی نابزوێت! سیفاتی بێکەم وکوڕی تێدایە بەڵام هێزی نییە...بە کورتی ئەوخوایەی باسی دەکات ئاگادارە زانایە بەلام بێ دەسەڵاتە! ئەم بۆچوونەش وردەکاری زۆری تێدایە بە وردەکاری زۆرتریشەوە بەرپەرچ دراوەتەوە کە ئێرە جێگای باسکردنی نییە.

- دربارەی جیهان وگەردوون دەیووت ئەزەلیەو نەسەرەتای هەیە و نە کۆتایی! هەر بۆیە باوەڕی نەبوو بە بوونی کەسێك بە بێ باوك ودایك درووست بووبێت بە هەمان شێوە باڵندەو و ئاژەڵەکانیش! دیارە ئەمەش پێچەوانەی زانستی نوێیە کە تەمەنی دونیایان بە ١٣ ملیار ساڵ مەزەندە کردووە ووتوویانە حەتمەن کۆتاییشی هەیە.

- قەناعەتی وابوو جیهان لە پێنج پێکهاتە درووست بووە: خۆڵ وئاو و هەوا و ئاگر وپێنجەم پێکهاتەش بە (أثیر) ناوی دەبرد..بێگومان تێکڕای ئەم بۆچوونانەی هەڵەن.

-باوەڕی بە فرە خوایی هەبوو وهەندێ لە هەسارەکانی جیهانی سەرەوەی بە خودا وەسف دەکرد.

- ئەم باسانەی سەرەوە وکۆمەڵێك باسی تر كە لەژێر بابەتی (الالهيات) پۆلێن دەكریت بە تەعبیری خۆمان وەكو مولحیدێك یان موشریكێك نووسیوێتی جیگای ئاماژەیە هەر یەك لە ( البيروني ، ابن تيمية ، ابن القيم ،محمد علي أبي ريان ،ول ديورانت ، برتراند راسل ، ماجد فخري )، بە تێروتەسەل بەرپەرچیان داوەتەوەو بیرۆكەكانیان هەڵوەشاندووەتەوە.

- لە بواری پزیشكیدا زۆر بۆچوونی هەڵەی هەیە: لەوانە دەیوت درووست بوونی كچ وكوڕ پەیوەندی بە چڕی وتەڕی ئاوی پیاو هەیە. هەروەها زنجیرەیەك بۆچوونی هەڵەی هەیە هەمووی لە خۆیەوە هەڵیهێنجاون وڕاستی نەپێكاوە.

لەوانە: دەیووت: ئەگەر برۆی مرۆڤ لار بێت بەرەو لاجانگ ئەوە خاوەنەكەی كەسێكی گاڵتەجار و خراپ وحەسوودە!

یان ئەگەر ناو گوێی تووكێكی كەمی تێدا بێت خاوەنەكەی بیستنی باشە،

یان دەیووت: گوێی گەورە نیشانەی گەمژەیی خاوەنەكەیەتی!

لەگەڵ دەیان بۆچوونی لەم چەشنە.

**تێبینی:** زۆرێك لە بیرمەند و بلیمەتەكانی جیهان گوێیان زور گەورە بووە..

- لەبواری زانستی فەلەك وگەردوونناسیدا دەیوت: هەسارەكان دوو جۆرن جێگیر و جووڵاو ، پێویستیشیان بە هیچ هۆكاریك نییە هەڵیانگرێت.

- لە بواری زانستی زیندەوەر و ئاژەڵدا بیردۆزەکانی پێکەنینی مرۆڤ دەورووژێنێ ئەوەندە سەیرو سەمەرەن، تەنها یەك نموونە باس دەکەم ئەو پێی وابوو تمساح زمانی نییە! لە کاتێکدا تمساح زمانێکی زۆر پانی هەیە. بارەی کۆمەڵناسیەوە پێی وابوو یۆنانییەکان باشترین ڕەگەزی مرۆڤەکانن!

- لەبارەی ئافرەتەوە دەیووت: فەرمان بۆ پیاوە نەك بۆ ژن ، سرووشت کەسانێکی ئامادە کردووە بۆ فەرمانکردن وەکوپیاو کەسانێکیش هیچ ئیرادەیەکیان نییە وەکو کۆیلە ، پێیشی وابوو ئافرەت لە بنەڕەتەوە ژیری تیدا نییە!کۆیلایەتیشی بە پێویستییەکی مرۆڤایەتی دەزانی! بەدەر لەو خەرمانەی بەدەوری ئەرسطۆ درووستکراوە ئەوەیە ڕاستیەکی ، لەوانەشە کەسێك بەڵگە بهێنیتەوە بە ستایش کردنی (ابن رشد ، مصطفی النشار ، فؤاد الأهواني ، محمد عابد الجابري) بۆ ئەرستۆ ، بەلام هەڵوەشاندنەوەی زانایان بۆ هزری ئەو فەیلەسوفە و شیکردنەوەیان بۆ هەڵەکانی هیچ بواریك ناهێڵێتەوە ئاوڕ لەو ستایشانە بدرێتەوە ، ئەمە جگە لەوەی هەندێ لەئەو کەسانە خۆیان گرفتی گەورە لە دەوری بیروباوەڕیاندا هەیە وەکو ئیبن ڕوشد و جابیری،

بۆ شیکردنەوەی ئەم باسانە و زیاتر شارەزابوون دەربارەی تاوانەکانی ئەرستۆ لە بەرانبەر زانست و عەقڵ و مەنتیقدا ، بروانە: (جنايات أرسطو في حق العقل و العلم/الدكتور خالد كبير علال) کتێبێکی زۆر زانستیە و هەمووی بە بەڵگە و بە قسەی زانایان ووێنە هەڵەکانی دەسەلمێنێ.

http://www.almeshkat.net/books/open.php...

# ( خەواریجەکان )




تاقمێکی ئیسلامی گومڕان ، لە کۆتایی سەردەمی عوسمان وسەرەتای سەردەمی عەلی ڕەزای خوایان لێبیت سەریان هەڵدا ، یەکێکن لە توندوتیژ ترین کۆمەڵە ئیسلامییە لادەرەکان کە بە سەختی و بەزبری بەرگریان لە ڕێرەوی خۆیان دەکرد ، خەواریجەکان ئەگەرچی کەسیان لە هاوەڵان تێدا نەبوو بەڵام زۆریکیان قورئانیان لەبەر بووبە بێ تێگەیشتنی باش لەواتاکانی ،لەپاش کوژرانی عوسمان بەیعەتیاندا بەعەلی ڕەزای خوایان لێبێت ،دوای ئەوە موعاویەڕەزای خوای لێبێت بەسوپایەکەوە لە شامەوە هات ولە گەڵ سوپای عەلی ڕەزای خوای لێبێت دەستەویەخە بوونەوەو سوپاکەی شام تێکشکان وهەڵهاتن ودواتر لاپەڕەی قورئانیان بەرز کردەوەو داوای ئەوەیان کرد قورئان بکرێتە داوەر لەنێوانیاندا ، عەلی سەرەرای ئەوەی ئەم کارەی بە فێڵێکی جەنگ زانی بەڵام ڕازی بوو بە ڕاگرتنی جەنگ، بەم هۆیەشەوە دوانزە هەزار کەس لە سوپاکەی عەلی هەڵگەڕانەوەو

وتیان:لا حكم إلا لله" عەلی ڕەزای خوای لێبێت فەرمووی:

"إنها كلمة حق يراد بها باطل" خەواریجەکان پاش ئەوەی ڕێکەوتنی هەردوو لایەنەکەیان بەتەواوی ڕەتکردەوە ، وەکو هێزێکی گەورە دابڕان و (عبد الله بن وهب الراسبي) یان کردە سەرکردەی خۆیان ، خەواریج بە دوو شت ناوبانگیان دەرکرد : عیبادەت و خوا پەرستن ، هەروەها ئازاییەکی بێ وێنە لە شەڕدا ، لەچەندین شەڕی گەورەدا ڕووبەڕووی عەلی بوونەوە (ڕەزای خوای لێبێت) و دواتر لە دژی بەنی ئومەیەشدا بەهەمان شێوە چەندین شۆڕشیان بەرپا کرد ،کە لە ئەنجامدا بووە مایەی لاوازکردنی ئەو دەوڵەتە زەبەلاحە! خەواریج چەندین فەرموودە ئاماژەی پێکردوون ،وەکوئەوفەرموودەی لە بوخاری دا هاتووە:( يخرج منهم قوم يقرؤون القرآن، لا يجاوز تراقيهم، يمرقون من الإسلام مروق السهم من الرَمِيّة.) ، شایانی باسە بەهۆی ناکۆکی نێوان خۆیان چەند کۆمەڵ و تاقمێکیان لێ جیا بوویەوە وەکو:(الأزارقة ،النجدات الصفرية).

خەواریجەکان لەسەر بنەمای هەندێ بۆچوون وبیروباوەڕ درووست بوون ،

لەوانە باوەڕیان وابوو:

-هاوەڵان بە بەشداریکردن لە فیتنەکە شەریکیان بۆ خوا بڕیارداوە بۆیە دینیان لێوەرناگیرێ و هیچ فەرموودەیەکیان لێ قبوڵ ناکرێت.

-سوننەت لە ڕێگەی هاوەڵێکەوە وەردەگیردرێت بەشداری لەو شەڕانە نەکردبێت.

- هەرچی فەرموودەی هاوەڵان هەیە پاش ئەو جەنگانە ڕیوایەت کرابێت ڕەتیان کردەوە بەم شێوەش کەوتنە گێژەلوکەیەکی گومڕایی گەورەوە ، کە لە ئەنجامدا نکۆڵیان کرد لە:

*سزای ڕەجمی زانی پیاوی ژندار و ژنی خاوەن مێرد.

*مەسح کردن لەسەر خوف.

*دەست بڕینی دز بەدەر لەوەی دزییەکەی زۆر بێت یان کەم.

*نکۆڵییان کرد لە حەدی عارەق خواردن.

* حەڵاڵ کردنی خوێنی موسوڵمانان بە بەهانەی جۆراوجۆر وتەکفیر کردنی ئەنجامدەری گوناهی گەورە واتە: (الكبائر).

*(الخطيب البغدادي) فەرموویەتی: نکۆڵی کردن لەسوننەت لەبناغەدا بیرۆکەی خەواریجەکان بوو.

* بەڵکو تاقمی نەجدات کە بەشێکن لە ئەوان جیابووەتەوە پێیان وابوو مارەکردنی کچەزا و کوڕەزا و برازا و خوشکەزا جائیزە چونکە لە قورئاندا قەدەغە نەکراوە. ئەوان پێیان وابوو قورئان هەموو وردەکارییەکی دینداری تێدایە و هیچ نیازێکیان بە فەرموود نییە ،بۆیە هەر حوکمێکی پێچەوانەی قورئان لە فەرموودەو وتەی زانایاندا هاتبێت کاری پێناکریت وبەرپەرچ دەدرێتەوە، لێرەشەوە بۆمان دەرەکەوێت ناحەزانی سوننەت کە ناوی قورئانییان لە خۆیان ناوە و ئێستا لە کوردستانیش ماوەیەکە سەریان بەرزکردووەتەوەو بە نیازن ئەوڕێبازە زیندوو بکەنەوە ، هەمان بانگەشەو داوکاری وئامانج کۆیان دەکاتەوە.

بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە: کتێبەکانی الفرق الإسلامية والملل والنحل لەسەرچاوە کۆنەکان لە هاوچەرخەکانیش بڕوانە: الخوارج، تاريخهم، وأراؤهم الاعتقادية، وموقف الاسلام منها/غالب علي العواجي، تيارات الفكر الإسلامي: د.محمد عمارة

**هاوەڵان بە بەشداریکردن لە فیتنەکە شەریکیان بۆ خوا بڕیارداوە بۆیە دینیان لێوەرناگیرێ و هیچ فەرموودەیەکیان لێ قبوڵ ناکرێت.**

# ( موعتەزیلەکان )




تاقمێکی ئیسلامی گومڕای کاریگەرن لە ڕووی بەکارهێنانی عەقڵ لەسەر حیسابی دەقە شەرعییەکان ، لەسەرەتای سەدەی دووەمی کۆچی لە بەسرە لەسەر دەستی دامزرێنەکەی کە (واصل بن عطاء) بوو سەریان هەڵدا ، ئەوان بە تەواوی پشتیان بە عەقڵ بەست سەبارەت بە بیروباوەڕەکانیان و پێشیان خستە سەر ئایەت و فەرموودەکاندا ، دەیانووت: عەقڵ وفیترەتی ساغ بە خۆیان دەتوانن حەڵاڵ و حەرام لەیەکتر جیابکەنەوە ، زانایان سەبارەت بە هۆکاری دروست بوونیان دوو ئاڕاستەیان هەیە:

١-بە هۆی هەندێ مشتومڕ بووە دەربارەی چەند بابەتێکی عەقیدە وەکو قەدەر وحوکمی ئەو کەسەی تاوانێکی گەورە ئەنجام ئەدات ، ئەمانە پێیان وایە هۆکاری ناونانیان بەموعتەزیلە لەبەر ئەوە بووە (واصل بن عطاء) بازنەی وانەکانی حەسەنی بەسری بەجێهێشت و بازنەیەکی جیای بۆ خۆی دانا ،یان لەبەر ئەوە بووە بە پێویستیان زانیوە ئەنجامدەری کەبیرە دوورخرێتەوەو تێکەڵی

نەکرێت ، یان لەبەر ئەوە بووە موعتەزیلەکان وتیان ئەنجامدەری تاوانی گەورە نەموسوڵمانە ونە کافرە بەڵکو شتێکە لەو نێوەندەدا.

٢-هەندێکیش دەڵین بۆیە پێیان دەوتریت موعتەزیلە ئەوان لە بنچینەدا لایەنگری عەلی بوون ڕەزای خوای لێبێت بەڵام کاتێك حەسەنی کوڕی تەنازولی بۆ موعایە کرد ڕەزای خوایان لێبێت ئەوان هەڵوێستیان نەبوو ودوورە پەرێز بوون.

موعتەزیلە لەسەر بنەمای کۆمەڵێك فیکرو بۆچوون درووست بوونە ، لەوانە:

**یەکەم**: التوحيد: واتە:خوای گەورە پاراوە لەهەموو عەیبێك و هاوشێوەی نییە ، هەروەها وتیان خوای گەورە هەرگیز نابینرێت نە لەدونیا ونەلە بەهەشتیشدا، هەروەها وتیان قورئان مەخلوقە واتە: درووستکراوە و دەرەنجامی قسەکردنی خوا نییە ،هەمووئایەتەکانیشیان لەوبارەوەتەئویل کرد ، هەروەها وتیان سیفەت وذات هیچ جیاوازییەکیان نییە.

**دووەم**: العدل:واتە: خوای گەورە کردەوەی بەندەکانی درووست ناکات وئەوان خۆیان کردەوەی خۆیان درووست دەکەن ، لەگەڵ هەندێ وردەکاری دوورو درێژی ناکۆك لەگەڵ دەقە شەرعییەکاندا.

**سێیەم**:الوعد والوعيد: واتە :خوای گەورە پاداشتی چاکە بە چاکە دەداتەوەو خراپەش بە خراپە ، هەرگیز لە ئەنجامدەری تاوانی گەورە (الكبائر) خۆش نابێت ئەگەر تەوبە نەکات.

**چوارەم**: المنزلة بين المنزلتين: واتە: ئەنجامدەری تاوانی گەورە لە نێوان کوفرو ئیماندایە نەئیمانداره ونە کافریشە.

**پێنجەم**: الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر: واتە: پێویستە فەرمان بەچاکە بکریت ونەهی لەخراپە بکرێت ، بەقسە و بەجەنگ ، پێویستیشە موسڵمانان گوێرایەڵی ئەوفەرمانڕەوایە نەبن کە لە حەق لایداوە.

جگە لەمانەش نکۆڵیان دەکردلە شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە قیامەتدا بۆ تاوانبارەکان ،نکۆڵیان لەوە دەکردخوای گەورە لە ئاسمان بێت ونکۆڵییان لە کەراماتی ئەولیا دەکرد وزۆر شتی تر.

وتمان موعتەزیلە بە شێوەیەکی گشتی پشتیان بە عەقڵی خۆیان دەبەست بۆ تێگەیشتن لەئیسلام ، هەر بۆیە سیفەتەکانی خوای گەورەیان بەپێی تیگەیشتنی خۆیان وتەئویل کرد و لێکدایەوە ، تانەیان لەهاوەڵاندا وبە درۆزن ئەوانیان ژمارد ، ئینجا لەبەر ئەوەی کایگەری فەلسەفەی هیندی و یۆنانیان لەسەر بوو ،شەریعەتی ئیسلامیان کرد بەکۆمەڵە پرسێکی عەقلی وجەدەلی بە ئارەزووی خۆیان.

زانایان لە دێر زەمانەوە بەرپەرچی موعتەزیلەیان داوەتەوەو یەکەمین کەس کە بە ئاگری ئەوان داخ بوو ئەحمەدی کوڕی حەمبەل بوو ڕەحمەتی خوای لێبێت لەمەسەلەی خەلقی قورئان.

موعتەزیلە چەندین تاقمن لەنێوخۆیاندا ، وەکو: **الواصلية** ، **الهذيلية** ، **النظامية** ، **البشرية**...هتد هەر یەکێ لەم کۆمەڵانەش بە هۆی هەندێ لادانی جیاواز لە ئەوانی تر جیا دەبوونەوە چونکە هەموویان پشت بەستنی تەواویان لەسەر عەقڵ و بۆچوونی خۆیان بوو بەتەنها.دیارترین

کەسایەتییەکانی ئەوان دوای (واصل بن عطاء) بریتین لە: **(أبو الهذيل العلاف ، إبراهيم النظام ،بشر بن المعتمر، الجاحظ ، القاضي عبد الجبار).**

ئەمە بەکورتی سەبارەت بەموعتەزیلە لەڕابوردوودا ، بەڵام ئەوان لەم سەردەمەی خۆیشماندا بوونیان هەیە لە ولاتە عەرەبیەکان ، و لەکوردستانی خۆیشمان لایەنگر و شوێنکەوتوویان هەیە لەسەر ئاستێکی سەرەتایی ، چونکە ئەمان لە موعتەزیلە کۆنەکان بەوە جیا دەبنەوە کەئەوان سەرەڕای ئەوەی گومرا بوون بەڵام زانستیان هەبوو و خوێندنەوەی زۆریان هەبوو بەڵام بەهۆی تەفسیر کردنی قورئان بە تێگەیشتن وهەواو ئارەزووی خۆیان و کارنەکردنیان بە فەرموودەکانی پیغەمبەر (ﷺ) گومڕا بوون ، لە کاتێکدا ئەمانەی لای خۆمان وەکو تووتی قسەکانیان وەردەگێڕن دووبارەی دەکەنەوە بێ ئەوەی نە لە زانستی نەقل ونە لە زانستی عەقڵ شارەزایی باشیان هەبێت ،

بۆ شارەزایی و زانیاری پتر لەم بارەوە ، بڕوانە:

- الملل والنحل للشهرستاني .
- الفرق بين الفرق للبغدادي .
- درء تعارض العقل والنقل لشيخ الإسلام ابن تيمية.
- دراسات في الفرق والعقائد لعرفان عبد الحميد ، العصريون معتزلة اليوم يوسف كمال.

# ( موعتەزیلە هاوچەرخەکان )




تاقمی موعتەزیلە ئەگەر چی وەکو فیرقەیەکی ئیسلامی لادەر لە قۆناغێکی زەمەنی دیاریکراودا سەریان هەڵدا و تەواو بوون وەکو قەبارە ، بەڵام وەکو هزر و کاریگەری فیکری و ڕێڕەو ، بە شێوەیەك لە شێوەکان هەر مانەوە ، لەوانەشە - بەبۆچوونی خۆم - ئەوان زۆرترین گاریگەری سەلبیان پاش نەمانیان لەسەر موسوڵمانان بەجێ هێشتبێت ، بەهۆی ژمارەیەکی زۆر لە گومان وتەمومژ نانەوە سەبارەت بە پرسەکانی قەدەر وکردەوەی بەندەکان و پشت بە ستنی ڕەها بە عەقڵ ،هاوکات ڕەتکردنەوەی فەرموودەو تێگەیشتنی سەلەف بۆ دەقەشەرعییەکان.

تاکو ئەم ڕۆژگارەی خۆمان ڕێبازی موعتەزیلەکان ڕاکێشان وکاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لەسەر هەندێ کەسایەتی و لایەنی ئیسلامی ، بەڵام بە بێ ئەوەی دان بە ناوی موعتەزیلە بنێن بە ڕاشکاوی .

ئەوەش بە هۆی ئەو ناوبانگە خراپەیە لە مێژوودا وەکو فیرقەیەکی لارێ و گومڕا بەدەستیان هێنا ، بۆیە وەکو خۆڵ لە چاوکردن وچەواشەکاری خۆیانیان وەکو ڕەوتیکی عەقلی نیشاندا.

ئەگەر بمانەویت لایەنێك دیاری بكەین وەكو میرات هەڵگەری موعتەزیلەكان لەم سەردەمەدا ، ئەوا پێویستە قوتابخانەی عەقلانی دیاری بكەین ، كەسەرەتا لەسەر دەستی (جمال الدين الأفغاني) و ( محمد عبده) پەرەی سەند و گەشەی كرد ، دواتر تاكو ئێستاش بەردەوامییان هەیە لە ژێر ناوونیشانی جۆراوجۆر ، وەكو: تازەكردنەوەی گوتاری ئایینی ، خوێندنەوەی نوێ بۆ دەقەكان ، قوتابخانەی چاكسازی ، ئیسلامی هاوچەرخ ، هەموو ئەم جۆرە بانگەشانەش لە ئاستێكدا سەر بە قوتابخانەی ئیعتیزالن و ،كۆمەڵێ ئامانجیان هەیە كاری بۆ دەكەن ، پێش هەموو شتێكیش بەرنامەڕێژی دەكەن بۆ گونجاندن ونزیكبوونەوە لەنێوان فیكری ئیسلامی و فیكری ڕۆژئاوادا ، ئەوەش لە ڕێگەی كۆمەڵێك ئامرازو هۆكاری دیاری كراو ،لەوانە : تەسك كردنەوەی ڕوبەری غەیبیات و تەئویل كردنی زۆرێك لەو هەواڵ ڕوداوانەی لەقورئاندا هاتووە بەشێوەیەك عەقلی هاوچەرخ بۆی قوت بدرێت ،بۆ نموونە (محمد عبده) (حجارة من سجيل) ی تەئویل دەكرد بەنەخۆشی ئاوڵە ، مەسەلەی فرەژنی ئەوەندە سنووردار كردبوویەوە نزیك بوو لە قەدەغە كردن ، ئینجا تەڵاقیش بەهەمان شێوە بە شێوازێك باسی دەكرد ڕۆژئای پێ ڕازی بكات!

بە كورتی وەكو پیاوچاكێك دەفەرموێت: ئەم عەقلانییانە(موعتەزیلە تازەكان) وەكو كۆمەڵێك عەیب و عار تەماشای ئیسلامییان دەكرد و خۆیشیان كردبووە پینەچی بۆ ئیسلام! بۆیە بێگومان ئەو قوتابخانەیە درێژەدانێك بوو بە ڕێرەوی ئەو فیرقەیە.

موعتەزیلەكانی دوێنێ و ئەمڕۆیش چەند خاڵێكی هاوبەشی جەوهەری كۆیان دەكاتەوە:

١- عەقڵ دەکەنە رکابەری وەحی وجاری واهەیە دەیکەنە داوەر بەسەریدا.

٢- پاشکۆیی بۆ فەلسەفەو ڕێڕەوی بێگانە ،ئەوان کاریگەر بوون بە یۆنانییەکان وئەمانیش بە ئەوروپا وشارستانی ڕۆژئاوا.

٣- بە ڕەوا بینینی خۆ هەڵقورتان لە باسە غەیبیەکان و تەئویل کردنیان بەو شێوەی کە بە باشی دەزانن.

٤- بە گومان تەماشاکردنی فەرموودەکان و سوننەت بە گشتی ، ئیتر بە ڕەتکرنەوەی بێت بە شێوەیەکی گشتی ، یان ڕەتکردنەوەی فەرموودەی ئاحاد ، واتە: تەنها وەرگرتنی متواتر.

٥- شەیدا بوون بە بڵاوکردنەوەی گومان و قسەی سەیرو بێ سەرو بەر دەربارەی شەریعەتی ئیسلام.

٦- هەروەها هەردوو لایان هاوبەشن لە بەرزکردنەوەی دروشمی لێبوردەیی ئایینی و ئازادی بیرو ڕاکە جێگای زۆر شتی دژ بە ئیسلامی تێدا دەبێتەوە.

موعتەزیلە تازەکان هەمیشە بە ئەهلی سوننەت دەڵێن: ئوصوڵی ، یان توندڕەوەکان و، وزۆر ستایشی قوتابخانەی موعتەزیلە دەکەن:وەکو زەمەخشەری و هاوشێوەکانی ، ئێستاش بەشێوەیەکی گشتی چەند بیروباوەڕیکی موعتەزیلە هاوچەرخەکان دەخەینەڕوو:

* نەهێشتنی بیروباوەڕی (الولاء والبراء) لە ڕێگەی بانگەشە کردن بۆ یەکگرتنی ئایینەکان و، نزیکبوونەوە لەگەڵ شیعە وشتی لەشێوە.

*سڕینەوەی جیهاد بەتەواوەتی و گۆڕینی بە دفاع وبەرگریکردن ئەویش لە کاتی پێویستیدا.

* نکۆڵی کردن لە زۆرێك لەسزا شەرعییەکان بە تایبەتی ڕەجمی زانی و حەددی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام ، چونکە ئەوە تیکدەگیرێ لەگەڵ ئازادی بیروباوەڕ و ڕا دەربڕیندا.

* ڕیگەدان بە تێکەڵاوی ژنان وپیاوان بە شێوەیەکی زۆر بەرفراوان و گوماندرووست کردن سەبارەت بە شەرعیەتی سەرپۆشی ئافرەت وڕێگەدان بەتەوقەکردنی پیاو لە گەڵ ژنی نامەحرەم و حەڵاڵ کردنی چەند جۆرێك لەجۆرەکانی سوو وشتی تر.

*ڕەتکردنەوەی فەرموودەی ئاحاد لە بواری عەقیدە یان لای هەندێکیشیانەوە بە ڕەهایی.

* نکۆڵی کردن لەهەندێ لە موعجیزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەروەها کەراماتی ئەولیا وشتی تر.

قوتابخانەی عەقلانی یان موعتەزیلە تازەکان ، لەسەرەتای سەدەی بیستەوە بە گەرمی کاردەکەن و بەرهەمیان هەیە ، ئەمەش ناوی هەندێکە لەناودارەکانیان ، بەڵام هەموویان وەکویەك نین سەبارەت بە ڕێژەی کاریگەری بوونیان بەو ڕێڕەوە ، بەڵکو جیاوازیان هەیە لەڕووی زۆری وکەمیەوە: (جمال الدين الأفغانی ومحمد عبده ، أحمد خان الهندي وأحمد أمين، زهدي جار الله، زكي نجيب محمود ،معروف الدواليبي ، محمد البهي ، محمد عمارة ،حسن الترابى ،سليم العوا ، طارق السويدان ، عمرو خالد ومحمود شلتوت ،محمود ابو ريه ، طه حسين ،عبد الرحمن الكواكبى ، محمد حسين هيكل نووسەری کتێبی (حياة محمد) ،أحمد زكى أبو شادى ، توفيق الحكيم ومحمد فريد وجدى ،أبو زيد الدمنهورى وفرج فوده ورشاد خليفة وأحمد صبحى منصور ، عبد الله عنان ،

مصطفى محمود ، مصطفى كمال المهدوى ،معمر القذافى ، روجيه جارودى ، مصطفى المراغى ،حسن حنفي ، و نصر حامد أبي زيد ، و هشام جعيط ) زۆرى تريش.

پرسیارێك دەمێنێنەوە بیکەین: ئایا موعتەزیلەی هاوچەرخ لە کوردستان بوونیان هەیە؟ بەڵێ بێ گومان بوونیان هەیە ، بە ئاسانی دەتوانین لە ڕۆشنایی ئەوەی باسمان کرد بیانناسین ، ئەوان چالاکن بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ڕەوتە لە بیرکردنەوە لە ڕێگەی نووسین و کارکردنیان لە ناو هەندی لەحیزبە ئیسلامییەکان وهەروەها وەکو چالاکوان لە ڕێکخراوی ناحکومیەکان و ،

هەندێکیش لەوانە بەڕاشکاوی لەسەر تەلەفزیون و لە ڕۆژنامەوگۆڤار و ئێنتەرنێت بیروباوەڕی خۆیان دەخەنە ڕوو وبەرگری لێ دەکەن ولۆمەی موسوڵمانان دەکەن سەبارەت بە باوەڕ هەبوونیان بە هەندی باس وخواست کە ئەوان بە دواکەوتنی دەزانن ، بەڵام ئەوان لە ژێر ناوونیشانی بیرۆکەی ئیعتیزالدا کار ناکەن لەوانەشە ئەو پرسە ڕەتکەتەوە .

بۆ زیاتر شارەزابوون لەمانەی باسمان دەكرد، بڕوانە:

-مذاهب فكرية معاصرة، محمد قطب.

-تاريخ الفلسفة الحديثة، يوسف كرم.

-درء تعارض العقل والنقل، ابن تيمية بتحقيق د. محمد رشاد سالم.

–المعتزلة بين القديم والحديث لمحمد العبده وطارق عبد الحليم

والعصريون لمحمد حسين رحمه الله.

والفكر الإسلامي المعاصر لغازي التوبة.

غزو من الداخل لجمال سلطان.

مقال "المدرسة العقلية الحديثة وصلتها بالقديمة" للشيخ ناصر العقل.

كتاب دعوة جمال الدين الأفغاني في ميزان الإسلام لمصطفى غزال.

كتاب العصريون معتزلة اليوم ليوسف كمال

حوار هادئ مع الغزالي .سلمان العودة

العصرانيون و مزاعم التجديد - محمد حامد الناصر.

موقف المدرسة العقلية من السنة النبوية - الأمين الصادق الأمين

مفهوم تجديد الدين - بسطامي سعيد

مفهوم التجديد بين السنة النبوية وبين أدعياء التجديد المعاصرين - د.محمود الطحان

العصرانية في حياتنا الاجتماعية - د.عبدالرحمن الزنيدي.

العصرانية قنطرة العلمانية - سليمان الخراشي.

# ( أحمد لطفي السيد )



بە بیرمەند و فەیلەسوف وەسف دەکرێت ، بە داهێنەرو باوکی عەلمانیەتی میسری دەناسرێت ، لە ساڵی(١٨٧٢)ز لە پارێزگای (الدقهلية) لەمیسر لە دایکبووە ، لە کاتی خوێندني لەسەرەتای لاویدا چاوی بە (جمال الدين الأفغاني و محمد عبده) کەوت وپێیان کاریگەر بوو ، هەروەها بەکتێبەکانی ئەرستۆ سەرسام بوو و وەریگێڕاوە سەر زمانی عەرەبي ، لە حکومەتی ئیسماعیل صدقي وەزیری دەرەوەو بووە و بۆ ماوەیەکیش جێگری سەرۆك وەزیران بووە ، دواتر بوو بە سەرۆکی کۆڕی زمانی عەرەبی ، لە گرنگترین دەستکەوتەکانی کە لایەنگرانی شانازی پێوە دەکەن ئەوەیە توانی چەمك و تێگەیشتنی ئەوروپا لە ئازادی بگوێزێتەوە بۆ میسر ، هەروەها داوای دەکرد میسرییەکان لەسەر بنەمای نەتەوایەتی کۆ ببنەوە نەك بنەمای ئایین ،

هەروەها یەكێكی تر لە كارەكانیكە بەشێكی زۆری لە تەمەنی لەسەر دانا دژایەتی كردنی بوو بۆ زمانی عەرەبی وبانگەشە كردنی بۆ نووسین بە لەهجەی عامی ، ئەمەش كورتەیەك لە بیرو بۆچوونەكانی (لطفي السيد):

١- كۆمەڵگەی نا ئیسلامی پێ باشتر بوو لە كۆمەڵگەی ئیسلامی ،ئەم واتایەش لە نووسینەكانیدا ڕەنگی داوەتەوە.

٢- جیاوازی نەدەكرد لەنێوان ئایینەكاندا ، ئیسلام و ئایینەكانی تری تەنها لە ڕوانگەی پێكهاتەیەكی كۆمەڵگاوە تەماشا دەركرد.

٣- داكۆكیكارێكی سەرسەخت بوو لە سەر مولحیدەكانی میسر وەكو طه حسين ومنصور فهمي و حسين هيكل.(عبدالرزاق السنهوري) كە هاوڕێی نزیكی ئەوبوو پێی وابوو ، لطفي السيد گومانی زۆری سەبارەت بە بیروباوەری ئیسلام وروژاند ولەسەر ئەو كارەشی تاكو مردنی بەردەوام بوو.

٤- بۆچوونی وا بوو شەریعەتی ئیسلام بە كەڵكی سەدەی بیستەم نایەت و ئایینێكی وشك و ڕاوەستاوە ، وەكو (مجيد خدوري) لەكتێبی (عرب معاصرون) لەئەودەگێڕێتەوە وتوویەنی: : (إن الشريعة الإسلامية وهي في حالة ركود منذ زمن بعيد لم تعد تتفق والأوضاع الجديدة للحياة)!! [ص٣٣٠].

-بیرێكی نەتەوەیی تەسكی هەبوو ، دروشمی (مصر للمصريين) ی بەرزكردبوویەوە ، واتە:میسر بۆ میسرییەكان.

- بانگەشەکردنی بۆ پەراوێزخستنی زمانی عەرەبی پاراوو نووسین بە مانی قسەکردنی ڕۆژانەی میسرییەکان واتە: (اللهجة العامية) هەر لەم بارەشەوە بانگەشەی دەکرد بۆ نەهێشتنی بزوێنەکانی سەروژێرو بۆر و ساکین کردنی کۆتایی پیتەکان!

- هەروەها بانگەشەی زۆری دەکرد بۆ ئازادی تاك وديموكراتی و بە دەستهێنانی بەرژەوەندی بەهەر شێوازێك بێت! وەکوپاداشتێکیش عەلمانییەکانی میسر نازناوی (استاذ الجيل)یان پێ بەخشی!

-باوەڕی بە سازش وڕێکەوتن هەبوو لە گەڵ داگیرکەری ئینگیزی لە میسر.

-پشتیوانی تەواوی بۆ (قاسم أمين) ی هاوڕێی نیشاندا سەبارەت بەئازادی ئافرەت لەفڕێدانی سەرپۆش وشوێن پێ هەڵگرتنی ژنانی ڕۆژئاوا لەهەموو شتێکدا.

-بانگەشە کردنی بۆ لێکۆڵینەوەو سوود وەرگرتن لە فیکری یۆنانی وهاندانی قوتابیەکانی بۆ سوود وەرگرتن لە بنەماعەلمانیەکانی بیری ئەوان.

(أحمدد لطفي السيد) لە ساڵی ١٩٦٣ز لە دونیا دەرچووە و کچێکی لە دوای خۆی بە جێهێشتووە کە مامۆستای زانستە سیاسییەکانە لەزانکۆی کالیفۆرنیا لە ئەمریکا.

# ( شكري مصطفى )



دامەزرێنەری کۆمەڵەی (الدعوة والهجرة) لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٢ میلادی لە میسر، یەکێك بوو لە گەنجەکانی کۆمەڵەی (الإخوان المسلمين) کە لە ساڵی ١٩٦٥ز بەهۆی پەیوەندیکردنی بە ئەوانەوە دەستگیر کرا ، دامەزرێنەری (جماعة الدعوة والهجرة) یە کە دواتر لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بە (جماعة التكفير والهجرة) ناسران ، هەر لەناو زیندانیشەوە سەرپەرشتی دەکرد ، تا ئەوکاتەی دوای مردنی (جمال عبدالناصر) لە ١٩٧١ز ئازادکران و بەیعەتی پێدرا و ناوی نرا (أمير المؤمنين) و بوو بە سەرکردەی ئەو کۆمەڵە ، لەساڵی ١٩٧٣ز فەرمانی بە شوێنکەوتوانی کرد ماڵ وموڵکەکانیان بفرۆشن و پەنا بۆ شاخ و ئەشکەوتەکانی دەوروبەری پارێزگای (المنيا) ببەن ، پاش ماوەیەك دەوڵەتی میسری بە پرسەکەیانی زانی ودەستگیرکران، بەڵام لەساڵی ١٩٧٤ز و پاش شەڕی ئۆکتۆبەر بەبڕیارێکی کۆماری (أنور السادات) فەرمانی ئازادکردنی شکري مصطفى دەرچوو ، ئەویش یەکسەر دەستی کرد بە دووبارە ڕێکخستنەوەی جەماعەتەکەی و فراوانکردنی بازنەی ئەندامانی ، هەروەها

توانی کەشێکی تایبەت بۆ شوێنکەوتوانی درووست بکات و سەرقاڵیان بکات بە چالاکی جۆراوجۆرو دایانبڕێت لە کۆمەڵگە ، ئەوانیش ئەوپەڕی گوێڕایەڵی کوێرانەیان بۆی هەبوو ، لە ساڵی ١٩٧٨تۆمەتبار کران بە کوشتنی (محمد حسين الذهبي)وەزیری ئەوقافی پێشووی میسر ونووسەری کتێبی(التفسير والمفسرون) وفەرمانی لەسێدارەدان بۆ مصطفى شكري وزۆرێك لەهاوەڵانی دەرچوو و لە ٣٠ مارسی ١٩٧٨ لەسپێدەی سەردانی سادات بۆ قودس فەرمانی لە سێدارەدانەکە جێبەجێکرا.

ئەگەر چی هۆکاری درووستبوونی ئەو کۆمەڵە توندڕەوە لە بنەڕەتدا زۆربوونی دژایەتی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی بێ ڕەوشتی وستەم کردن بوو لەو زیندانیانەی ئیخوان و خێزان و مناڵەکانیان لە دەرەوەی زیندان ،هەروەها بڵاوبوونەوەی هەندێ کتێب کە ئەو ئاڕاستەی هاندەدا لەکرکردن بۆ ئیسلام ، بەڵام بە ڕواڵەت تەماشاکردنی ئەوان بۆ دەقە شەرعییەکان ولاوازیان لە تێگەیشتنی مێژوو ومەبەستەکانی شەرع ، هۆکارێکی سەرەکی بووبۆ دروستبوونیان ، کۆمەڵەی (الدعوة و الجهاد) کە وتمان بە (التكفير و الهجرة) ناسران هەڵگری بیرۆکەی زۆر توند وتیژ بوون لە مەڕ تێگەیشتنیان لە ئیسلام ، لەوانە:

-ئەنجامدەری تاوانی گەورە(الكبيرة) یان بە کافر دەزانی ئەگەر بەردەوام بوایەو تەوبەی نەکردایەلە تاوانەکەی.

-هەموو فەرمانڕەواكانيان بە كافر دەزانی كە حوكميان بە ئيسلام نەدەكرد ، هەروەها هەموو ئەوخەڵكەش كە بەو حاڵەتە ڕازی دەبوون هەڵنەدەستان لە دژيان.

-هەموو كەسێكيان بە كافر دەزانی بيرۆكەكانی ئەوانی ڕەتبكردايەتەوە يان ڕازی نەبوايە بە پەيوەندی كردن بەئەوانەوە.

-ئەوەشی پەيوەندی پێوە بكردايەن ودوايی وازی لێ بهێنايەن تەكفير دەكرا وخوێنی حەڵاڵ دەكرا.

-هەركێ باوەڕی بە غەيری قورئان سوننەت بوايە وەكو ئيجماع - تەنانەت ئيجماعی هاوەلان و(قياس و استحسان) و ئەو جۆرە سەرچاوانە ئەويشيان بە كافر دەزانی.

-هەروەها هەموو سەردەمانی دوای سەدەی چوارەمی كۆچييان بە سەردەمی كوفر دەناساند چونكە ئەوان باوەڕيان بە بتی لاسايی كردنەوە هەبووە.

- قەول و فيعلی هاوەڵ بەلايانەوە بايەخی نەبوو ئەگەر ئەو هاوەڵە خەليفەی ڕاشيديش بوايە.

-كۆچكردن واتە: بە جێهێشتنی ئەو كۆمەڵگايەی حوكمی ئيسلامی تێدا بەر پاناكرێت بنچينەيەكی سەرەكی بوو بە لايانەوە.

- لەم سەردەمەی لاوازی حوكمی ئيسلامی (المفاصلة الشعورية)يان بە پێويست دەزانی واتە: موسوڵمان بە هەستی وقەناعەتی لە كۆمەڵگا دابڕێت و پێويستيش نييە جيهاد بكات تا ئەو كاتەی بە هێزدەبێت.

-نە مێژووی ئیسلامی و نە بۆچوونی زانایان و موفەسیرانی قورئان بایەخی نەبوو بە لایانەوە ، چونکە زۆربەی زانایان و موفەسیرەکانیان لە مێژووی کۆن و نوێدا بە هەڵگەڕاوە دەزانی لە ئیسلام.

-قورئان و سوننەتیان بە بەڵگە دەزانی بە ڕواڵەت ، بەڵام زۆرێك لە دەقەکانی ئەو دوو سەرچاوەشیان بەشێوەیەك لە شێوەکان ڕەتدەکردەوە.

-بانگەشەیان بۆ نەخوێندەواری(الأمية) دەکرد بەهۆی فەرموودەی: ( **إنَّا أمَّة أمِّيَّة لا نكتب ولا نحسب الشهر هكذا وهكذا يعني مرة تسعة وعشرين ومرة ثلاثين** ) و پێیان وابوو ، خوێندنی زانکۆ وپەیمانگاکان پیلانی بێ باوەڕانە کە موسوڵمانان لە دینداری راستی دوور دەخاتەوە.

-نوێژی جومعە و جوماعەتیان لابرد وبەپێەیستیان نەدەزانی چونکە هەموو مزگوزتەکانیان بە مزگەوتی (ضرار) وسف دەکرد.

-سەرکردەی کۆمەڵەکەیان (مصطفى شكري) بە مەهدی ئەم سەردەمە دەزانی و باوەڕیان وا بوو سەروەری بۆ ئیسلام دەگێڕێتەوە.

-پێیان وابوو ڕۆڵی جەماعەتەکەیان پاش لە ناوچوونی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت دەست پێدەکات کە ئەوکاتە چەکی پێشکەوتوو نامێنێ و بەکارهێنانی چەکە کۆنەکان دەست پێدەکاتەوە.

گرنگترین کتێبی چاپکراو دەربارەی ئەم جەماعەتە کە هەندێ لەم بیروبۆچوونانەیان تیدا باسکراوە کتێبی (ذكريات مع جماعة المسلمين) ی (عبد الرحمن أبو الخير) هاتووە کە خۆی ئەندام بووە لە وجەماعەتە ،

هەروەها بۆ زیاتر شارەزابوون بڕوانە/

- بایەتێك لە سایتی صید الفوائد بەناونیشانی:جماعة المسلمین (التكفیر والهجرة)

لە ئامادەكردنی (ندوە الشباب العالمي).

- پەیامەكانی كۆمەڵەی (الدعوة والهجرة) و پەیامەكانی خودی سەركردەی كۆمەڵەكە

- الحكم بغیر ما أنزل الله وأهل الغلو.محمد سرور بن نایف زین العابدین

- حكم تكفیر المعین والفرق بین قیام الحجة وفهم الحجة.إسحاق بن عبد الرحمن بن حسن آل الشیخ.

- تحكیم القوانین.محمد بن إبراهیم آل الشیخ.

# ( خليل عبد الكريم )



نووسەرێکی میسری لیبرالیە ، کتێبی زۆری دەربارەی ئیسلام نووسیوە ، لە ١٩٣٠ز لە دایکبووەو لە ٢٠٠٢ز وەفاتی کردووە ، یاسای خوێندووەو ساڵانێك کتری پارێزەری کردووە ، بەرگری زۆری لە (نصر حامد أبو زيد) کرد لە دادگا ، یەکەم کەسە کە زاراوەی چەپی ئیسلامی بەکارهێنا ، هەندێ پێیان وایە ئەو بیروبۆچوونی ئیسلامی هەبووە ئەگەر چی نامۆیش بووبێت ،لەوانەشە هۆکاری ئەو هەڵە گەیشتنە ئەوە بێت کاتی خۆی ئەندامی کۆمەڵەی (الأخوان المسلمون ) بووەو دوو جاریش بەو هۆیەوە زیندانی کراوە ،بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کۆششێکی زۆری دەکرد بۆ شێواندنی چەمکە ئیسلامییەکان ، ئەو پێی وابوو گوزارش لە ئیسلامی ڕاستەقینە دەکات بە ئاوێتەکردنی لە نێوان ئیسلام و عەلمانییەتدا ،نەك سەرانی ئێستای ئیخوان کە باوەڕیان وانییەو باسی جیبەجێکردنی شەریعەت دەکەن ، لە ڕاستیدا (خليل عبدالكريم) دەیویست ئیسلامییەك بێت بە تامی مارکسی ، بۆیە لە کتێبەکانیدا باسی ئیسلامی دەکرد و قورئانیشی بە (النص المؤسس) ناودەبرد ،

پێغەمبەریشی (ﷺ) بەکەسێکی عاقڵ و بلیمەت دەزانی و تەواو ، بەڵکو دەیوت وەرەقەی کوڕی نەوفەل یارمەتی پێغەمبەری داوە (ﷺ)لە قۆناغی مەککە لە پرسی قورئاندا ، ئینجا باوەڕی وابوو قورئان بۆ ماویەکی دیاریکراو بووەو ئیتر ڕۆڵی نەماوە ، هەروەها لە کتێبی ( الجذور التاريخية للشريعة الإسلامية ) ڕایگەیاندووە کە ئایینی ئیسلام لە عەرەبە جاهیلیەکان وەرگیراوە ، ئەمە جگە لەوەی هاوەڵان تۆمەتبار دەکات بەوەی کە بە دوای ئارەزووی سێکسی خۆیانەوە بوونە لە ئیسلامدا ، ئەم نووسەرە کام کتێبی بگرە لەم جۆرە تۆمەتانەی تێدایە لە دژی ئیسلام ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك بە خاوەن بیرێکی ئیسلامی دەزانن ، بۆیە پێم باش بوو لاپەڕەیەك لە کتێبی ڕەشی ئەم نووسەرە لە دژی ئیسلام

بخەمە ڕوو..کتێبی زۆرە کە ئەم بیرۆکانەی خۆی تێیاندا باس کردووە ، لەوانە:

١- مفاهيم خاطئة الصقوها بالإسلام.

٢- الجذور التاريخية للشريعة الإسلامية.

٣- شدو الربابة بأحوال الصحابة.

٥- النص المؤسس و مجتمعه(مەبەستی قورئانە)وكۆتا كتێبی بوو پێش مردنی.

# ( إسلام بحيري )



پێشکەشکاری بەرنامەیەکە لە کەناڵی (القاهرة والناس) بە ڕاشکاری و بە بەردەوامی ڕەخنە لە ئیسلام و مێژووی ئیسلام و دەقەکانی قورئان و فەرموودە دەگرێت ، ئەگەرچی ئەو زیاتر درێژەپێدەرێکە بۆ ڕێبازی ڕەخنەگرانی پێش خۆی لە ئیسلام وەکو جمال البنا و حسن حەنەفی ونصر حامد أبو زيد وئەوانی تر ، بەڵام ماوەیەکە ناوبانگی دەرکردووەو خۆی کردووەتە باسی میدیاکان ،وەکو پسپۆڕی سوکایەتی کردن بە ئیسلام و گومان درووستکردن لە دەوری دەقەکانی خۆی دەردەخات ، بەبۆچوونەکانی دەرئەکەوێت کە باوەڕی بە بنەمای (خالف تعرف هەیە) ئامانجی ناوبانگ دەرکردنە وهاوەڵێتی سەرانی ئەم قوتابخانەیە، یەکەم بابەت کە وروژاندی ئەوە بوو کە عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا شووی کردووەتە پێغەمبەر(ﷺ) نەك لە تەمەنی نۆ ساڵی ،

ئەو وەکو هەر کەسێکی تر لە هاوبیرەکانی تری پێی وایە دەقە شەرعییەکان لە قورئان و سوننەتدا پێویستە جارێکی تر خوێندنەوەی جیاوازیان بۆ بکرێت دوور لەو ترسەی بۆمان ماوەتەوە لە

دەستکاری کردنی دەقەکان ، دوای ئەوەی ڕەخنەکانی لە قورئان و فەرمووده زیاتر کردەوە لە بەرنامەکەی ئەزهەر لە دژی ڕاوەستا و بەرنامەکەی ڕاگیرا ، لەم ماوەی ڕابوردوویشدا لەسەر کەناڵەکانی ڕاگەیاندن مونازەرەو ووتوێژێکی کرد لە بەرانبەر هەر یەك لە (الدكتور أسامة الأزهري و الحبيب على الجفري) زانایان و بانگخوازانی میسر بەرپەرچیان داوەتەوە وتەنانەت شەیخی ئەزهەر و موفتی میسر یش.

**بە ڕاشکاری و بە بەردەوامی ڕەخنە لە ئیسلام و مێژووی ئیسلام و دەقەکانی قورئان و فەرموودە دەگرێت**

# ( وفاء سلطان )



هەڵگری ڕەگەزنامەی ئەمریکیە و بەڕەچەڵەك سوریە ، پزیشکی دەرونیە ، لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٨ز لە بانیاس لە سوریا ، یەکێکە لە سەرسەختترین دوژمنەکانی ئیسلام لەم سەردەمەدا ، بە بەردەوامی لەشەڕێکی کراوەدایە لەدژی خوای گەورە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) وهەموو پیرۆزییەکانی ئیسلام ، ناوبانگی لەپاش ڕووداوی یانزەی سێپتەمبەر دەرکرد، بەوتەی خۆی دەڵێت: سەرەتای ڕق لێبوونی لە ئیسلام لەو کاتەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئیخوانەکانی سوریا بە دەمانچە مامۆستایەکی ئەویان کوشتووە لە کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی حەلەب ، دەڵیت: لەوڕۆژەوە ڕقم لە خوای ئیسلام هەڵگرت وناچار بووم بە دوای خوایەکی دیکە بگەڕێم!

(وفاء سلطان) بە ڕەخنەگرێکی نابابەتی عاتیفی لە دژی ئیسلام دادەنرێت کە بە بێ هیچ پەردەیەك و بەڕاشکاوی و بەبەرچاوی ڕاگەیاندن ودەسەڵاتدارانی عەرەب سەرقاڵی جنیودانەبە خوا پاشان پێغەمبەر (ﷺ) وقورئان و مێژووی ئیسلام ،

(فيصل القاسم) دووجار لە بەرنامەکەیدا لەکەناڵی ئەلجەزیرە بواری بۆ ڕەخساند بەئارەزووی خۆی بەئەوپەڕی جورئەتەوە قسە بە سەرجەم پیرۆزییەکانی ئیسلام بکات ، هەر بۆیە دکتۆر (یوسف القرضاوي) سەرەڕای ئەوەی بەرنامەکە بۆ ڕۆژی دواتر دووبارە نەکرایەوە بە ڕاشکاوی و بە توندی ڕەخنەی لە فەیسەڵ قاسم وبەڕێوەبەرایەتی ئەو کەناڵە گرت.

ئەم ئافرەتە پێی وایە کێشەی ئیسلام لە ڕەگ و ڕیشەکەیدایە کە توانای بەرهەم هێنانی خەڵکی توندڕەو و ئیرهابی هەیە ، دەڵێت:کێشەکە لەوەدایە ئیسلام خاوەنی ئایدۆلۆجیایەکی سیاسیە و هانی توندوتیژی ئەدات و لەسەرووی خشتەی کارەکانیدایە! شایانی باسە ئەو هیچ کێشەیەکی لەگەڵ ئاینی مەسیحی وجوولەکەدا نییە وتەنها ئیسلام بە مەترسی دەزانێ بۆ سەر خەڵکی، لەساڵی ٢٠٠٦ز لەلایەنی گۆڤاری تایم بە یەکێك لە کاریگەرترین کەسایەتییەکانی ئەوساڵە دانرا کە لە پێناوی مافی ئافرەتاندا کۆششی کردووە! لەزۆربەی شوێنەکانی دونیا موسوڵمانان نارەزایی و شەرمەزارکردنی کارەکانیان ڕاگەیاندووە و، زانایان وبیرمەندان بەرپەرچیان داوەتەوە.

شایانی باسە (وفاء سلطان) لەسەر بنەمای زانست وتێگەیشتن رەخنە لە ئیسلام ناگرێت و تەنها پەنا دەبات بۆ هەندێ دەقی لاواز و ناجێگیر ودەیانکاتە بەهانە بۆ دژایەتی ئیسلام، خاوەنی هەندێ نووسینە لەبەناوبانگترینیان کتێبی: "نبيك هو أنت! لا تعش داخل جبته"

کە شەڕێکی ڕاگەیەنراوە لە دژی ئیسلام.

# ( جمال عبد الناصر )



لەدایکبووی ساڵی ١٩١٨ز و سەرۆکی میسر بووە ١٩٥٢زتاکو ١٩٧٠ ز. بەشدابووەیەکی سەرەکی بوو لە کودەتاکەی دژ بە حوکمی پاشایەتی ولابردنی دوایین پاشا کە فاروق بوو ، باوەڕی بە ڕێبازی کۆمونیستی بوو لە بەڕێوەبردنی وڵات وگەلدا و،هاوکات باوەڕی بە زیندووکردنەوەی بانگەشەی قەومیەتی عەرەبی بوو ،ئەو سەرەڕای ئەوەی هەندێ لە مێژوونووسان پێیان وایە لە قۆناغیکی ژیانیدا ئیخوان بووە وپەیوەندی لەگەڵ سەرانی ئەوکۆمەڵە هەبووە ، بەڵام وادیارە تەنها بەکاری هێناون بۆ چوونە سەر کورسی دەسەڵات ، چونکە ئیخوان ئەوسەردەمە خاوەنی خەڵکی زۆر وکاریگەری گەورە بوونە لە میسردا ولە خودی کودەتاکەشدا بەشداربوونە لە ئاستی گەورە ئەفسەرەکاندا، هەر لەسەرەتای هاتنی بۆ سەر حوکم پیلانێکی بۆ کۆمەڵەی (الإخوان المسلمون) درووست کرد گوایە ئەوان ویستوویانە لە ئیسکەندەریە بیکوژن ولەو بارەشەوە شانۆگەرییەکی بۆ درووستکرا وەکو بەهانە،

بەو بیانوەشەوە هەموو زیندانەکانی میسری پڕ کرد لە ئەندامانی ئیخوان و موسوڵمانانی تر بە گشتی و زیندانی گەورەی لە بیابان و شوێنە دوورەکاندا بۆ ئەو مەبەستە درووستکرد ، لەسەردەمی خۆیدا هەموو تواناکانی وەکو خاوەنی دەسەڵاتی یەکەم خستە گەڕ بۆ ناشیرینکردنی ئیسلام و ڕاونان و ئەشکەنجەدانی شوێنکەوتوانی بە دڕاندانەترین شێوازەکانی ئەشکەنجە ، هەروەها هاندان و بڵاوکردنەوەی بێ ڕەوشتی وخراپە ئەنجامدان وگرنگیدان بە هەموو ئەو چالاکییانەی میسر لە ئیسلام دوور ئەخاتەوە ،تەنانەت لەسەردەمی ئەودا هەرچی ئافرەتی داوێن پیس وسەماکار و گۆرانی بێژ هەبوو بوونە دەم سپی وسونبولی کۆمەڵگای میسری ، لە کاتێکدا هەرچی ئەوانەی ڕوو لە خوا بوون زیندانەکان و ئەشکەنجە چاوەڕوانیان بوو . لە وەزارەتی ناوخۆ و شوینە تایبەتەکانی ئەشکەنجەداندا لە ڕێگەی (شمس وبدران) و چەندین جەلادی پسپۆڕ لە کوشتنی بێتاوانەکاندا شێوازەکانی ئەشکەنجەی گاورەکانی ئەندەلوسیان تازە دەکردەوە لە سەردەمی (محاكم التفتيش).

(عبدالناصر) سەرەرای ئەوەی تاکو ئێستاش لە لایەن نەتەوە پەرست وڕەگەز پەرستەکانی عەرەبەوە بە پاڵەوانی فریادڕەسی نەتەوەی عەرەب وێنا دەکرێت ، بەڵام گەورەترین سەرشۆڕی ونسکۆکانی عەرەبیش لەسەر دەمی ئەو و لەسەر دەستی خۆی ڕوویانداوە ، بە تایبەتی نسکۆی حوزەران لە ساڵی ١٩٦٧لە بەرانبەری ئیسرائیلدا ، وەکو شاعیرێك وتوویەتی:

النكسة الكبرى حملت لواءها**كالقائد المغوار عاد مظفرا

ستون ألفاً - ليتني كنت الفدا **على أشلائهم تمشي متبخترا

(عبدالناصر) خاوەنی لیستێکی دوورو درێژە لە تاواندا ، نەك تەنها دژ بە ئیسلام و موسوڵمانان ، بەڵکو لە دژی میسر و میسرییەکانیش وەکو وڵات و گەل، لەوانە:

- لادان و لەناوبردنی (محمد نجیب) ی هاوڕێی لەسەر حوکم وتەفرو توناکردنی خێزانەکەی ودانانی خۆی لە جێگەی ئەو.

-دابڕانی میسر وجیاکردنەوەی لە سودان.

- لەسێدارەدانی (سید قطب) وسەدانی تر لە زاناو کەسایەتی وبانگخوازی ئیسلامی میسر بە بەهانەی سیاسی جۆراوجۆر.

-پاکتاوکردن و لەنێو بردنی نەیارەکانی بە شێوەیەکی دڕەندانە.

- برەودان بە هەموو چالاکییەك کە خەڵکی میسر لە ئایین و ڕەوشت دوورخاتەوە ولەسەردەمی ئەو میسر بوو یە گۆڕەپانێکی بەرین بۆهەموو کەسێك چاوی بە ئیسلام و بە ڕەوشتی جوان هەڵنەدەهات.

- ڕوخانی ئابووری میسر و گرنگیدان تەنها بە قسەو دروشمی زل ، بێ ئەوەی بتوانیت هیچ لە ودروشمانە جێبەجێ بکات.

- ڕەگی بە دیکتاتۆریەت داکوتا و دەزگایەکی داپڵۆسێنەیری زەبەلاحی دروستکرد کە هەموو ئەرکێکی لەناوبردنی نەیارانی (عبدالناصر) بوو.

- ڕەگ وڕیشە داکوتانی گەندەڵی بە هەموو واتایەك وشەی گەندەڵی هەڵیبگرێت ، لەحکومەت وخوێندن وهەمووبوارەکانی ژیاندا ،کە تاکو ئێستاش کاریگەری هەر ماوە.

- لە ناو بردنی سوپای میسری لە ماوەی شەش ڕۆژدا لەڕێگەی بە گژاچوونی ئیسرئیلەوە کە ئەوە ملهوڕیەکی (عبدالناصر)بوو باجەکەشی بریتی بوو لە لەناوچوونی زۆربەی سوپای میسر و فرۆکەکان و هەموو چەك وتواناکانی بە بێ ئەوەی هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا بە دەست هاتبێت.

-کوشتنی (عبدالحکیم عامر) کە ئەفسەرێك بوو لەنزیکترین هاوڕێکانی خۆی.

- داهێنانی ڕێبازی درۆ و درووستکردنی شانۆگەری سیاسی بۆ لە نیوبردنی نەیارانی لە پیلانی (المنشية)وە بیگرە کە گوایە هەوڵی تیرۆرکردنی دراوە، تاکو شانۆگەری لابردنی (محمد نجيب) و دەیان سیناریۆی لە جۆرە.

لە ٢٨-٩-١٩٧٠ز پاش دەرچوونی لە کۆبوونەوەی لوتکەی سەرانی وڵاتە عەرەبەکان، تووشی دڵەکوتکێ بوو ولە پاش شەش سعات بەرەو لای پەروەردگاری بەڕێکەوت، دەڵێن چەند ملێون کەسێك ئامادەی جەنازەکەی بوونە و ،

هەورەوها جگە لە فەیسەڵی شای سعودیە نەبێت هەمووسەرۆکەکانی عەرەب ئامادەی بە خاك سپاردنی تەرمەکەی بوونە ، شا حوسێن و یاسر عەرەفات بەربەرچاوی ڕاگەیاندنەکانەوە دەستیان کرد بە گریان و ، (معمر القذاقي) دووجار بە هۆی هەواڵەکەوە بووراوەتەوە!

نەزار قەبانی گەورە شاعیری ناوداری عەرەب بە هۆنراوەیەك بۆی گریاوە کە لەسەرەتاکەیدا دەڵێت: (قتلناك يا آخر الأنبياء).سەیریش ئەوە بوو کاتێك بەرەو مزگەوتی (نصر) ئەبرا بۆ نوێژکردن لەسەری،

خەڵکانێکی زۆر هاواریان دەکرد:

**"لا إله إلا الله، ناصر هو حبيب الله ... كلنا ناصر"**

جێگای داخیشە کە مێژوو لە بیری ناکات بەهەر هۆکارێك بێت شێخ (محمد متولي الشعراوي) یەکێك بوو لەوانەی ستایشیان کردلە مەڕاسیمی ناشتنەکەیدا و، وتی

**«قد مات جمال وليس بعجيب أن يموت، فالناس كلهم يموتون، لكن العجيب وهو ميت أن يعيش معنا - وقليل من الأحياء يعيشون وخير الموت ألا يغيب المفقود وشر الحياة الموت في مقبرة الوجود، ...»**

واتە: جەمال مرد و شتێکی سەیریش نییە ئەو بمرێت ، چونکە خەڵکی هەموویان دەمرن ، بەڵام سەیر ئەوەیە مردبێت و لە گەڵماندا بژێت....

# ( الحبيب بورقيبة )



سەرۆکی پێشوتری تونسە ، لە ساڵی ١٩٠٣ز لە دایکبووەو لەساڵی ١٩٥٧ز کودەتای لە دژی (محمد الأمين باي) کرد و بوو بە یەکەم سەرۆك کۆماری ئەو وڵاتە ، پاش چەند مانگێك لە سەرۆکایەتی چەند بریارێکی دەرکرد لەوانە قەدەغەکردنی فرەژنی وقەدەغەکردنی ژنهێنان پێش بیست ساڵی وشوو کردنی کچان پێش حەڤدە ساڵی ، لەگەڵ چەندین بڕیاری تر وەکو پێدانی مافی مناڵ لەباربردن بۆ ژنان.

بورقێبە سیاسەتی دژایەتی ئیسلامی بەرپاکرد لەسەرەتای حوکمڕانی خۆی تاکو لابردنی لە ڕێگەی بنعەلیەوە ، ئەو دروستکراوێکی فەرەنسی بوو بە ڕاشکاوی هەوڵیدا بنەماکانی ئیسلام لەو وڵاتە بڕوخێنێ ،

بۆ نموونە:

-پێی وابوو رۆژوو زیان بە ئابووری وڵات ئەگەیەنێت و بە ڕەسمی لە ساڵی ١٩٦٢ز ڕۆژووگرتنی قەدەغەکرد لەسەر کرێکارەکان و فەرمانبەران و پێشنیاری کرد پاش خانەنشین بوونیان بیگێڕنەوە یان لە هەر کاتێکی تر غەیری ڕەمەزان.

- هەوڵی زۆری دا ڕێگری بکات لە حاجیەکانی تونس لە گەشت کردن بۆ سعودیە بە مەبەستی حەجکردن و لە ساڵی ١٩٦٤ز لە وتارێکیدا پێشنیاری کرد لە جیاتی حەجکردن بۆ سعودیە باشترە حاجێکان سەردانی مەزارگەی پیاو چاکان بکەن لە تونس وەکو: مەزارگەی (أبي زمعة البلوي وأبي لبابة الأنصاري ).

-لە ساڵی ١٩٨١ز بەیاسای ژمارە (١٠٨٨) سەرپۆشی لەئافرەتان قەدەغەکرد بە بەهانەی نەگونجانی سەرپۆش لەگەڵ ئەم سەردەمەدا و لە ئاهنگێکی جەماوەریشدا بە دەستی خۆی دەستی کردە ڕێگرتن لە ئافرەتان و سەرپۆشەکانی لەسەریان دەکردەوەو دەیخستە سەرشانیان گرتەکانیش لە یوتیوب هەیە بۆ کەسێك بیەوێت تەماشایان بکات.

- هەروەها نوێژی جەماعەت و بە تایبەت نوێژی بەیانیانی لە لاوان قەدەغەکرد و دەزگا ئەمنیەکان دەستیان کرد بە ڕاونانی ئەوانەی ئامادەی نوێژی بەیانیان دەبوون.

- هەروها بە بەهانەی کاریگەری خراپی نوێژی جومعە لەسەر ئاستی کارکردنی فەرمانبەران وکرێکاران هەڵسا بە لابردنی نوێژو وتاری هەینی لە جامع الزيتونة و شوینی تر لە تونس و هەندێ

لە زانایانی دەسەڵات فەتوایان بۆ دا کە دەکرێت نوێژی جومعە لەگەڵ عەسر کورت بکرێتەوە چونکە جومعە دەوامی ڕەسمی بوو و پشوو نەبوو لەوێ.

-ئەمە جگە لەوەی زنجیرەی ئەشکەنجەدان و لەسێدارەدانی نەیارەکانی و ئیسلامیەکان بەتایبەتی هەمیشە بەردەوام بوو ،و دڕندەییەکی نالەباری لەو بارەوە نیشاندا.

لە ساڵی ١٩٨٧ز (زين العابدين بن علي) بە کودەتایەك توانی ببێتە سەرۆك کۆماری تونس و بورقێبە لا بدات لەسەر کورسی حوکم و بیخاتە ژێر ئیقامەی جەبری لە یەکێك لە کۆشکە سەرۆکایەتیەکانی و هەموو هەواڵێکی لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن شاردەوە ،بورقێبە چەندین جار هەوڵی خۆکوشتنی دا لەو ماوەیەدا و لە کۆتاییدا لە ساڵی ٢٠٠٠ز لە دونیا دەرچوو. بەڵام بن عەلی وێرای ئەوەی نەیهێشت کەناڵەکانی ڕاگەیاندن ئامادەی مەڕاسیمی ناشتنی تەرمەکەی ببن ، ڕێگەشی نەدا زۆر لە کەسایەتییە جیهانیەکان بەو بۆنەیەوە بێنە تونس ، شایانی باسە بن عەلی سەبارەت بە دژایەتی کردنی ئیسلام بە تەواوەتی درێژەی بە ڕێبازی بورقێبەدا وهیچی لەو کەمتر نەبوو ئەگەر زیاریش نەبێت.

# ( عبدالله الحبشي )



خەڵکی وڵاتی حەبەشەیە لە ئیفریقیا ، لە دایکبووی ساڵی ١٩١٠ز ، هەر لە (أثيوبيا) لەسەر دەمی منداڵیەوە زانستە شەرعییەکانی خوێندوەو، دواتر گەشتی کردووە بۆ وڵاتانی تر بۆ ئەو مەبەستە ، لە ساڵی ١٩٤٠ز لاپەڕەیەکی ڕەشی بۆ خۆی تۆمار کرد بە هاوپەیمانێتی لەگەڵ فەرمانڕەوی ناوچەی (اندراجي)کە زاوای ستەمکاری بەناوبانگ هیلاسیلاسی بوو لە دژی قوتابخانەکانی لەبەر کردنی قورئان لە شاری هەرەر ، دوای ئەوەی بە (شيخ الفتنة) باوبانگی دەرکرد لە حەبەشە ، ڕۆیشت بۆ لوبنان و لەوێ جێگیر بوو و، دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی جەهمی وباطني و زۆر بیروباوەڕی خراپی تر ، ئەو بە ئاشکرا لە ڕێبازی ئەهلی سوننەت وجەماعەت لایدابوو ، ئەمەش چەند بەڵگەیەك لەسەر لادانەکانی:

-پێی وابوو قورئان فەرموودەی خوای گەورە نییە و جیبریل سەلامی خوای لێبێت وتوویەتی.

-هەروەها هاوارکردنی بە پێغەمبەر (ﷺ)بە جائیز دەزانی.

-جنێوی بە هاوەڵان دەدا بە تایبەتی موعاویەو عائیشە و خالید ڕەزای خوایان لێبێت.

- زۆر جار لێی دەبیسترا کە ئەو کەسەی جنێو بە هاوەڵان بدات پێی بێ باوەڕ نابێت(لە کتێبی العقيدة السمية لاپەڕە ١٨٢).

- زۆرێك لە زانایانی بە کافر دەزانی : وەکو : ابن تيمية و محمد بن عبد الوهاب و الذهبي و السيد سابق و ناصرالدين الألباني و سيد قطب ڕەحمەتی خویان لێبێت ،...بڕوانە:(گۆڤاری منار الهدى الحبشية ژمارە ٣ص٢٣٤ ).

- هاوکات (ابن عربي) خاوەنی بیرۆکەی الحلول والاتحاد کە زۆربەی زانایانی ئیسلام بە بێبڕوای دەزانن، ئەو بە مامۆستای گەورە ناوی دەبرد.

- فەتوای نامۆی زۆر هەبوو ،وەکو: ڕێگەدان بە فێڵ حیلەکردن لەشەرع و تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم و وفەتوای فرۆشتنی منداڵ ونوێژکردن بە جلی پیس و هەروەها دەیوت پارەی کاغەز وەکو دینار و دۆلار زەکاتی تێدا نییە چونکە ئەوانە نە ئاڵتوون و نە زیون! و فەتوای دەربارەی خواردنی سوو یش هەبوو ،بڕوانە:(بڕوانە: کتێبی بغية الطالب).

کۆمەڵێك هەن بە ناوی (الاحباش) سەر بە عبدالله الحبشي ن و بیروبۆچوونەکانی جیبەجێدەکەن ،لەلایەن زانایانەوە بە گومڕا وەسف دەکرێن ،

بڕوانە: فەتوای شێخ (عبد العزيز بن باز) ژمارە ١/٢٣٩٢ لە بەرواری ١٤٠٦/١٠/٣٠ك کە تێیدا وتوویەتی:

(( إن طائفة الأحباش طائفة ضالة ، ورئيسهم عبد الله الحبشي معروف بانحرافه وضلاله ، فالواجب مقاطعتهم وإنكار عقيدتهم الباطلة وتحذير الناس منهم ومن الاستماع لهم أو قبول ما يقولون )) .

عبدالله الحبشي لە ساڵی ٢٠٠٨ز کۆچی دوایی کرد.

**ڕێگەدان بە فێڵ حیلەکردن لەشەرع و تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم و وفەتوای فرۆشتنی مناڵ ونوێژکردن بە جلی پیس.**

# ( فريدريك نيتشه )



فەیلەسوف و شاعیرێکی ئەڵمانیە ، لە ساڵی ١٨٤٤ز لە دایکبووەو لە ١٩٠٠ز لە دونیادەرچووە ، لە بنچینەدا زانایەکی زمانەوانی بوو ، ئینجا هەندێ نووسینی دەربارەی دەروونناسی و زانستی ئەخلاق نووسی ، ئاڵای دژایەتی لە ڕووی بەها باوەکان و هەموو غەیبیاتەکان بەرزکردەوە ،لە جیهاندا ئەوپەڕی گرنگی بە وتەکانی دەدرێت و بە کەسێکی زۆر زاناو داناو و بلیمەت دادەنرێت وکتێبەکانی لەسەر ئاستێکی بەرفراوان دەخوێنرێتەوە.

کتێبی زۆری هەیە، لەوانە:

- هكذا تكلم زارادشت ١٨٨٣-١٨٨٥،
- ما وراء الخير والشر ١٨٨٦،
- هو ذا الإنسان ١٨٨٨،
- قضية فاغنر ١٨٨٨،

- أفول الأصنام ١٨٨٨،
- عدو المسيح ١٨٨٨...

لە کاتێکدا بایەخی ئەو لای لایەنگرانی زیاتر لەوەدایە کە دەیوت : خودا مرد و ئایینەکان هەموویان درۆن ، بەشێکیش لە فەلسەفەکەی بریتی بوو لە گریدانی شارەستانی بە مۆسیقاوە ،سێ جار کەوتە داوی خۆشەویستی ئافرەتانەوە بەڵام هەمیشە ئەوان پێی ڕازی نەدەبوون بە هۆی سەیرکردنەکانی کە بە کەسێکی سروشتی نەدەچوو ، دڵی لە قوتابیەکی خۆی چوو و زەوی لەبەردەمیدا ماچ کرد بەڵام ئەو هەر پێی ڕازی نەبوو و شووی بەکەسێکی تر کرد ،نیتشە باری دەروونی ناتەواوبوو ،هەروەها هەمیشە بەدەست سەرئێشە و پەرکەم و نەخۆشی سفلسی بە هۆی داوێن پیسیەوە دەیناڵاند ، بۆ ماوەیەکی زۆریش لە ژیانیدا نیوە شێت بووە و لە چەند ساڵی کۆتایی ژیانیدا بە تەواوی شێت بوو ،

جارێکیان پەلاماری ئەسپێکیدا و لە شوێنی گشتیدا بە ڕووتی سەمای دەکرد ، جار بە جار خۆی لێ دەبووە مەسیح و ناپلیون وئەسکەندەری مەقدۆنی ، دوای شێتبوونی بەسترایەوەو و خرایە شوینێکی تایبەتەوە بەڵامدایکی وخوشکەکەی دەریان هیناو تاکو مرد چاودێرییان کرد...سەرەرای ئەوەش لەبەر ئەوەی کەسێکی بێ باوەڕ ومولحید بووە لە فەلسەفەکەیدا هەر گەورە دەکرێتەوەو بە فەیلەسوف و بلیمەتی سەردەمی خۆی باس دەکرێت و ڕاگەیاندنەکان دربارەی ئەو لە چەواشەکردنماندوو نابن.

# ( جمال الدين الأفغاني )



ناوی (محمد جمال الدين ی کوڕی السيد صفتر الحسيني يان الأفغاني يان الأسد آبادي)ه،

مێژووناسان جیاوازییەکی زۆریان هەیە سەبارەت بە ناوی و ،وڵاتی لە دایکبوونی و، مەزهەبی ، بۆیە هەندێکیان پێیان وایە ئێرانییەو هەندێکیان بە ئەفغانی دەزان و ، هەندێکیان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە شیعە بووە و،هەندێکیان دەڵێن بە دڵنیایی سوننی بووە.

لە ساڵی (١٨٣٨ز) لە دایکبووەو لە ساڵی ١٨٩٧ز وەفاتی کردووە. لە بنەماڵەیەکی ناوداری ئەفغانی بووە کە پلەو پایەی کۆمەڵایەتی دیاریان هەبووە.

لە سەردەمی خۆیدا بە یەکێك لە کەسایەتیە ناودارەکانی میسر و جیهان دادەنرا وهاوکات بە یەکێك لەسەرانی ڕابوونی ئیسلامی دەناسرا لە جیهاندا .

گەشتی زۆری لە ژیانیدا ئەنجامداوە بۆ هندستان و میسر و ئەستانە و ئەوروپا ، بە هەڵوێستەکانیشی دژ بە داگیرکاری ئینگلیزەکان ناسراوە،

بەڵام ڕۆڵ و کاریگەری گەورەی زیاتر لە میسردا دەرکەوت بە تایبەت پاش ئەوەی (محمد عبده) پەیوەندی پێوە کرد و بوو بە یەکێك لە قوتابیە نزیکەکانی.

جمال الدين سەرەڕای کەسایەتی بە هێزی و کاریگەری لەسەر بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتانەی کە تێیدا دەمایەوە ، بەڵام ئەو کەسایەتییەکی تەمومژاوی بوو کەس بە تەواوەتی نە لە ئاراستە و نە ڕەچەڵەك ونە وردەکاری ژیانی تێنەدەگەشت ، تەنانەت خۆیشی لەهەر وڵاتێك بە شێوازێك ناوو نازناوی خۆی دەگۆڕی وەکو : (الأفغاني)(الإستانبولي) و(الكابلي) و(الروسي) و(الطوسي)، و(الأسدأباذي)! هەروەها لە جل و بەرگیشیدا بە هەمان شێوە لە ئێران مێزەری ڕەشی دەپۆشی و لە تورکیا مێزەری سپی و لە حیجاز عەگاڵی لەسەر دەکردو لە ئەوروپا تەربوشی لەسەر دەکرد!

زۆربەی قۆناغەکانی ژیانی قوتابێتی لە قوتابخانەو حەوزەکانی شیعە تەواو کردووە لە قەزوین و تاران و شوێنە پیرۆزەکانی شیعە لە عێراق ، مامۆستاکانیشی بە گشتی شیعە بوونە ، علي الوردي لە کتێبی «لمحات اجتماعية في تاريخ العراق الحديث» زۆر هەوڵی سەلماندنی شیعایەتی ئەو دەدا کە وەکو وتمان ئەو مەسەلە جێگای ڕاجیایی نێوان مێژووناسانە.

ئەوڕاستیەش وەکو دەوترێت بۆ سوڵتان عبدالحميد ئاشکرا بوو دەربارەی ئەفغانی کە مەزهەبی سونی تەنها وەکو پەردەیەك بە کار ئەهێنێ بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی.لەوانەشە ئەگەری شیعەبوونی ئەفغانی بچووکترین ئەو تۆمەتانە بێت کە لەسەرێتی!

بیروبۆچوونی پێچەوانەی بیروباوەڕی ئیسلامی زۆر هەبوو ، بەکرداریش سەلماندوویەتی، لەوانە:

هەمیشە بانگەشەی نزیکبوونەوەی ئایینەکانی پێکەوە دەرکرد، هەروەها بانگەشەی نزیکبوونەوەی هەردوو مەزهەبی سوننەو شیعەی دەکرد کە تەنها سوننە لەو بیرۆکەیە زیانیان بەرکەوت،هەروەها لە بواری تەسووفیشدا باوەڕی بە وحدة الوجود هەبوو ،باسێکی تریشی هەبوو هەمیشە بانگەشەی بۆ دەکرد کە بریتی بوو لە اشتراکیة الإسلام!

بۆ هەر وڵاتێك دەچوو زانایانی ئەو وڵاتە ڕووبەڕووی دەبوونەوە وهەوڵی دەرکردنیان دەدا ، ئەفغانی یەکەم کەسە کە بیرۆکەی «اشتراکیة الإسلام»ی داهێنا ،هەروەها دەیووت:لا مانع عندي من السفور إذا لم يؤد إلى الفجور! واتە: لاشەدەرخستنی ئافرەتی بەلاوە ئاسایی بووە بە مەرجێ ئافرەتەکە داوێن پیسی نەکات! قەناعەتیشی وابوو دەقەکانی قورئان پێویستە تأویل بکرێن ئەگەر لە گەڵ زانستی سەردەمدا تێگیران(خۆی و محمد عبدە ی قوتابی بە شێوەیەکی کردار ئەم بیرۆکەیان کردە واقیع کە نوسینەکانیاندا ، بۆ نموونە محمد عبد طیرا أبابیل بە نەخۆشی ئاوڵە تأویل دەکات و زۆر شتی تریش)،

وێڕای ئەمانەش جگەرە کێشێکی ئالودە بوو بە ئەندازەیەك کە بە شێرپەنجەی پووك وناودەمی وەفاتی کرد.هەموو ئەمانەش بە لایەك ئەوەشی بەلایەکی تر کە یەکێك بوو لەسەرانی ماسۆنیەت لە جیهاندا بە دانپێدانانی خۆی و یەکدەنگی مێژوونوسان لەو بارەوە، زۆرێك لە زانایانیش لە کۆن و نوێدا ڕایان دەربارەی ئەفغانی زۆر خراپ بووە ،

تەنانەت کە پرسیاریان لە شێخ سفر الحوالي کرد دەربارەی جمال الدين الأفغاني وتی:

دەتوانین بڵێین هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە!

پاساویشی بۆ ئەو بۆچوونەی بەمانەی خوارەوە هێنایەوە:

١- بانگەشەی دەکرد بۆ شوێنکەوتنی ڕۆژئاوا بە بەهانەی تازەگەری لە ئیسلامدا.

٢- بانگەشەی دەکرد بۆ ئازادی و دەربازبوون لە کۆتی شەرعی.

٣- بانگەشەی دەکرد بۆ یەکگرتنەوەی هەرسێ ئایینەکانی ئیسلام و مەسیحی و یەهودی.

٤- بانگەشەی دەکرد بۆ یەکگرتنەوەی ڕۆژهەڵات بە هەموو نەتەوەکانیەوە.

٥- بانگەشەی دەکرد بۆ قەومیەت و ئیشتراکیەت و نەتەوایەتی و ڕوتی ئافرەت بە مەرجێ داوین پیسی نەکات!

٦- تەفسیرەکانی بۆ قورئان بە ڕاشکاوی تەفسیرێکی باطني و دیموکراتی و ئیشتراکی و لابردنی ڕواڵەتەکانی بوون بۆ واتای تر.

٧ -باوەڕیشی بە سوننەت نەبوو ، بە ڕاشکاوی لە چەندین جێگەیەدا ئەوەی دووبارە دەکردەوە ،وەکو خۆی دەڵێت:

"القرآن وحده سبب الهداية، أما ما تراكم عليه وتجمع حوله من آراء الرجال واستنباطهم ونظرياتهم، فينبغي ألا نعول عليه كوحي و إنما نستأنس به كرأي، ولا نحمله على أكفنا مع القرآن في الدعوة إليه وإرشاد الأمم إلى تعاليمه، لصعوبة ذلك وتعسره وإضاعة الوقت في عرضه، ألسنا مكلفين بالدعوة إلى الإسلام وحمل الأمم على قبوله؟ وهل تمكن الدعوة من دون ترجمة تعاليم الإسلام إلى لغة الأقوام الذين ندعوهم؟

هل في طاقة سكان البرازيل -مثلاً- إذا أردنا دعوتهم إلى الإسلام أن يفهموا كنه الإسلام من ترجمة علماء الإسلام وآرائهم المتشعبة في تفسير القرآن والحديث؟

ألق نظرك على فهرست أحد الكتب الدينية الكبرى، وتأمل فيها ما الذي يمكن عرضه والدعوة إليه من أحكامه وتعاليمه وما لا يمكن تجد أن ما لا يمكن العمل به ولا الدعوة إليه ولا تطبيق مفاصلة أصبح عبئاً يجب الاستغناء عنه بما يمكن والممكن هو ما في القرآن وحده" کەواتە قورئانیەکی دژە سوننەتی پەتیش بووە پێش ئەوەی احمد صبحي منصور لە دایك ببیت بەسەدیەك!

بێگومان باسکردنی لادانەکانی جمال الدين الأفغاني پێویستی بە کتێبێکی سەربەخۆ هەیە بۆ ئەوەی بە بەڵگەوە ڕاستیەکان بخرێنە ڕوو ،

ئەوئامانجەش لەم کورتە باسەدا ناپێکرێت ، لە کۆتاییشدا پێم باشە بڵێم لە گەڵ ڕێزم بۆ جەنابی دکتۆر محسن عبد الحميد هەوڵێکی زۆری داوە بەرگری لە ئەم پیاوە بکات لە کتێبی

(جمال الدين الأفغاني الرجل المفترى عليه)

بەڵام ئەوە بۆچوونی خۆیەتی و بەرگری کردن لە بۆچوونەکانی ئەفغانی وەکو هەوڵی ئەو کەسەیە گیان بەبەری مردوویەکدا بکات پاش ئەوەی مۆمی ژیانی بکوژێتەوە و لاشەی سارد بێتەوە.

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

» -صحوة الرجل المريض «

" -الجماعات الإسلامية في ضوء الكتاب والسنة"

» -دعوة جمال الدين الأفغاني في ميزان الإسلام«

» -جمال الدين الأسدأباذي

» -لمحات اجتماعية في تاريخ العراق الحديث) «٣١٣/٣ .

» - حقيقة التنظيم الخاص ودوره في دعوة الإخوان المسلمين» محمود الصباغ .

» -المذاهب المعاصرة وموقف الإسلام منها«

»-لعبة الشيطان» للصحفي الأمريكي روبرت دريفوس.

- «خاطرات جمال الدين» لمحمد المخزومي.

# (سەلمان ڕوشدی)



ناوی (سەلمان ئەحمەد ڕوشدی) یە ، لە شاری بۆمبای لە هندستان لە ساڵی ١٩٤٧ لە دایکبووە ، هاوڵاتیەکی بریتانی بەڕەگەز هیندیە ، ناوبانگی دەرکرد لە ڕێگەی ڕۆمانی (آيات شيطانية) لە ساڵی ١٩٨٨ز کە لەبەرانبەر نووسینیدا خەڵاتی (ویتبیرد) ی بە دەست هێنا ، بەڵام ناوبانگ دەرکردنی سەلمان ڕوشدی دوای ئەوە بوو کە ڕۆمانەکەی هەرایەکی گەورەی لە جیهانی ئیسلامیدا لێکەوتەوە چونکە سوکایەتی ڕاستەوخۆی تیدا بوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وخێزانەکانی و بیروباوەڕی ئیسلامی بەگشتی ، هەندێ پێیان وایە سەلمان ڕوشدی تەنها مەبەستی ناودەرکردن بووە لەوکارەی ، پێشتریش ڕۆمانێکی تری بڵاوکردبوویەوە بەناونیشانی:"أطفال منتصف الليل" کە سوکایەتی بە مێژووی هندستان و ئەندێرا غاندی دەکرد تێیدا.

لە ساڵی ١٩٨٩ز خومەینی فەتوایەکی ڕاگەیاند تێیدا خوێنی ناوبراوی حەڵاڵ کرد و،

دوای چەند ڕۆژێك لە فەتواکەی لە لایەن یەکێك لە ئەندامانی (حزب الله )هەوڵی کوشتنی درا لە ڕێگەی کتێبێکی بۆمب ڕێژکراوە بەڵام سەری نەگرت ، پاشان سەلمان ڕوشدی بۆ ماوەی دە سال خۆی شاردەوەو نەبینرا.شایانی باسە فەتواکەی خومەینی تەنها لەبەر ئەوە نەبوو ئەو نووسەرە سوکایەتی بە پیرۆزییەکانی ئیسلام کردووە ، بەڵکو کتێبەکە ئاماژەی تێدایە بۆ خودی خومەینی و بە ئیمام ناوی دەبات و گالتەی پێدەکات.

لە ساڵی ٢٠٠٧ شاژنی بریتانیا نازناوی (الفارس) ی پێبەخشی وەکو پاداشتێك بەرانبەر سوکایە تیکردنی بە ئیسلام و پیغەمبەر(ﷺ) و خێزانەکانی کە ئەمەش جارێکی تر زنجیرەیەك ناڕەزایی لێکەوتەوە.

# ( ڕێکەوتننامەی (سیداو) )




ناوی ڕێکەوتننامەکە بە زمانی ئینگلیزی بریتییە:

Convention on Elimination of All Forms of Discrimination

Against Women

واتە: ڕێکەوتننامەی نەهێشتنی هەموو جۆرە جیاوازییەك لە دژی ئافرەتان.

لە ساڵی ١٩٧٩ لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ئیمزای لەسەر کرا پاش ئەوەی سەدوهەشتا و نۆ دەولەت ئیمزایان لەسەر جێبەجێکردنی کرد کە لە نێوانیاندا پەنجا دەوڵەت بە شێوەیەکی مەرجدار و بە (تحفظ) لەسەری ڕازی بوون.

بنەماو بنچینەی ڕێکەوتننامەی (سیداو) لەسەر یەکسانی ڕەها و هاوشێوەیی وهاوتا بوونی تەواو لە نێوان ژنان و پیاواندا دامەزراوە لە بوارەکانی سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی وڕۆشنبیری و لە هەموو بوارە جیاجیاکانی تردا.

لە ڕاستیدا بیرۆکەی یەکسانی کردن لە نێوان هەموو خەڵکیدا بە ژنان و پیاوانەوە ئەو بنەمایە بوو کە زۆربەی پەیمان وڕێکەوتننامە جیهانییەکانی لەسەر درووست بوو، بۆ نموونە سەرانی شۆرشی فەرەنسی ئەو دروشمەیان بەرز کردبوویەوە بەو ئیعتیبارەی کە پیاوان و ئافرەتان هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا نییە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، هەر بۆیە یەکەمین مادەی ڕێکەوتننامەی سیداو بریتی بوو لەوەی کە نابێت هیچ جیاوازییەك بکرێت لە نێوان ژنان و پیاواندا و پێویستە بە مەبەستی ڕێگەگرتن لە هەر جیاوازییەك لە بوارەکانی ژیاندا لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزە بەرەنگاری هەر هەوڵێك بۆ کز کردنی ئەو ئاراستە ئەنجام بدرێت.

لە ڕاستیشدا یەکسانی لە نێوان ژنان و پیاوان لە ئیسلامدا مەسەلەیەکی بڕاوەیە و جیاوازییان لە نێواندا نەکراوە وەکو ماف و لایەنی مرۆیی، مەگەرلە کاتێکدا نەبێت کە یەکسانی لە گەڵ دادگەریدا تێکگیرابێت، ئەو کات وەکو پاراستنی مافی ئافرتان لە یەکسانییەوە دەگویزرێتەوە بۆ دادگەری، چونکە لە هەندێك حاڵەتدا یەکسانی کردن لە نێوان ئەو دوو ڕەگەزەدا دەبێتە جۆرێك لە نادادگەری کە خودی ئافرەتەکە یان بەرانبەرەکەی تێیدا زیانمەند دەبێت.

گومانی تێدا نییە کە ڕێکەوتننامەی (سیداو) لە گەڵ شەریعەتی ئیسلامدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پێچەوانەیە و تێکدەگیرێت ، ئەوەندەش بەسە کە ڕێکەوتننامەکە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرچووە و جاڕی بۆ دراوە نەتەوە یەکگرتووەکان هیچ جۆرە ڕێزێك نە لە ئیسلام و نە لە هیچ ئاکار و ڕەوشتێکی کۆمەڵگاکان ناگرێت وبگرە مەبەستێتی یاساو تەشریعاتی کاریگەر دەربکات بۆ لاوازکردن و نەهیشتنی پێگەی شەریعەت لەسەر زەمینەی واقیع،

هەروەها دژایەتی کردنی ڕەوشت و هەڵوەشاندنەوەی خێزان و بڵاو کردنەوەی بێ ڕەوشتی یەکێکە لە ئامانجە گەوەرکانی ئەو دەزگایە، ئەمەش دیاترین ئەو خاڵانەیە کە لە دوو توێی ڕێکەوتننامەکەدا هاتووە وپێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە:

-لە ماددەی دوومدا هاتووە لەم ڕێکەوتننامەدا کە پێویستە لەسەر هەموو ئەو دەوڵەتانەی ئیمزایان لەسەری کردووە هەموو جۆرە ڕێنمایی و ئاراستەو حوکمێك لە یاساکانیان پووچەڵ بکەنەوە کە جیاوازی دەخاتە نێوان ژنان و پیاوان بەوانەشەوە کە لەسەر بنەمایەکی ئایینی درووست بوونە وەکو میراتی بۆ نموونە، ئەم ماددەیەهش بە ڕوونی لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا ناکۆکە و پێچەوانەیە، چونکە کە ئیسلامدا جیاوازی لە نێوان پیاوان و ژناندا کراوە و لە ڕووی فیترەتیشەوە ئەو دوو ڕەگەزە جیاوازی زۆریان لە پێکهاتەو تواناو باری دەروونی و توانای جەستەیی لە نێواندا هەیە، وەکو لە قورئانی پرۆزدا هاتووە:( وليس الذكر كالأنثى) ئینجا کارکردنیش بەو ماددەیە لە ڕێکەوتننامەکە وەکو هەڵوەشاندنەوە بۆ ئەو ئایەتانەی باسی حوکم کردن بە قورئان سوننەت دەکەن وەکو:

(فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً )).

-لە ماددەی شانزەدا بە هەمان شێوە کۆمەڵێك جیاوازی و تێکگیرانی تێدایە لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا وەکو:

-لابردنی هەموو جۆرە سەرپەرشتی و ویلایەت و خاوەندارێتێیەك لەسەر كچان و ئافرەتان لەلایەن باوك و براو مێرد و هەر سەرپەشتیارێكی تر، بۆ ئەوەی یەكسانی تەواو لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا درووست بێت،

بۆ نموونە: كچ ئازاد بیت هاوسەرگیری یان پەیوەندی لەگەڵ هەر كوڕێكدا بگرێت با بێ دینیش بێت، ئەمەش لەگەڵ شەریعتدا پێچەوانەوە بۆ نموونە:

لەگەڵ ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ): **( أيما امرأة نكحت بغير إذن وليها فنكاحها باطل فنكاحها باطل فنكاحها باطل).**

-لەبڕگەیەكی تری ماددەی شانزەدا هاتووە كە كچ دەتوانێت ناوی دایكی هەڵبگرێت وەكو چۆن دەتوانێت ناوی باوكی هەڵبگرێت، ئەمەش لەگەڵ بنەمایەكی سەرەكی قورئاندا تێكدەگیرێت كە فەرمودەی الله تەعالایە: **(ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ ).**

-لە بڕگەیەكی تری ئەو ماددەیەدا بەڕاشكاوی هاتووە كە فرەژنی پیویستە قەدەغە بكرێت، واتە لە ڕووی یەكسانییە چۆن ئافرەت بۆی نییە زیاتر لە میردێكی هەبێت بە هەمان شێوە پیاویش بۆی نییە زیاتر لە هاوسەرێكی هەبێت، ئەمەش لە كاتێكدایە كە الله بە ڕاشكاوی لە قورئاندا ڕێگەی بە فرەژنی داوەو فەرموویەتی: **(فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ )** كاتێكیش هەندێ دەوڵەتی ئیسلامی ڕەخنەیان لەو بەندە گرت لیژنەی سیداو بە توندی قەدەغەكردنی فرەژنیان دوو پات كردەوە وتیان فرەژنی دەرەنجامی زۆر ترسناكی هەیە لەسەر ئافرەت و لەسەر كۆمەڵگا بۆ

چارەسەری پێویستی پیاوانیش بە چنی دووەم لە پەیوەندی ناشەرعی لە گەڵ ئافرەتاندا ڕێگەیەکی باشتریان نییە.

-هەروەها لەڕووی یەکسانی ڕەها لە نێوان ژنان و پیاواندا چۆن پیاو پاش جیابوونەوە لە هاوسەرەکەی یان مردنی بۆی هەیە بێ چاوەڕوان کردن هاوسەرگیری بکات، بەو شێوەش پێوەستە ژنان ئەو مافەیان هەبیت پاش مردنی هاوسەرەکانیان یان جیابوونەوەیان لەیەکتر ئافرەت بتوانێت لەگەڵ هەرکەسێك ڕاستەوخۆ شوو بکات بە بێ چاوەڕوانی، بەمەش عیددە کە لە ئیسلامدا بەڕوون و ئاشکرا تەشریع کراوە پووچەڵ دەبیتەوە.

- بە پێی ڕێکەوتننامەکە پیاو بە هیچ شێوەیەك لە خێزاندا مافی سەرپەرشتی بەسەر خێزانەکەیەوە نییە، بەوەش ئایەتی (الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ) هەڵدەوەشێتەوە.

-بەرز کردنەوەی تەمەنی ڕێگە پێدراو بۆ شوو کردنی کچان بۆ هەژدە ساڵ وەکو ڕێخۆشکردنێك بۆ ئەوەی دواتر بیگەیەنن بە بیست و یەك ساڵ، ئەمەش پێچەوانەی چەندین دەقە لە شەریعەتی ئیسلامدا بۆ نموونە: «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ ، مَنْ اسْتَطَاعَ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ؛ فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ؛ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ» [رواه البخاري ومسلم واللفظ للبخاري]

-بە پێی ڕێکەوتننامەکە ئافرەت مافی خۆیەتی و ئازادە منداڵی ببێت یان نەبێت ، هەروەها مافی خۆیەتی ئەگەر بیەوێت کۆرپەڵەکەی لەبار ببات، ئەمەش ڕاستەوخۆ لەگەڵ فەرموودەی الله جل جلاله پێچەوانەیە کە فەرموویەتی:

**((وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلاَدَكُم مِّنْ إمْلاَقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَ إِيَّاهُمْ )).**

-ڕێکەوتننامەکە مافی مێردی سنووردار کردووە سەبارەت بە مافی عیشرەت و چوونە لای هاوسەرەکەی و ئەگەر بەرەزامەندی ژنەکە نەبێت بە دەستدرێژی (اغتصاب زوجي ) دادەنرێت و سزایشی بۆ دیاریکراوە لە نێوان سزادان بە پارەو زیندانی کردن، لە کاتێکدا الله لە قورئاندا فەرموویەتی: **((نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ ))** هەروەها رسول الله (ﷺ) وەکو لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە فەرموویەتی : **(( إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَتْ فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ )).**

سەبارەت بەو پرسیارەش کە ڕەنگە لای کەسانێك درووست بێت ئایا ڕێکەوتننامەی سیداو خاڵی باش و مادەی بە سوودی لە خۆ هگرتووە بۆ ئافرەتان یان هەموو لەو جۆرە زیان بەخشە بۆی؟ لەو وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ دەربارەی مافی دایکایەتی و جەخت کردنەوەی لەسەر پارێزگاری کردن لەسەر مافی ئافرەت لە کاتی دوو گیانیدا و هەروەها دەستەبەرکردنی چاودێری تەندرووستی بۆ ژنان بێ جیاوازی لەگەڵ پیاواندا و ڕەخساندنی هەلی کار وسوودی ئابووری بەدەست هێنانی قەرز و خاڵی ئیجابی تری بۆ ئافرەتان تێدا هاتووە، قسەکەش لەسەر ئەو خاڵە باشانە نییە کە لەگەڵ شەریعەتی

ئیسلامدا ڕێكن، بەڵكو دەربارەی ئەوەیە كە زۆربەی بەندەكانی ڕێكەوتننامەكە لە گەڵ عەقیدەو شەریعەتی ئیسلامدا تێكەگیرێت.

بە كورتی: ڕێكەوتننامەی (سیداو) لە زۆربەی بڕگەكانیدا لە گەڵ ئیسلام و لەگەڵ فیترەت و سروشتی ئافرەتیشدا ناكۆكە و تەنانەت ناوی ڕێكەوتننامەكە هەڵەیە وزۆر نالۆژیكییە بوترێت نابێت هیچ جیاوازییەك لە نێوان ژنان و پیاواندا هەبێت! ئەگەر بێت ناوەكەشی بریتی بوایە لە بەرەنگاربوونەوەی هەموو جۆرە ستەمێك كە لە دژ ئافرەتان ئەنجام ئەدرێت زۆر ڕاستتر دەبوو. پوختەی ڕەخنەكانیش كە ئاراستەی (سیداو) كراوە بریتین لە :

-بونیاتنانی ئەو ڕێكەوتننامە لەسەر یەكسانی ڕەها و هاوشێوەیی تەواو لە نێوان ژنان و پیاواندا لە هەموو بوارەكانی ژیاندا لە تەشریع و سیاسەت و كۆمەڵایەتی و ئابوری و وەرزشی و ئازادییە گشتییەكان و یاساكانی خێزان و پێدانی ڕەگەزنامە و ئەهلیەتی یاسایی.

-ڕێكەوتننامەكە پڕە لە دژایەتی لە نێوان ژنان و پیاواندا و دیمەنەكە وا دەردەخات كە پەیوەندی ئەوان پەیوەندییەكی دوژمنایەتیە و ئەوان هاتوون سنووریك بۆ ئەو ستەمەی لە دژی ئافرەتان دەكرێت دابنەن لە كاتێكدا خۆی وا نییە.

-ڕێكەوتننامەكە تەماشای ئافرەت وەكو تاكێكی سەربەخۆ دەكات نەك ئەندامێك لە نێو خێزانێكدا.

-ڕێكەوتننامەكە مەبەستێتی هەموو جۆرە جیاوازییەك لە نێوان ئافرەتان و پیاواندا هەڵبگرێت با ئەو جیاوازیيانەش بە پێی سرووشت و فیترەتیش بیت.

-ڕێکەوتننامەکە نوقسانە، چونکە جەخت لەسەر مافەکانی ئافرەت دەکاتەوە و ئەرکەکانی پشت گوێ خستووە و باسیان ناکات.

-ڕێکەوتننامەکە کار بۆ داگیرکارییەکی ناوخۆیی نوێ دەکات و هەوڵێکە بۆ درووست کردنی دەوڵەتیك لە ناو دەوڵەتێکدا و بە پێی برگەی حەڤدەش مافی بە لیژنەی چاودێری داوە چۆن بیەوێت ئاوها لێکدانەوەی ڕێکەوتننامەکە بکات و ڕاپۆرت بەرز بکاتەوە.

ئەو تێکگیرانەش لەم نووسینە کورتەدا دەربارەی سیداو باسمان کرد بریتی نەبوو لە هەموو ئەو خاڵانەی کە پێچەوانەی ئیسلامە و لەو ڕێکەوتننامەدا جەخت لەسەر جێبەجێکردنی دەکرێت، بەڵکو هەندێ ئاماژەو نموونەی خێرا بوو بۆ ئەوەی وەکو بەڵگە لەم بارەوە بخرێتە ڕوو.

ئەوەش کە جێگەی داخە زۆرێك لەوانەی پشتگیری لێ دەکەن یان وەکو هەڕەشەیەك لەسەر ئایینی خەڵکی و ئاکاریان تەماشای ناکەن، کەسانیکن لە ڕاستیدا نازانن ناوەڕۆك و ڕەهەندەکانی ڕێکەوتننامەی (سیداو) تا چەند کاریگەری لەسەر دینی موسوڵمانان هەیە و چەند ڕۆڵ دەبینێت لە دوور خستنەوەی موسوڵمانان لە دینەکەیان، بە دیاری کراویش ئەو ڕێکخراوو لایەنانەی کە پشتگیری ڕەهای لێ دەکەن هۆکاری دەرك نەکردنیانە بەو شوێنەوارانەی ئەو ڕێکەوتننامە لەسەر کۆمەڵگای موسوڵمانان بەڵکو کۆمەڵگا بە گشتی بەجێی دەهێڵێت.ئەوەندەش بەسە کە بزانرێت سەرەڕای ئیمزا کردنی زیاتر لە ١٨٠ دەوڵەت لەسەر ئەو ڕێکەوتننامە کە یەکەم دەوڵەت سوید بوو و قەتەریش لە ساڵی ٢٠٠٩ ئیمزای لەسەری کرد،

بەڵام ئەمریكا بەهەندێ بەهانەوە تاكو ئێستا لەو ڕێكەوتننامەدا بەشدار نییە، جگە لە ئێران و سوودان كە ئێستا ئاراستەی بەرەو ڕازیبوونە، زۆربەی دەوڵەتە عەرەبییەكان تێیدا بەشدارن، ئەو (تحفظ) هش كە هەندێك لەو دەوڵەتانە نیشیانیان داوە سەبارەت بە هەندێ لە بڕگەكانی هیچ لەمەسەلەكە ناگۆڕێت چونكە ئەو دەوڵەتانە بە شێوەیەك لە شێوەكان خۆیان وابەستەی جیبەجێكردنی ڕێكەوتننامەی (سیداو) كردووە.

بۆ ئەم نووسینەم سوودم لە چەند سەرچاوەیەك بینیوە، لەوانە:

*حقوق المرأة في الاسلام واتفاقية سيداو/ محمد يحيى النجمي.

*سيداو في الميزان/ نزار محمد عثمان.

*بنود اتفاقية السيداو ومخالفتها للشريعة الاسلامية/ أسماء سعد الدين.

* موحازەرەیەكی پەیوەندیاری دكتۆر محمد أحمد الزين ی مامۆستام لە مادەی الثقافة الاسلامية لە كاتی خویندنی ماستەر.

# کۆتایی

ئەم کتێبە خوێندنەوەیەك بوو بۆ ژیاننامەو فیکری کۆمەڵێکی لە کەسایەتی و ناودارانی مێژووی کۆن و هاوچەرخ، هەڵبژاردنی کەسەکان هیچ پەیوەندییەکی فیکری و مێژوویی و ئایینی نییە لە نێوانیاندا، بەڵکو تەنها بە ڕەچاوکردنی کاریگەری بواری نەرێنی فیکری و بەشداریکردنیان بە شێوەیەك لە شێوەکان لە تێکدانی چەمکەکان و شێواندنی بیروباوەڕ لە لای موسوڵمانان هەڵبژێردراون.

بە شێوەیەکی گشتی تیشکم خستووەتە سەر ئەو لایەنەی ژیان و فیکریان کە تیشکی نەخراوەتە سەر، ئیتر بەهەر هۆیەکەوە بێت، ئەگەر چی لە ڕوانگەی تێگەیشتنی خۆمەوە قورئان و سوننەت و بابەتە جێگیرەکانی بیروباوەری ئیسلامی هەندێ هەڵێنجان و خوێندنەوەی خۆمم بووبێت سەبارەت بە کەسایەتییەکان، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی پشتم بە نووسین و تۆمارکراوی کەسانی پسپۆڕ و زانا و نووسەری متمانە پێکراو بەستووە.

پێوەرم لە ناوزەدکردنی هەرکەسایەتییەك بەوەی کەسایەتییەکی خراپ بووە، بریتی بووە لەوەی بەراوردی فیکرو بۆچوونەکانیم لەگەڵ مەنهەجی ئەهلی سوننەتدا کردووە، یان گەڕاومەتەوە بۆ بەرهەمی ئەو زانا و نووسەرانەی لەو ڕوانگەوە هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەو کەسایەتییانە کردووە و بەوە دەرچوونە کە بە ڕاشکاوی پێچەوانەی بیروباوەر و دەقەکانی قورئان و سوننەت بوونە، بەڵام بە ڕەچاوکردنی ئەوەی ئەندازەی لادان و گومڕایی و زیان گەیاندن بە موسوڵمانان لە ڕووی فیکری و مەنهەجییەوە جیاواز بووە و بوارەکانیشیان بەهەمان شێوە هەر جیاواز بووە.

- باسەکان هەمووی وەکو یەك بایەخی پێنەدراوە، هەندێکی پێناسەیەکی خێرا بووە و خۆی قسەو نووسینی زۆری هەڵگرتووە بەڵام من لەبەر هەندێ هۆکار بە خێرایی بەسەر بابەتەکەدا گوزەرم کردووە، بۆ نموونە کەسایەتی محمد شحرور و محمدعابد الجابري و أحمد منصور.
- هاوکات هەندێکیش لە کەسایەتییەکان بە شێوەیەکی فراوانتر و لە وێنەی توێژینەوە دربارەی نووسیومە بۆ نموونە:غاندی، ئۆشۆ، عەلی شەریعەتی، جوهەیمان، بوطي ...
- بە هیچ شێوەیەك مەبەستم شکاندنەوەی هیچ کەسایەتییەك نەبووە، بەڵکو تەنها وەکو بەرچاوڕوونکردنەوەی موسوڵمانان ئەو کەسایەتییانەم ناساندووە و تیشکم خستووەتە سەر ئەو بوارانەی پێویستی بە دەرخستن بووە.
- - هەر رەخنەیەکی بەڵگەدار وەردەگرم و لەهەر هەڵەیەك کردبێتم و پێم نەزانیبێت پاشگەز دەبمەوە ئەگەر بەبەڵگە بۆم بسلمێت و سوپاسی هەر کەسێکیش دەکەم کە ڕەخنەی بابەتی ئاڕاستەی نووسینەکانم بکات.

**نووسەر لە چەند دێڕێكدا:**

- لەدایكبووی ساڵی ١٩٧٤ لەشاری دوزخورماتوو.

- بڕوانامەی ماستەری هەیە لە زمانی عەرەبی– بەشی ئەدەبی عەرەبی هاوچەرخ لە زانكۆی (أم درمان) لە سودان.

- مامۆستایە لە زانكۆی هەڵەبجە.

- كاندیدی دوكتۆرایە لە زانكۆی سلێمانی.

- لە چەند ساڵێكی جیاواز وانەبێژ بووە لە پەیمانگای زانستە ئیسلامییەكان لە كەلار و لە سلێمانی و هەروەها وانەبژ بووە لە كۆلێژی یاسا لە زانكۆی جیهان لە سلێمانی.

- ئیجازەی قیرائاتی عەشرەی هەیە لە ڕێگەی الشاطبية و الدرة.

كۆمەڵێك كتێبی بە چاپ گەیشتووە لەوانە:

١) ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ)لە دوو بەرگدا، (نارین) دار المعرفة / بیروت. (وەرگێڕان).

٢) لێكدانەوەی پێشەكی (إبن الجزري) ، چاپی یەكەم لە بەیروت لە ڕێگەی كتێبخانەی نارین و چاپی دووەم لە سلێمانی و چاپی سێیەم لە لایەن كتێبخانەی مەحوی لە هەولێر.

٣) زەكاتی ماڵی بازرگانی.

٤) ژیاننامەی (عبد العزيز بن عبدالله بن باز).

٥) ڕابەری ئەوانەی كە عومرە دەكەن(چاپی سێیەم) جگە لە چاپێكی تر لە (الرياض)كراوە.

٦) ڕابەری حاجیان بە وێنەوە؟

٧) نزار قباني ولوثة الفكر الحداثي في شعره / كتێبخانەی نارین چاپی بیروت. (توێژینەوە).

٨) سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە (مجلد) پرۆژەی تیشك. (وەرگێڕان)

٩) کۆتایی جیهان نیشانە گەورەو بچووکەکانی قیامەت (بەوێنە) (نارین) دار المعرفة / بیروت (وەرگێڕان).

١٠) (الجامع الصغير)ی السیوطي (٤) بەرگە [بەرگی یەکەمی بە هاوبەشی لەگەڵ وەرگێڕێکی تر] (٦٥٠٠) فەرموودەی خۆم وەرمگڕاوە ١٦٠٠ ی فەرموودەی وەرگێڕەکەی تر وەریگێڕاوە).

١١) شانۆگەری (زاناو ستەمکار)ی یوسف القرضاوي.

١٢) الإتجاه الإسلامي في شعر وليد الأعظمي/ ماستەرنامە.

١٣) فەرهەنگی زاراوەکانی زانستی قیرائات، کتێبخانەی مەحوی (وەرگێڕان).

• جگە لە چەند کتێب و توێژینەوەیەکی تر هەندێکیان چاپ کراون و هەندێکیان چاوەڕوانی چاپ کردنن.

# پێرست